# هەگبەی بنار



نووسەر

مەلامستەفا ڕەشیدی (زاواکێو)

## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

## ● هەگبەی بنار

● **نووسینی:** مەلا مستەفا (زاواکێو)

● **نەخشەسازی ناوەوە:** رەسول

● **بەرگ:** مەزهەر

● **نرخ:** ٤٥٠٠ دینار

● **چاپی یەکەم** ٢٠١٣

● **تیراژ:** ٧٥٠ دانە

● **چاپخانە:** چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

● لە بەرێوبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٨٧٤) ساڵی (٢٠١٣)ی پێی دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٧٦٨)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

**پێرست**

بسم الله الرحمن الرحیم

## موناجات

به ناوی سانعی ئەرز و سەماوات  به ناوی ئەو بوو هەرچی هات و داهات هەتا
زەوی ڕاخست، سەمای ڕاگرت لە سەروی  جین و فریشتە بۆ سەما هات
بە ئەمری ئەو نەسب بوو مانگ و پەروین  سەدای ئەحسەن لە کوللی ماسیوا هات
لە لای ناوی خۆی نووسی نازناوێک  لە قورعەی ئەو بە ناوی مستەفا هات
زوهوری کرد نموونەی خەڵقی ئادەم  بۆ سەر زەوی لە غەیبەوە نەدا هات
فریشتە سەرنەوی بوون سوجدەیان بر  بروسکەی نووریٚ وێنەی شەوچرا هات
بەشارەت بیٚ لە کوللی جینسی مەخلوق  دەیانگوت نووری زاتی مستەفا هات
بەرین و بەربڵاوە ڕەحمەتی ئەو  بۆ سەر دەردی گوناهکاران دەوا هات
تکا فرمێسکی ڕووسووری لە چاوم  بەرەو دەرگا گەدایەک بۆ تکا هات

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە (ساکار)**

**ساردەکوێستان ٦٧/٢/١٥**

# پێشەکی

لە مێژ بوو لە بیری ئەوەدا بووم دەست بە کارێک بکەم کە زۆر بەر چاو نییە، بەڵام بە کەڵک و بە بەهرەیە. هەر چەند ئەرکی زۆر و پشوویەکی دوور و درێژ و سەبری ئەیووبی دەوێ گەڕان و هەڵسوڕان بۆ جێگا و ڕێگای دوور و دیتنەوەی پیرەپیاوان و ژنانی بە ساڵداچوو کە ئەوانەیان دیبێ و لە بیریان مابێ بەڵام هێندەم حەز لە کارەکە بوو و بەڕێزانیش یانی دۆستان و ئەدەب ویستان زۆریان هان دام و لە قەدیمەوەش کوتوویانە لە تۆ حەرەکەت لە خوداش بەرەکەت ئیتر لێژی و لۆژیم لەبەر نەما و بێ بەردەباز هەنگاوم نا و بۆی بزووتم. دیارە زۆری پێوە ماندوو بووم جارو بار وەک کەشکی ئاوەسووم لێدەهات بارم نەدەما هێند شەکەت دەبووم، بۆخۆم دڵخۆشی خۆم دەداوە بەوە **دەمکوت قەدیمی کوتوویانە قازانی مێردان بە چل ساڵ دێتە کۆ؛ باز بە بەرەگە دەگیرێ،** با تۆش پیر و شلوشەوێق بی و کرکە و نرکەت لێ بڕابێ، چاوت ڕایەڵە بکا و گوێت تەپەی بێ؛ بەڵام نابێ بوەستی و ڕاوەستی. **قەدیمی کوتوویانە ئەگەر سەبر بگری لە بەرسیلە هەڵوا ساز دەبێ،** نابێ ببەزی ئەتۆ عومرێکت ڕابواردووە و زۆرت ڕۆیوە و کەمت ماوە لەوەی دەیزانی تۆوێک بچێتە تا دوای خۆت شین بێ. بۆچی لووت

دادەژەنی ئیوایە لە کێوی ئادێوە دەچێ ئاوی حەیات دینێ، ئەتۆ ناتوانی ئەوەی دیوتە بینوسێ. قەدیمی کوتوویانە دار سێبەری بۆ سێحەبێ نەبێ چۆن بەری بۆ خەڵک دەبێ و داری بێبەر دەبێ بیبڕی ئیتر لینگانم لێ هەڵکرد شەیتانم بەلەعنەت کرد، تفم لە دەستم کرد و دەستم پێکرد کوتم دەست لە دەست و قەوەت لە خودا. چونکە ڕابردووەکانی ئێمە ژیانیان بە ماندوویی پڕ لە ئەزێت و نەحەساوەیی هێناوە چون ئەو کەرەسانەی ئەوان نانیان پێ پەیدا کردووە ڕەنجی زۆر و گەنجی کەمی بووە. بەڵام بە دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی سفرەبڵاو و دەست بە بەرەکەت و دوور لە نەخۆشی دەروونی بێغەرەز و کینە هێناویانە. کورد کوتەنی نانێکیان بووبێ پێکەوە خواردوویانە و نانی ئەوشەویان بووبێ غەمی سبێنێیان نەبووە. جا بۆ پەیدا کردنی ژیانی ڕۆژانە حەولیان داوە ئەوەی بە خۆیان بووە ئی خۆیان بووە و بۆ نان ڕانەچڵەکیون و لە ترسی ژیان ڕانەپەڕیون کەمیان بووە بەڵام کەڕەمەیان بووە، چون نانیان بە عارەقی نێوچاوان پەیدا کردووە **وەک دەڵێن دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە،** ژیانی ساکار و پێکەوەیان بووە. خۆ بە زلزان و زۆرزان لە نێو وان کەم بووە مەگەر بە تاک دەنا وێکڕا و تێکڕا و پێکڕا ژیاون، بۆیە ژانی ژیانیان نەبوو. لە بارەی داوێنپاکی **وەک دەڵێن لە ئاوی شەوێ پارێزیان کردووە.** سەیر و سەیاحەت و جەفەنگ و شۆخی و خۆشییان بووە بەڵام چاوی خەیانەتیان هەڵنەهێناوە و لە ڕێگای ڕاست لایان نەداوە و خەسڵەتی کوردانە کە چاکی و پاکییە وەلایان نەناوە و حیساب و کاروبار و ئاڵو

وێر و هات و چۆ و خۆراک و پۆشاک و لێفەو نوێن دەغڵ و دان و دانەوێڵە، هەموو بە شێوەی سوونەتی و خۆماڵی بووە بە دەستی خۆیان بووە و بە ئیستلاحی ئەورۆ (سەربەخۆ) بوون. جا هەمووی ئەوانە فەرهەنگێک و ڕێورەسمێک بووە کە ڕابردووەکان بە کاریان هێناوە؛ بەڵام هێواشهێواش ئەو قەدیمیانەی کە ئاوا ژیاون و لە بیریانە و کردوویانە نزیک بە کەم بوون و بەرەو تەواو بوون دەچن دوای ئەوان کەس نازانێ ڕابردووەکانی ئێمە چۆن ژیاون بە چی کاروباریان ڕاهێناوە و پێک هێناوە هەر بۆیە بە پێویستم زانی پیاو لە حەق لا نەدا، زۆرێک لە بەڕێزان بوونە هۆی دنەدان. ئەمنیش دەستم پێ کردووە هەرچەند بە زاهیر چکۆلەو وردیلەیە بەڵام ماندووبوونی زۆری ویستووە هیواداریشم لە دواییدا گەورە بنوێنێ و بەرچاو بێ.

**دەڵێن:** جارێک یەکێک لە نووسەران وڵامی لە هەواڵێکی خۆی نارد کە ژیانی شاعیرێک یا نووسەرێکم بۆ بنێرێ تا لەسەری بنووسم. ئەویش ژیانی کەڵەشاعیرێکی بۆ نارد، وڵامی بۆ ناردەوە کوتی کاکە ئەوە هەموو کەس لەسەری نووسیوە نێو بەدەرەوەیە کەسێکم بۆ بنێرە فەقیر و بێنێو بێ کەس لەسەری نەنووسێبێ تا من وەبیر خەڵکی بێنمەوە و بیهێنمە بەرچاو. ئەمنیش ئاوام کردووە جا ئەوەی توانیومە و زانیومە کوتومە، ڕەنگە ئەوەش قەترە بە دەریا بێ لە فەرهەنگی پان و بەرین و دەوڵەمەندی کورد، **بەڵام کورد کوتنی لە تاڵان شڕەیەک وەگێڕی زۆرە**، ئەویش بۆ منێکی پیر و شل و شەوێق، زۆرم پێخۆش بوو ئەو هەلەم بۆ برەخسێ خوداش دەستم بگرێ و جارێ لێشم گەڕێ

و هەڵمگرێ تا ئەوەی کە زۆر کەس گوێ ناداتێ و لێی لا داوە ئەمن بتوانم کۆیان کەمەوە وەک کەلەپوور و کلتوورێکی نەتەوەکەم بە نێوی **(فەرهەنگی گشتی)** سازی کەم و چاکی کەم و چاپی کەم تا نەمهێشتبێ ون بێ و لەبەین بچێ خۆ نابێ وەک کابرای کوردە بی، کابرایەک زۆر تەنبەڵ بوو خرمانێکی هەبوو لەبەر بایە بەشەنی کا بەڵام بای نەدەهات ئەویش ڕووی لە قیبلە کرد و کوتی خودایە بە کای کەی بە بای کەی، زۆری کەی سووری کەی، لە چاڵی کەی بەڵام دەزانم نایکەی تا من دەست نەدەمێ تۆ بەرەکەتی تێ ناکەی. یان دەگێڕنەوە کابرایەک چووە مەجلیسێک دانیشت جێگاکە تاریک بوو نانیان دانا بەڵام ئەویان نەدیبو. کۆخی کابرای فەراش کوتی خەجاڵەتم ئەتۆش لێرەی؟ نانی بۆ ئەویش دانا کوتیان چۆنە ژیان ئەگەر هیچ نەکەی خودا دەیدا؟ کوتی بەڵێ دەی‌نێرێ، **بەڵام کۆخە و ئۆحەیەکی هەر دەوێ.** دیارە نووسینی ڕێوڕەسم و کەلتوور و فەرهەنگی ژیانی باب و باپیرانی خۆمان ئۆحەیەکی هەر دەوێ بۆوەی لەبیر نەچێ، **بەڵام دانیشی بڵێی زەردالوو بیا بە گەروو، نابێ.**

دەڵێن کابرایەک هێندە تەنبەڵ بوو نەی‌دەتوانی هەستی قیسی لێ کاتەوە لە بن دارەکە دانیشتبوو زاری کەردبۆوە ئاوای دەکوت زەردالوو بیا بە گەروو.دیارە ئەمن کارێکی زۆر گەورەم نەکردووە بەڵام توانیومە ئەوەی زانیومە و توانیومە کۆی کەمەوە و بینووسم و هەم کەلێنێکی چکۆلە لە نێو کتێبخانەی ئەدەبی کوردی بکەمەوە بەو هیوایە. لە دواییشدا سپاسی هەمووی ئەو بەڕێزانە دەکەم کە هەر یەک

لە ڕێگا و بارێک و بوارێک هاوکاری و یارمەتییان داوم. وەک دەڵێن یارەبی لە ئاوی بەهەشت بخۆنەوە و لەنێو ئەوێش بخەون. و سپاسی ئەو کەسانەش دەکەم کە هەڵەکانم بۆ ڕاست بکەنەوە و ڕاستەکەم پێ بڵێنەوە بەندە بێعەیب نابێ. جێگای وەبیر هێنانەوەیە ئەو کتێبە کە نێوی هەگبەی بنارە ئەلەو چەند مەبەستانە پێک هاتووە:

١. هەوای هەوار
٢. گەورک
٣. حیساب و بیری ڕابردووەکان
٤. فەرهەنگی گشتی
٥. بنەڕەتی مەتەڵ
٦. پاشەرۆک

والسلامُ علی عبادِ الله الصالحین

**مەلا مستەفا ڕەشیدی (زاواکێو)**

**میراوای بۆکان ١٣٩٠ هەتاوی**

## مەلا مستەفا ڕەشیدی(زاواکێو)



با کەمێک لە خۆم بدوێم.

ئەمن نێوم مستەفایە، شۆرەتم ڕەشیدیە، جاروبار کورتە شێعر دەڵێم. نازناوم «غەمبارە» چونکە زۆر لە «زاواکێو» بووم نزیک بە سیویەک ساڵ لەوێ ماومەتەوە هەر بەو بۆنەوە بە مەلا مستەفای زاواکێو ناسراوم. بابم نێوی قادرە بە هۆی چالاکییەک کە لە شەڕی عورووسی قەدیم لە خۆی نیشان دابوو لەقەبی قادر ڕەشیدیان دابوویە، دیارە مامقادریشیان پێدەکوت. پیاوێکی زانا و دونیادیدە بوو. منداڵی زۆر ببوون هەمووی مردبوون بۆی نەمابوونەوە ئەمن نەبێ تاقانە بووم. دایکیشم نێوی ئامین بوو لە هۆزی گەڵباخی هەوشار بووە بە بنەماڵەوە پەڕیوەی ئەم وڵاتە ببوون.

ئەمن لە بنەماڵەیەکی دەستەنگ لە ساڵی١٣٢٣ ی هەتاوی لە گوندی ئاختەتەری نزیک شاری بۆکان هاتوومە سەر دونیا و دوای تێپەڕ بوونی دەورانی منداڵی لە عومری ٩ یان ١٠ ساڵیدا چونکە تاقانە بووم و بابیشم کە بۆخۆی پیر بوو زۆری جەرگ سووتابوو زۆری خۆشدەویستم پێیدەکوتم وەکازی پیریمە هەر بەم بۆنەوە بڕیاری دابوو پێمبخوێنێ تا ببمە مامۆستای ئایینی چونکە ئەوکات مامۆستای ئایینی ڕێز و حورمەتێکی تایبەتی هەبوو لە نێو کۆمەڵدا و بنەماڵە شانازییان دەکرد بەوە کە کوڕیان مەلا بێ و کۆمەڵیش بڕوایان بەوە بوو ئەگەر یەکێک لە بنەماڵە ببێتە قورئانخوێن سوود و بەهرەی هەیە بۆ دین و دونیای هەموو خاوخێزان بە تایبەت بۆ دایک و باب. جا هەر لەسەر ئەو باوەڕە بابم ئەمنی ناردە بەر خوێندن و دەستم دا سیپارە و چوومە خزمەت مامۆستا عەبدوڵڵای محەممەدی کە مامۆستای ئاوەدانی بوو(بە مەلا عەولاسوورە دەناسرا) لە بنەماڵەی بەڕێزی خەلیفەی گراوییە بوو. لەوێ سیپارە و کەمێکم قورئان خوێند، لە ساڵی١٣٣٤ی هەتاوی لە ئاختەتەرەوە کۆچمان کرد بۆ عەمبار کە لەسەر چۆمی تەتەهوو ئەویش هەر نزیک بە شاری بۆکانە. ئەوێ حوجرە و فەقێی لێبوو بۆ هەوەڵین جار لەوێ پێم نا حوجرەی مامۆستای بەڕێز مامۆستا حەمەدەمین ئەشعەری. چاکم لەبیرە کە بە خزمەتی گەیشتم فەرمووی تازە ماڵوو هاتووە؟ کوتم بەڵێ. جا ئەوکات وەک ئێستا شل و شەوێق و کوێر و کوتر نەبووم، بەڵکوو منداڵێکی خاوێن و خشپیلانە و لە دڵان نزیک بووم. مامۆستا دەستی بە سەرمدا

هێنا و دۆعای بەخێری بۆ کردم و فەرمووی چاک بخوێنە و پیاوی چاکیش بە، عەولادی پیاوی فەقیر دەبێ بە زانین خۆ دەوڵەمەند کا و تۆڵەی نەداری بابی بکاتەوە. کوتم: بەڵێ. ئیتر لەوێ قورئان و هێندێک کتێبی سەرەتاییم خوێند بەڵام بە داخەوە زۆری نەخایاند بابم ساڵێک دواتر لە ساڵی ١٣٣٥دا بە ڕەحمەتی خودا شاد بوو و لە قەبرستانی گردی قەبران «عەمبار» بە خاک ئەسپێردرا، خوداوەندی ڕەحمان و ڕەحیم لەویش و لە هەمووی مردووی ئەو قەبرستانە خۆش بێ، ئامین.

ئەوجار لێم شێوا بێناز کەوتمەوە، غەم و تەم دایگرتم دونیام لێتاریک بوو ناحەقیشم نەبوو. چونکە کەس برای فەقیر نییە و بنیادەمی لێقەوماو کەسی بە پشتەوە نییە. هەر ئەوەندە گولۆڵەت کەوتە لێژی، کەس ئاوڕت لێناداتەوە و کەسیش خاسیەتت نایێژێ. منیش فەقیر و منداڵ و بێباب و بێکەس، بەڵام خەڵکی ئەو زەمان زۆر چاک و فەقیرنەواز بوون. دیارە دوو برا و خوشکێکی دایکیم هەبوون ئەوانیش دوور و ماڵی خۆیان هەبوو. بەڵام دایکم چونکە زۆری کوێرەوەری دیبوو و لە نەسلی گەڵباخیش بوو، ژنێکی ڕەشید و بە هومێد و بە ورە بوو. باڵی بەسەر کێشام و جێگای بابیشی بۆ پڕ کردمەوە و ئەو کەلەبەرەی سارێژ کرد. بۆ ماوەی چەند ساڵێک لە خوێندن هەڵبڕام. ئیتر لەگەڵ دایکم دەستمان بە کار کرد، بۆ بژیوی خۆمان ئەو کاری دەکرد و دەچووە بژار و دەسکەنە و ئەمنیش شوانی و گالەوەڕێنیم دەکرد. تا لە ساڵی ١٣٣٧ ماڵمان چوو بۆ دونگوز لەوێش هەر شوانی و ڕەنجبەریم دەکرد تا لە ساڵی ١٣٣٨ی هەتاویدا یەکێک

لەو دایک برایانەم بە نێوی کاک ڕەحمان هات کوتی ئەتۆ بابت زۆری چاکە لەگەڵ من کردووە و حەقی بە سەرمەوەیە، وەسییەتی کردووە ئەتۆ بخوێنی؛ بچۆ بخوێنە تەرکی مەکە ئەمن خەرجت دەکێشم، ڕەنجبەری دەکەم ئەوەی پەیدام کرد لەگەڵت بەش دەکەم نیوەی دەدەم بە تۆ بۆ خەرجی خوێندن و کڕینی کتێب ئەوەی کەش بۆ خەرجی خۆم و منداڵەکانم، دایکیشمان لە خزمەتی دام پێڵاوی لەسەر سەرمە هەتا ئەتۆ تەواو دەبی. خودا جەزای بەخێری بداتەوە ئەوجار کە لە بەڕێچوونی دایکم و خەرجی خوێندنی خۆم خاترجەم بووم ڕۆیشتم بۆ خوێندن. بۆ هەوەڵین جار چوومە دەرزیوەلی خزمەت مامۆستا مەلا ساڵحی ئینگیکەندی. دوای ماوەی چەند مانگێک هاتمە حەمامیان حوجرەی مامۆستا مەلاعەلی وەڵزی. ئیتر لەوێشەوە چوومە بۆکان حوجرەی حاجی مامۆستا مەلا ئەبووبەکری شەفیعی و پاییزی ١٣٤١ چوومە داربەسەر خزمەت حاجی مامۆستا مەلامحەممەد بانەای، لە ساڵی١٣٤٢ چوومە تورجان خزمەت ئاغا سەیدعەزیزی سەیادەت و لە پاییزی ئەو ساڵەدا چوومە قەباغکەندی حوجرەی حاجی مامۆستا جەسیم سەعادەتی. لە پاییزی ساڵی ١٣٤٣دا چوومە مەدرسەی علوومی دینی مەهاباد «مزگەوتی سوور» خەریکی دەرس خوێندن بووم و بە موتەفەریقەش ئیمتیحانی فارسیم دەدا تا دووهەمی دەبیرستانی ئەوکاتم وەرگرت. دیارە ئەوەی لەوێ بوون زۆریان لە فەقێیەکان ئەو کارەیان دەکرد هەر بەو ئیمتحاناتە مەدرەکی باڵایان وەرگرت و هەر بەوەش زۆریان بوونە مامۆستای قوتابخانە و فەرمانبەری ئیدارە. تا لە

هاوینی١٣٤٧ له لایەن ساواکی شاوه گیرام حەواڵەی جەڵدیانیان کردم. دوای ماوەیەک مانەوه لە زیندان ئازاد کرام و هاتمەوه بۆ لای دەرسەکانم له ساڵی ١٣٤٩ دوای تەواوکردنی دەرسەکان و هاتنه دەرێ له ئیمتحاناتی وابەستە بە مەدرەسە له لایەن مەدرەسەی علوومی دینی مهاباد بڕوانامەی مەلایەتیم پێدرا و شانازی ئیجازه وەرگرتنم پێ بڕا و هەر له مهاباد هاوسەری ژیانم هەڵبژارد و بۆ خزمەت به ئایینی پیرۆزی ئیسلام له گوندی زاواکێوی ناوچەی گەورکی موکری دامەزرام بوومه مامۆستای ئایینی. ئەوجار دووباره لەگەڵ چەند گرفتی گەورەی دیکەی ژیان ڕووبەڕوو بووم. یەکیان دەستەنگی ماڵی، سەربازی غاییب بووم کون به کون لێم دەگەڕان، ژنم ماره کردبوو هیچم نەبوو پێیبگوێزمەوه. هیچم نەبوو له ماڵدا و پووڵیشم نەبوو شتی پێ بکڕم، دایکم مابوو چووم هێنام بۆ کن خۆم و بۆخۆم له خزمەتیدا دەبووم ئەو زۆری دڵخۆشی دەدامێ و دەیکوت ڕۆڵه غەم مەخۆ خودا کەریمە تەنگانە بەریان کورتە. پیاو هەر لە تاریکیدا نابێ. چوومە زاواکێو دیارە لە ڕێکەوتی ١٣٤٩/٣/٢٥ی هەتاویدا بوو تا پاییزی ئەو ساڵە کەمێک لە ناڕەحەتییەکان بەرتەڕەف بوو بۆیه دەڵێن خوداوەند کارسازی کارانە. لای بردن و جێبەجێ بوون و خەڵکی ئەوێش یانی زاواکێو هەمووی کۆمەگیان کرد و زۆریان لە کار و گرفتەکان یارمەتی دام. هەڵیان‌دەستاندمەوه و ڕاستیان کردمەوه. هەر بۆیەش قەتم لەبیر ناچن و هەر لە دڵمدان و دڵم هەر لەوێیه.

بەپێی ئەوەی عومرم زۆرە و دونیام زۆر دیوە، تاڵی و تفتی ڕۆژگارم زۆر چێشتووە، دنیام قوونەکەو کردووە، سێبەری سارد و هەتاوی گەرمم زۆر لێدراوە هەر بۆیە پێموایە ئەوەی دیومە بە کەڵکە و زۆرە بینووسم. تا ماوەیەکیش لە زاواکێو فەقێ و حوجرەم بوو زۆر بە ڕێکوپێکی خەریکی ئەرکی دینی بووم تا ساڵی تاجگوزاری شا کە دەگەڵ مامۆستا ڕاوچی هاوسایە بووین بڕیارمان دا کە لە جێژنی تاجگوزاریدا بەشداری نەکەین و نەشمانکرد.




**«ماڵی مەلا مستەفا لە زاواکێو»**

دوای ماوەیەک دووبارە ئەمن گیرامەوە. دوای ماوەی مانەوەی چەندێک لە زیندان ئازاد کرام و هاتمەوە زاواکێو، بەڵام چونکە لە زینداندا نەخۆش بووم زۆر کز ببووم، بەینێک هیچم بۆ نەکرا و دوای خزمەتێکی زۆری دینی بە پێی زانین و توانینی خۆم و نزیک بە سیویەک ساڵ مانەوە لە زاواکێو لە سەرماوەزی ١٣٧٩ بە هۆی نەخۆشی و پیری و بە ئیجازە وەرگرتن لەو خەڵکە بە ئەمەگ و پاکەی

گەورکان و لە سەر هاتن و داوای خەڵکی چاکی میراوای کۆن کە تازە ماموستا مەلاڕەحمان محەممەدکەریمی فەوتی کردبوو هاتم بۆ میراوا و لە مزگەوتی نەبی میراوای کۆن دەستم بە ئەرکی خزمەتی دینی کرد تا بتوانم هێندێکی دیکە خزمەت بکەم جا تا کوێ دەڕۆم و کەنگێش مەرگ پێشم پێدەگرێ خودا دەزانێ و پێشی ڕازیم. دیارە ئێستاش هەر دڵم بە زاواکێو و گەورکان خۆشە و تا ماوەیەکیش ئارامیم نەدەگرت هەر دڵم بۆ ئەوێ لێی دەدا. خودا پاداشتی هێندێک لە ماموستاکان بداتەوە بە گشتی کە بەجێیان نەهێشتم و تەنیایان نەهێشتم زۆر هاتوچۆیان دەکردم و دڵخۆشیان دەدامەوە بە تایبەت ماموستا عەبدوڵڵای ئاچاک و حاجی ماموستا مەلا ئیبراهیمی سۆفیزادە. ئەوە بوو، بوو بە هۆی ئەوە دامەزرێم و داسوکنێم لە شاردا، دەنا دەخنکام و دەپیشام جا هەر لەبەر خۆشی دێیە دەڵێم:

دێیە مەکۆی ژیان و ئەوین وڵاتی جوان و شیرینم
جێگای خۆش و گەورەبوونە شادم بەوە کە دەتبینم
بووژانەوەم لە تۆڕایە بای شادیی تۆیە دەی‌نۆشم
نیمە خۆشی لە دووری تۆ و مات و غەمبار و بی‌تێنم
ژیان کۆمەڵ لەسەر وانە بە ئارەق و تینی هەتاو
ماندوو دەبن وەچان نادەن نایانمێنێ هێز و هەناو
بە غیرەتن، بە هیممەتن، لێو بە بزەن داناخەن چاو
میوانگرن، دەست و دڵپاک، خەڵکی دێهات لە ژن و پیاو
خۆشە چیا و چڕ و چیمەن بۆ هەستی دڵ غەم ڕەوێنە
بێن تەماشای زاواکێو کەین وێنەی بەهەشتی بەرینە

هەرجێیەک تۆ ڕووی تێدەکەی بۆنی عەتر و یاسەمینە
ناوی کانیاو و بەفراوی شەربەتی ئەسکەن جەبێنە
پەڕی گولان، چاوەی چلان، وەرە عەزیزم بیبینە
شەوبۆ و شەونم شایی دەکەن، هەوێنی دڵ پێکەنینە
دەبا بمرێ دڵی غەمبار لە تاوی دێ و ئاسەواری
لە عومرمدا خۆشیم نەدی لە شاخ و گوند و نێوشاری
پیری و نەخۆشی و بێهێزی ئاسۆی مەرگ دەکا دیاری
بەوە شادم کە بم نێژن لە نێو خاکی کوردەواری

بەهاری ١٣٨٥ی هەتاوی

ئەوە لێرە لە میراوای بۆکانم، بەرهەمی ژیانی هاوسەریم پێنج عەولادە؛ دوو کچ و سێکوڕ لە بارەگای خوداوەند داوایان بۆ دەکەم بە دڵ یەخەی حەق دەگرم کە ئەو عەولادانەم لە خزمەت خوداوەندا ڕووسوور و لە بەڵای ڕۆژگار بە دوور و بۆ خزمەت بە گەل و وڵاتیان دەست پاک و دڵخاوێن بن، ئامین یاڕەبەلعالەمین.

# هەوای هەوار



## کۆخی کورتەک

لە ڕابردوودا بە هۆی سەرمای توند و بەفری زۆر و نەبوونی ڕێگا و بـانی لازم و ناخۆشـی هـاتوچۆ بـۆ شـار و دێهـات و ناوچـەکـانی کوردستان و دەگەڵ ئەوەش نیازی لازم بۆ کاروباری بازرگانی و سات و سـەودا و ئیحتیـاجی بـۆ خـواردن و خـواردەمـەنـی و کـەل و پـەلـی پێویست هەمیشە ڕێبوار و کاروانچی دەگەڵ ڕووداوی تاڵ و دڵتـەزێن ڕووبەڕوو بووە و جاری وا بووە ڕێگای لێ گۆڕاوە و وەبن هـەرەسـی بەفر کەوتووە یا لەبەر شارەزانەبوونی دەراوی چۆمی لە ئاودا خنکاوە. سەرما و گێژەڵووکە و بارەن ڕێگای لێ ون کردووە و ڕەق هەڵاتووە و

زۆر ڕووداوی ئاوا بۆ خەڵکی ئەوکات هاتۆتە پێش و ڕووی داوە و جا خێرخوازان و دڵسۆزان هاتوون لە گەردەنە و بەندەن لەسەر ڕێگا و چوار ڕێ کۆخ و خانوویان دروست کردووە یان لە چۆم و چۆمەڵ پردیان ساز کردووە تا هەم هاتوچۆ لە بەینی شار و دێ ڕانەوەستێ و خەڵکی فەقیر و هەژاریش بێکار و کاسپی نەبێ و بە هیلاکیش نەچێ.
**یەکێک لەوانە کۆخی کورتەکە.**

کۆخی کورتەک خانوویەکە چوارچاوەیە لە پشت گوندی کانیسپی ناوچەی گەورکی مهاباد لە کەنار جادەی سەردەشت مەهاباد و لەبن گەردەنەی زمزیران لەبەین دێیەکانی کانییە ڕەش، کانییە سپی، گردشیلان و کەڵەکاوی و بە دیوی سەردەشت، قاوەخانەی گوێزان و قوڵەسمۆرەی دروست کراوە و بە کوێستانی خۆش و بە ناوبانگی مەیدان چوغە و چیای نستانەوەیە. ئەو خانووە ئاسار و شوێنەواری زۆر مێژوویی تێدایە بەڵام نەنووسراوە و نەکوتراوە هەر وەک شیعر و نووسراوە و کتێب نیشانەی زانست و فەرهەنگی ئەو میللەتەیە، هەر واش ئاسار و شوێنەواری مێژوویەکان نیشانەی ناسین و هۆویەتی ئەو نەتەوەیەیە.

جا بە داخەوە لە هیچ جێگایەک ئیشارە بەو خانووە یا کۆخە نەکراوە دەگەڵ ئەوەش خزمەتێکی زۆر بە کەڵکی کردووە بۆ ڕێبوارانی ئەو ڕێگایە کە ڕێگای ناوچەکانی سەردەشت بووە بۆ مەهاباد، بۆکان، گەورک و مەنگوڕ.



چون ئەوکات هاتوچۆ هەر بە وڵاغ و قەتارچی بووە و ڕێگای قەتار و وڵاغ و کاروان هەر ئەوێ بووە. (**ڕوونکردنەوە:** قەتار ئەوە بووە لە جێی دوورەوە هاتووە زۆرتر بارەکەی قیمەتی بووە و چەندین وڵاغ بەدوی یەکدا جەللە بووە. چەند پیاوی دەگەڵ بووە بەوانەیان کوتووە قەتارچی و بە خاوەنەکەشیان کوتووە خاوەنقەتار، زۆر شتی وا هەیە کە بە دوی یەکدا جەللە دەبێ، پێی دەڵێن قەتار یا قەتارەی بەستووە). کۆخی کورتەک لەبن گەردەنەی بە ناوبانگی زمزیران کە شەقامەڕێی قەدیمی کاروانی لێڕەوار و سیاکێو بووە و زەنجیرەی گەردەنەی زمزیران و باسکی کورتەک کە کۆخی کورتەک لەوێدا دروست کراوە ئەلێرەوە دەست پێ‌دەکا. دوای بەجێی هێشتنی کانیەهەوارە مانگ و مەڵبەندی شەشڕێیانی و گردی قەبری پوورەزێنێ لە پشت گوندی کیسەڵان کوێستانێکی گەورەی لێ هەیە بە نێوی نێرخاسان«میرخاسان» کە لەبەین دێی سورخاب، کووران و چۆمەڵدایە. ئەوجار دەگاتە کوێستانی ئەسپۆنەجاڕی، دەستی ڕاستی

میرخاسان ئەوانە جێگا هەواری ئەو دێهاتە بوون دەگاتە کوێستانی قامیشە کە بەندەنی دێی کەڵەکاوێیە. دواتر دەگاتە جێگا هەواری برینجەوانی، ئەڵبەتە دوای جێگا هەواری بەردووکە دەگاتە برینجەوان لە پەنا برینجەوان دۆڵێکی زۆرخۆشی لێ هەیە بە نێوی دۆڵی کاکەشان«گاگەشان» کە لە کەناری هەواری بەردووکە دێتە خوارێ لەوێ تێ دەپەڕێ دەگاتە کوێستانی بە ناوبانگی برایم جەلالی کە دەکەوێتە بەینی گوندی جانداران، و دۆڵەتوێ. کە سەرچاوەی چۆمی سەرەگایە و بڵیندی٢٢٢٦ میترە. دوای برایم جەلالی دەگاتە دەروەسێو بەینی دێی زمزیران و نەڵۆسە کە گەورکی سەردەشتە و کاتێک لە دێی کەڵەکاوێیە سەر دەکەوێ لەبەین گوندی زمزیران و قوڵەسمۆرە باسکێکی خۆش و دوور و درێژی لێ هەیە بە نێوی گردی بنەوشان و باسکی بێریان.



**«پشتی کۆخی کورتەک»**

یەک دەگەڕێتەوە ئەوجار دەگاتە کێوێکی زۆر بڵیند و بە ناوبانگ کە ڕووبەڕووی کۆخ و گەردەنەی زمزیرانە بە کێوی بەندەنی کەکی دەناسرێ کوڕانی ئەحمەدخانی زمزیران لەوێ بە هێلاک چوون. ئەوجار دەگاتە هەواری گەڵۆناسری، لەوێشەوە دەچێتەوە دۆڵی کۆخی کورتەک لە گەردەنەی زمزیران بە دیوی دێهاتی کانیەسپی و کانیەڕەش دایە، ئەو دۆڵەی کۆخی هەڵدەگرێ دەڕواتە هەواری دۆڵهەرزن دواتر دەچێتەوە ویشکەلان دەگاتەوە جێگا هەواری نستانێ، ئەوکات ئەو جێگایە کۆخی چوارڕێیان بووە. لەسەر گردێکی کەمێک بڵند و دوو تەڕەفی ئاو و کانییە، بە هەر چوار لای خۆیدا دەڕوانێ. پشتەکەی دەگەڵ بانەکەی ڕێک و تەختە تا بەفر ڕندووی لێ نەکا و نەیگرێ. پێشەکەی بە تەختەسەنگ، سەنگچین کراوە. پلیکانی نییە بۆ ژووری تا ولاغ لێ نەسلەمێتەوە بتوانێ بچێتە ژووری خانۆکە چوار دیوی گەورەیە، بەرەو خۆر داندراوە، یەکیان لە هەمووان گەورەتر دیارە جێگای ولاغ بووە، دیوی خەوتن نان کردن و چێشت دروستکردنی بووە، ئێستا شوێنەواری چوار دیوی ماوە شایەد دیوی دیکەشی بووبێ وەبن گڵ کەوتبێ، یا ڕووخابێ، هەمووی دیوەکان بۆ نێو یەکتر لە ژووریدا دەرگا و ڕێگای هاتۆچۆیان هەیە تا لە کاتی لێقەوماندا یا ڕێگا و دەرک و بان گیران، ئەوانەی ژووری لە یەکتر بێخەبەر نەبن دیوارەکانی بە سەنگی چاککراوی سپی جوان داندراوە. سەرەکەشی بە خەرپشتە هاتۆتەوە سەنگی زۆر گەورە و جوانی لێ بەکار هاتووە بە

شتێک پێکەوە نووساوە پێی‌دەڵێن ساررووج کە بە پاچ لێ هەڵنابێ، بڵندی دیوەکانیش دەستیان نایگاتێ دیارە خشتی تێدا نییە و لێشی بەکار نەکراوە، گوێسوانەشی هەر لەو سەنگانە بۆ ساز کراوە جێگای هەموو شتێکی لە ژووریێدا هەبووە وەک سەرتەندوور، جێئاور، کادێن، ئاخوڕ، جێگای خەوتن... بەڵام بەداخەوە زۆری ڕووخاوە. لەبەین چەند لووتکە کێوی بڵێندایيە، دیارە ئەوکات ڕێبوار و کاروان بەو لووتکە بڵێندانە ئەویان دیتۆتەوە و نیشانەیان کردووە. وەکوو: ١- لووتکەی مایندۆش ٢- لووتکەی جەنیبان ٣- قوتەی هەوارخیزۆکی ٤- سەرچاوەی بناوان.



**«نێو ژووری کۆخی کورتەک»**

هەمووی ئەوانە نزیک بە کوێستانی مەیدان چوغەن. وا دەنگۆیە کە ئەو جێگایە مەرحومی بداغ سوڵتان، حاکمی سابڵاغ کە پیاوێکی خێرخواز و لە خودا نزیک و تینووی خزمەت بە مزگەوتوو و حوجرە و

پرد و ئەوانە بووە دروستی کردووە. بەڵام بەڕێز کارناسی شوێنەواری مێژوویی و میراسی فەرهەنگی کاک مەحموود پێدرام پێی وایە کۆخی کورتەک زۆر لە دەورانی بداغ سوڵتان کۆنترە و ئەو سەنگانە لە لاوە بۆی هاتوون و چاک کراوە هی ئەو مەڵبەندە نین. بەڕێزی پێی وایە ئەو ئاسارە دەگەڕێتەوە بۆ دەورانی حوکومەتی ساسانی، زۆر لە دەورانی بداغ سوڵتان قەدیمی‌ترە. دیارە ئەو کۆخە لەو چوار ڕێیانە بۆتە هۆی حەسانەوەی ڕێبوار و ڕزگاربوونیان لە مەرگ. وا دەبیستریٚ ئەوکات ئەو دێیانەی دەورووبەر بە خێری خۆیان وەک سوێناس، گردشیلان، کانییەڕەش، کانییەسپی، کاوڵان، پاییزان سوختیان بردووە بۆ ئەویٚ بۆ زەخیرەی زستانیٚ بۆ ئەو ڕێبوارانە سەرمایان نەبیٚ. کاروان لە هەر دووک دیوان گەردەنەی زمزیرانی گرتۆتەوە. ئیتر ئەگەر لەویٚ ماوەتەوە و تێدا حەساوەتەوە، هەرکات بەندەن ڕووناکبوونی و هەوا برووکی دابێتیٚ و ڕەچە دیار بووبیٚ، ولاغ بەر سمی خۆی دیبیٚ، ڕۆیشتوون. بۆیەش پێی‌دەڵێن کۆخی کورتەک؛ کۆخ زۆرتر بەو جێگایانە دەڵێن دوور بیٚ لە ئاوەدانی، کورتەک ناوی ئەو گردەیە کە کۆخەکەی لەبن دروست کراوە دیارە ئەوە کاری هەر کەسیٚ بیٚ، بۆ ئەوکات و شوێنە خزمەتێکی گەورە و خێری نەبڕاوەیە.



**«دۆڵی کۆخی کورتەک»**

ئەو کۆخە لە شیو و دۆڵێکدا بە نێو دۆڵی کۆخی، لە پشت گوندی کانی سپییە، لە جادەی گەورەی مەهاباد سەردەشت لە پردی جەماڵەدین لە ڕێگای کانییەڕەش بۆی لا دەدا، لە خوار ئەوێ چاوەیەکی گەورەی لێیە کە بە چاوەی کانی سپی دەناسرێ، دێ بۆ کاوڵان و دێهاتی دەوروبەر، ئەو کانییە هەر وەک چەند چاوە و کانی گەورەی دیکە کە لە کوێستان و کێوی گەورەی ئەو مەڵبەندە مەیدان چوغە دێتە دەرێ زۆرن؛ **یەک چاوەی کانی سپی** کە دێتە خوارێ بۆ چۆمی کاوڵان و بەراو کردنی ئەو زەوی و زارانەی ئەوێ. **دووهەم کانییە تۆرە** کە لەبەینی گوندی گردشیلان و کانییەڕەشدایە و بە کوێستانی تۆرە بە ناوبانگە ئاوێکی زۆر خاوێن و سووکی هەیە و زۆری چۆمی کاوڵان کە دێتەوە هوڵەبۆز ئەو دوو کانییە پێکی دێنن. **سێهەم کانی ئاو دەلە و مەران** کە لەبەینی برایم خەسار و گەنمانە

ڕووبەڕووی کێوەڕەشی موسێیە و لە پەنا چلپلەی حومان بەیتی فولکلوری لاس و خەزاڵە، ئاوێکی زۆر بە تۆپ لەبن شاخی دێتە دەرێ. سەرچاوەی چۆمی زەنبیل، بۆکان و تەتەهوو- و- سیمینە ئەو کانیەیە دێتە خوارێ. **چوارم چاوەی بۆڵژییە** کە لەبن چیای نستان سەر بە کوێستانی مەیدان چوغەیە دێتە دەرێ و لەبەین گەنمان و نستاندا دێتە خوارێ و دەچێتەوە چۆمی کەڵوێ. **پێنجوم ئاوی چاوەی کانییە گامولّی** کە لە چیای نستان دێتە دەرێ دەچێتەوە نێو دێی نستان و دەڕواتەوە چۆمی کەڵوێ. ئەوانە کانیاوێکی زۆر بەرچاو و جێگای سەیرانگا و گەڕانی نیشتەجێ بوونی هەوار چیانن کە لە دەوری کێوی دوور و درێژ و کوێستانی گەورەی مەیدان چوغە دێتە دەرێ کە کۆخی کورتەک هەر لەوێ هەڵکەوتووە دیارە دوورودرێژی ئەو کوێستانە و نێو و سەیرانگا و هەوارگەکانی مەیدان چوغە زۆرە، لێرەدا زۆرمان لێ درێژ دەبێتەوە و ئەو چوار زنجیرە کێوە گەورەی ناوچەکان دێتەوە مەیدان چوغە و چیای نستان.



**«کانێی ئاودەلەوەمەران»**

هـەروەهـا ئـەو زنجیـرەکێوانـە وەک لـە چلچـەمـەی سـەرشـیوی سەقزەوە لە وەستا مستەفای تورجانەوە وەک قەلیجبابای قوڵقوڵەوە و لە کێوی ئەسحابی کۆسەکەرێزی شارویرانی مەهابادەوە دێنـەوە سـەر ئەو کوێستانە گەورەی مەیدان چوغـە، کـەپری، تۆرە، چیای نسـتان کـە هەموو یەکن و لە زنجیرەکێوەکانی زاگرۆسن.

**سـەرچـاوەکـان:** ١- وتـەی بـەڕێز کارناسـی زانـای میراسـی فـەرهـەنگی کـاک مـەحمـوودی پێـدڕام ٢- گێڕانـەوەی ڕدێنسـپی و قـەدیمیـەکـانی ناوچـە ٣- گیتاشناسی ئێران نووسراوەی مهەندیس عەباسی جەعفەری ٤- هاوکاری و وێنەگەری کاک عەلی و زۆرار ئەحمەدی ٥- دیتن و چوونی خۆم

## پردی سوڵتان



لە ڕابردوودا بە هۆی نەبوونی کەرەسەی هاتوچۆی ئەمڕۆیی وەکوو ماشین، خەڵک ئێرە و ئەوێیان و هاتوچۆیان بۆ سات و سەودا و کڕین و فرۆشتن هەر بە قەتار، کاروان، وڵاغدار بووە و بۆ ئەوەش کاری بازرگانی ڕانەوەستێ و شار و دێ بێ ڕزق و ڕۆزی نەبێ فەقیر و هەژاریش بێکار و کاسپی قاچاغچیش ئالووێری ڕانەوستێ لە کاتی خۆی ماڵ و مەتاعەکەی بەجێ خۆی بگا و بفرۆشرێ، دیارە ڕێگا و بان ئاوەدان و کاروان ڕانەوەستاوە. بەڵام چونکە زۆرتر بە کوێرەرێ قاچاغەڕێدا ئەودیو و ئەودیو کراوە بە تایبەت لە ناوچەکانی بانە،

سەردەشت و ئالان و عێراق بۆ مەڵبەندەکانی مەهاباد، بۆکان، موکریان، گەورک، مەنگوڕ و هێندێکیش لە ناوچەی سەقز، زۆرجار بەهۆی سەرما و سۆڵی بەفر و کرێوەی زستان یان باران و سێڵاو و زۆری چۆمەکان قەتار و کاروان تووشی گیر و گرفتی و هاتوچۆ بوون و جاری واش بووە دەگەڵ ڕووداوی دڵتەزێن بە هیلاک چوون و ڕووبەڕوو بوون وەکوو سەرما بردن، وەبن بەفر کەوتن، لە ژێر ڕەندوو مانەوە، لە ئاودا خنکان و سێڵاو بە هۆی نەبوونی پرد لەسەر چۆمەکان یان نەبوونی جێگایەک بۆ حەشار و حەسانەوە و پشوودان لە گەردەنە و کوێستانەکان. جا خێرخوازان و پیاوچاکان هاتوون بۆ ئەوەی ئەو عالەمە لە تەنگانە و مەرگ ڕزگار کەن و هاتوچۆی کاروان بۆ ناوچەکان ڕانەوستێ خەڵکیش بێ ڕزق و ڕۆزی نەمیننەوە، هاتوون لە چوارڕێیان کۆخیان دروست کردووە و کۆخی کورتەک و چەندی دیکە یان لەسەر چۆمان پردییان دروست کردووە وەکوو پردی قەڵاتاسیان لە ناوچەی مەنگوڕی نەڵێنی سەردەشت یان پردی سوڵتان لە گەورکی موکری لە پشت ماڵی زێراندۆڵێ لەبەینی دێیەکانی زێراندۆڵ، ساردەکۆستان و زاواکێو لەسەر دوو چۆمان بوو.



**یەک:** چۆمێک لە خورخورەوە دێتە خوارێ و لە کوێستانەکانی گوێزان، سوورکان، تاتی و شیلانان، ماینخوار، شاخەڕەش، خەڕاتان، هەرمێیان و شاخی قبلە و بەندەنێ داودەگردە دێتە خوارێ دەگەڵ زناو- و زۆنگ و کانیاو، ئەو چۆمە پێک دێنن و دێتەوە پردی سوڵتان.

**دوو:** چۆمی ئاو دەلەومەڕانە کە لە سێوەسوورەی گەنمان، مێرگی سیراوێ، کانیە گربنەوشی و لە زەردەگڵی موسێ و پەڵەدار و بناوەڕەشان و لە چۆمی قەڵات و داری باغچەی کوێستانی زاواکێو. کوێستانی بەردەلۆیە دەگەڵ کانیە پۆڵا و هەواری مەنسووری ساردەکۆسان لە چۆمێک بەنێوی قەدەغە تێکەڵ دەبنەوە و دەبنەوە چۆمێکی گەورە کە چۆمی زەنبیل، بۆکان تەتەهو«سیمینە» پێک دێنن.




**«ئەو بەرەو و بەری پردی سوڵتان»**

جا پردی سوڵتان لە کن وێک کەوتنەوەی ئەو دوو چۆمە دروست کراووە، چونکە ڕێگا کاروانی نزار و لێڕەوار بۆ دیوی سیاکێو و هەروا هی ئەم دیویش بۆ دیوی دارستان هەر ئەو ڕێگا و دەروە بووە، بەتایبەت بۆ ناوچەکانی باسکی کوڵەسەی، دەشتە تاڵ و دۆڵی نمەشیر و ڕەبەت، سەردەشت و بانە لێرەوەش موکریان، گەورکان بەشی سەقز و بۆکان وفەیزۆڵڵابەگی هەر بەوێدا بووە. پردی سوڵتان بە شێوەی هیلالی یا خەرپشتە هاتۆتەوە. لە بەردی دەوروبەری خۆی کەڵکیان وەرگرتووە بەڵام چاک کراوە زۆر گەورە و قورسن. بە مادەیەک بە یەکەوە نووساوە پێ‌دەڵێن ساورووچ. هیچ قەدیمیەک وەبیری نایە کە بڵێ بابم لە باپیری بیستووە یا باڵاتر کە کێ دروستی کردووە و کەنگێ دروست کراوە بەڵام چونکە پێ‌دەڵێن پردی سولتان هەر بۆیە دەڵێن هی دەورانی مەرحوومی بداغ سوڵتان بووبێ، چونکە هەر ئەو بووە ئەوەندە بۆ کاری چاکە هەوڵی داوە هنگاوی هەڵێناوە، خوداوەند جزای خێری

بداتەوە بەو کەسەی کە ئەو کارە چاکەی لەو جێگایەدا کردووە، شایەد هی دەورانی پێش ئەویش بووبێ و خەڵکێکی زۆری لە مەرگ و تەنگانە ڕزگار کردووە، ئەو پردە لەسەر ئەو دوو چۆمە دروست کراوە کە بە چۆمی قەدەغە مەشهوورە، کێوەکانی دەوری پردی سوڵتان ئەوانەن کە زۆر گەورە و کوێستانن. کێوی داوودەگردە، کانیە سارد، ئەستێرەکۆن، دۆڵەڕەش، هەواری ئەڵڵاڕەش، بەرڕۆژەڕەش و ئاشی ئاغا.



**«چۆمی قەدەغە و ئاشی ئاغا»**

پردی سوڵتان لە دووکڵ و سێ چاوە پێک هاتووە، پانایی پردەکە ٣ میتر و ٣٠ سانتی‌میترە، بڵیندی پردەکە ٥ میتر و٥٠ ساتنی‌میترە، ئەستووری هەر کڵێک ١میتر و٥٠ سانتی‌میترە، درێژی پردەکە بۆ ئەو بەری چۆمی ١١ میتر و٥٠ سانتی‌میترە، هەمووی کڵەکانی لەسەر سەنگ داندراوە لەو بەرەوبەری چۆمی چەند میترێک دیواری بۆ کراوە،

ئێستاش خەڵک و سەڵتە و تفاقکێش و بێری و شوان، حەیوان و پاتاڵ لە هاوینانیدا بۆ مەزرایە هەر بەوێدا هات و چۆ دەکەن.

پردی سوڵتان چەند قسەی لە پشتە:

**یەک** لە لای ڕۆژئاوای پردەکەوە لە چەند قەدەمی پردەکە سەنگێکی پانی لێیە کە بەردێکی زۆر پانی خۆڕستە چوار قوڵکی تێدایە، ئاویان تێدا ڕادەوستێ وەکوو جێگای سمی ئەسپ وان، دروست ئەو وێنە دەنوێنن، ئەوە ئاوا بڵاو بۆتەوە لە نێو جەماوەری دەوروبەر کە جێگای چوار پەلی سمی دوڵدوڵی حەزرتی عەلییە، کاتێک سپای عەرەب لە بانە بوون ئەو بە پەلە غاری داوە و بازی داوە هەر چوار سمی دوڵدوڵ لەو سەنگە چەقیوە و لەو بەردە پانەدا دیارە هەر ماوە کە سمی لە بەردەکە ڕۆیوەتە خوارێ.

**دووهەم** سێ بەردی گەورەی لێیە کە وەک کوچکاور یا سێکوچکە دیارە و لە چاو دەدرێ، ئەوەش دەڵێن جێگای چێشتلێنانی سپایەکە کە ئەوکات لەو وڵاتەدا بووە،جا سپای کێ بووە و کەنگێ بووە کەس نازانێ، هەروا دەڵێن ڕەنگە دەگەڵ سەنگەری سەرشاخی قەڵاتی زاواکێو پێوەندیی هەبێ. دیارە ئەوانە قسەی خەڵکی ناوچەن سینە بە سینە هاتوون ئیتر ڕاستی و ناڕاستییان وەباڵ بە ئەستۆی ئەوانە و بە گوێی مامۆستا. ئێستاش زۆر لە دوور و نزیکەوە بۆ دیتنی دێن و وێنەی لێ هەڵدەگرن و گۆمێکی لە پەنایە بە گۆمی پردێ بەناوبانگە ساڵان لە جێگای دوورەوە بۆ ماسیگرتن دەهاتن بۆ ئەوێ، ماسی زۆر چاکی تێدا بوو.

هـەر ڕێبوارێک بـەوێدا دەڕوا دۆعـای بـەخێر دەکا بـۆ ئـەو کـابرا خێرخوازە کە ئەو خزمەتەی لەو جێگایە کردووە لـە دۆعـای ڕێڕەوانـی ئەو ڕێگایە بێبەش نییە هیوادارم ئەو ئاسارە بەسەمەرە قەدیمیە لـەبیر نەچێتەوە و بمێنێ.

**سـەرچـاوەکـان:**١_ بـە هاوکـاری سـەیدتاهیر حوسـێنی ٢_ وێنـەگر جەماڵ حاجی مارف

**١٣٩٠/٤/٥**

# سەفەرێک بۆ کوێستانی ماینبڵاغی هەوشار



**ڕۆژی پێنجشەممە١/٣/٥**

بەهار کاتی گەڕان و سووڕان و چوونی کێو و قەد و کوێستان و هەرد و بەرد و زەرد و لەند و دوند و سەختی و چڕی و چیا و چیمەن و دیمەن و چۆم و قورغ و دار و نزار و لێڕەوارە. کاتی دیتن و چاولێکردن و چاوپێکەوتن و گوڵ و چڵ و مەل و دەڵ و زونگ و زناوە. کاتی بیستنی دەنگ و ڕەنگ و خشپە و فڕەی باڵندە و بوونەوەرە کاتی غەمڕەواندن، تەم پەڕاندن، خۆ هەڵخستن لە بن بەفر و ڕەند و ڕاوەند کاتی دیتن و بیستنی قاسپەی کەو، نەغمەی بولبول، چریکەی جۆڕڕە، زیڕەی زەردەزیڕە، گمەی کۆتر و سیڕەی سێڕوو و دەنگی دلێری شاهۆ، دانی قەباڵەی خوشبەختی باز، قرتەی قەلەسابوونە،

جێگـەی ماسـیگرە، ورتـەی ماسـی خۆرکـە، جووکـەی پاسـاری، دەنگـی خۆشـی تـووتی، چـاوی جـوانی سـەقـر، چـالاکیی باشـوو، پیرۆزیـی کۆترەباریکە، قرتەی مریشکە کێوی، نرکەی چیرگ، نووکی قولاپی هەڵۆ، تەقەتەقی سمۆرە، قرەقرِی قەلەرەشە، بوبووی کوندە بەبوو، نووکەی کاسـەڵە شینکە، قنەی هەوێردە، رەوتی رۆیشتنی زرەکەو تەقەتەقی داركوونكەرە، قرەی خەبەری ناخۆشی قەشقەڵە، سۆزەی سمینی کەندە سمە، قارەقاری قاژوو، زریوە زریوی خەزایی، پیرۆزی پەرەسلێرکە، تەپەتەپی شەمشەمە کوێرە، کرەکری کورکور، کۆتری رەش بەشی سەرسپی، قاسپەی کەوی بنار و قنەرەوی کەوی بار تێکەڵ دەگەڵ هووشەی چێرگ و دەنگە دەنگی قاز و قولێنگ لە حەوا، تەپەی خەرتەل، زیقەی بەرگاویلکە، رەوتی جوانی قومری، قنەی سوێسکە، قارەی سوورە قانگ، قارە و بڵیندی شاهۆ، جووکە و وردی سریلە، دەنگی خۆشی شەهێن و شمقار، دەنگی جۆرا و جۆر و فیڵە بازی ئەحمەد راوکەر، قنەی جوانی تەرلان، ملی درێژ و گۆشتی خۆشی وشترمریشک، فرکەی مراوی سەرسەوز و بۆرچین و هەزاران باڵندە و پەلەوەر و بوونەوەری دیکە،




**کەو، کەروێشک، دەڵەک**

تێکەڵ دەگەڵ هووشەی مار و بازی کەروێشک و واقەی ڕێوی، زرمەی چوالوو، پرمەی دەڵەک، بۆڵەی ورچ، زیقەی بانبانک، قوتەی مشککەروێشک، کاروانی بە ڕیزی مێروولە، لوورەی گورگ، فڕەی کولله، هازەی بێهێزی پەپوولەی باڵزێڕین، هەڵات هەڵاتی تاجیلۆکە، گازگرتنی مەشکەدڕە، کاروانی بە دوای یەکی بەرازدا، هۆڕەی گاڕان، کاڕەی مەڕ، بێلەی بزن، شمشاڵی شوان، دەنگی خۆشی بەرخۆلە، جوانی و ڕەنگاندنی ئاسک و بزنەکێوی. هەمووی ئەوانە زۆرتر لە بەهاردا دێنە دەرێ و دەبووژێنەوە، خۆ هەڵدەخەن، گوێ ڕادەگرن بۆ زستان زەخیرە دادەخەن. هیوای ژیانی نوێیان وەبەر دێتەوە، ئەوانەن کە کوێستان و شاخ و مێرگ و مێرغوزار، ڕەوەز، قەڵپەز و کون و کەلێن و ئەشکەوت و زەرد و نزار و دار و چوغر و قورغ و قۆپی و گوێ چۆم و خر و دۆڵ و شیو ئاوەدان دەکەن و خۆشی دەکەن دێن و دەڕۆن دادەپەڕن و ڕادەپەڕن. دەنگیان و ڕەنگیان دیمەنێکی دیکە و وێنەیەکی ڕازاوەتر بە وڵاتی کوێستان دەدەن بۆیە هەر بینەرێک هەست بەوە دەکا، ئەوە کاری دانەری هەستییە کە خودای یەکتایە ئەو هەمووە خۆشی و جوانییەی ڕۆناوە لەسەر ئەو دونیایە و ئەوە وەرزی ئاوا بۆ دیاری کردوون وەکوو بەهار تا بتوانن هەموو ڕوح لە بەرێک خۆی تێدا وەدیار خەن ـ و- ودەر خەن نەمرن لە برسان نەڕۆن لە ترسان. جا لەو بارەوە کوردستان بە وێنەی بەهەشت غەملێوە بۆ خۆشی بەهار ئەگەر بێوێنە نەبێ، کەم وێنەیە. کوێستانی ماینبڵاغ کە یەکێک لە ناوچە بەرچاو و خۆشەکانی هەوشارە لە ڕیزی کوێستانە خۆش و بژوێن و

دەوڵـەمـەنـدکانی وڵاتـی کوردەواریـە. سـاڵێ هـەزاران نـەفـەر لـە دوور و نزیک بۆ دیتنی دونیـای سرشت و قـەڵافـەتـی دۆڵ و شـیو و مێرگ و قەڵپـەز و ڕەوەز و چیمـەن و دیمـەن گوڵ و گیـا و خۆراک و سـەوزی لەو جێگا بڵند و نەوی خوار و ژوور خێچ و پێچانە دەچن و دێن.



**کوێستانی ماینبڵاغ**

بۆ دیتنی ڕووتەن و زەمەند و قووڵە مەندێ و خیزەڵان و ئاو ماڵک و پنگـەڵ، بـەرڕۆژ و نسـێ، سـەرکـانی و جۆگـەلـە و گـۆلاو و پۆنگـاو و قوڕاو و ئەستێراو لەو کوێستانە سەر دەدەن چونکە کوێستانێکی پان و بـەرین و دەوڵـەمـەنـد و تێر و تـەسـەلـە هـەرچـی دەچـێ بـە کۆشـی پڕ دێتەوە. دەگەڵ ئەوەش پڕە لە چادر و چیغ و خێوەت و کۆز و هـۆزی جۆراوجـۆر و پـڕە لـە بـەرخ و مـەڕ و بـزن و وڵاغ و گوێلک و مانگـا و گوێلپار و گـاڕان. هـەر یـەک لـە لایـەک هـاتووە و لـە هـەوارێک بارگـە و بنـەی دانـاوە و چـادر و چیغـی هـەڵـداوە جـا بـۆ دیتنـی ئـەو دونیایـە و خواردنی ئەو ئاو و هـەوایـە و چێشـتنی ئـەو سـەفا و وەفایـە بڕیـار درا

دەگەڵ پۆلێک لە ڕفیقان سەرێک لەو کوێستان و نێو گوڵ و گوڵزار و دیتنی نسار و پەساری هەوشار بدەین و ئەو جێگا و کوێستانانە ببینین. وەکوو کوێستانەکانی چۆمی چۆدار، ڕووشان، قەڵپەز، کامێران، ئاوەتاڵ، قزڵویرد، شوانکارە، خاڵندی، شومدیلان، مەحموودخان و کێوەکانی چۆدار وەکوو کونەورچ، بەر چنوورەکە، بەر ڕۆژەگەورە، دۆڵی حەوتکانیان، ترشۆکاوی(جێ هەوار)، وزندرە، هەواری ئەسەد، هەواری خەسرەو، سەرچاوەی چۆدار، قەرەوێران(جێ هەوار).



**مەڕ وکوێستانی ماینبڵاغ**

لە ڕۆژی پێنجشەممە ڕێکەوتی ١٣٩٠/٣/٥ لە شاری ئەدەب و ئەدیب و ئەدەب دۆستان لە بۆکانێ وەک بووکان جوان دەرکەوتین و ڕێ کەوتین تا زەردە لە سەرانی دا لە کەلی جامەرد سەر کەوتین و لە دێی ماینبڵاغ لامان دا بەرەو کوێستانەکانی ماینبڵاغ. هاوڕێیان بریتی بوون لە ١- کاک مەلا عەلی دارەگردەڵە «مەحموودی ئازەر» وەرگێڕ و شاعیر، دەگەڵ تەواوکردنی دەورانی خوێندنی ئایین وەرگرتنی بڕوانامە

له وەرگێڕی و شاعیریدا دەستێکی باڵای هەیە. مرۆڤێکی دڵپاک و بە هەست و بە عیزەتە. زۆر دڵسۆز و ڕاست و ئەمینە و تا ئێستا چەند کتێبی زۆر بە نرخی داوەتە دەست خوێنەرانی عەزیز لەسەر زمانی فارسیوە وەری گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی کە زۆریان کەڵک لێ وەرگیراوە لە ڕفیقایەتیدا زۆر دڵپاک و ڕوح سووکە.

## ڕێواس



کاتی بەهارە لە کوردەواری  
خەمڵاوە بە گوڵ دێهات و شاری

پۆل پۆل کێژ و کوڕ دەچن بۆ سەیران  
بۆ قەراخ چەم و لاپاڵ و گردان

بڕوانن سروشت چەند دڵڕفێنە  
ئەو کەژ و کێوە چەند خەم ڕەوێنە

لایێ جریوە و فڕینی مەلان  
لایە خوڕەی ئاو لە تەرد و تەلان

لایێ سەوزایی لایێ گوڵی سوور  
لایێ بریقەی بەفراوە کۆی نوور

چریکەی بولبول قاسپەقاسپی کەو  
گوڵ یەخەی دڕی ڕاپەری لە خەو

بەفر فرمێسکی ڕژاندە سەر بەرد  
کارگ هاتە دەر وەک بەفری بێگەرد

مەندۆک و بیزا و هەڵز و کوڕادە  
کەو جووت بەست بووە لەسەر مرادە

پێچووکەی پێچ پێچ لەو بەر تەلانە  
کوڕگەل بابەتە لە بۆ کەلانە

ئەرێ هەوالان بەڕۆنەو دیوە  
وەتی چۆتە حەج ڕەنگی پەڕیوە

هۆڵـــــه و نواڵــــه شـــــتێک دیـــــاره — بـــالا بـــەرزێکـــە و شـــای تاجـــداره
گـــەلا لـــە دەوری چـــادری هەڵـــداوه — بینـــەر کـــە دیتـــی زاری پـــڕ ئـــاوه
بالابـەرزی جـوان سـەوزی نوقتـەچـین — لـەسـەر سـەریـەتـی تـاجێکی خـوێنین
وتـم ئـەتـۆ چـی و چیـت لـێ قـەومـاوه — ئـەو تاجـەخوێنـەت بـۆ لـەسـەر نـاوه
کـــوتی نـــازانی ئـــەمـــن ڕێواســـم — هـــەواڵ هێنـــەرم بـــە دەنـــگ و باســـم

**مەلا عەلی دارەگردە(وەفادار)**



**سوێسنەی کوێستانی ماینبڵاغ**

٢- کاک ئەمین گەردیگلانی بۆ هەموو کەس ناسراوە شاعیر و نوسەرێکە کە لە هەمووی ئەو بوارانەدا قەڵەمێکی ڕەساو و دەستێکی باڵای هەیە ئینسانێکی زمانزان و پاک و بە هەستە. کاک ئەمین لە ڕیزی سەرەوەی شاعیرانی وڵات و ناوچەکەمانە تا ئێستا لە زۆر کۆڕ و کووبوونەوەدا بەشداری کردووە و لە لایەن دانیشتوانی ئەو کۆڕانەی وڵاتان ڕێزی تایبەتی بۆ دانراوە. چەندین کتێبی شیعر و نەسر و چیرۆک و ڕۆمانی لە ئیختیاری خۆێنەران ناوە کە کەڵکی زۆریان لێ وەرگیراوە دیارە شوکر ماندووش نەبووە و هەر خەریکە و ئاساری

زۆر و بە نرخی هەیە. کاک ئەمین دەگەڵ ئەو زانایییەی پیاوێکی ئارام، دڵسۆز و دڵپاک و ڕاستە. پێیخۆشە هەموو کەس زانا بێ، دەوڵەمەندێکی حەسوود نییە زۆر دڵ ئاواڵەیە لە نووسین و کوتندا زۆر وردبین و تێبینە لە ڕفیقایەتیشدا زۆر ڕوح سووک و دڵپاکە.

## بەهار



**گوڵەشلێرە، وێنەهەڵگر ئەمین گەردیگلانی**

بە زەبری مشتی تیشکی خۆر شکا پشتی ڕنوو ئەمڕۆ
شنەی با دایڕنی کفنی سڕی داران بە فوو ئەمڕۆ
چلوورە و بەستەڵەک پاکی بە جارێ تەفروتوونا بوون
عەتر دەڕژێ لە ئاسمان و نەما باوی کولوو ئەمڕۆ
بەهار ڕۆحی بە بەر جەستەی سڕ و بێگیانی عەرزا کرد
گەرم داهات زەوی، فەوتا کزەی سەرما و تەزوو ئەمڕۆ
گوریسی عومری زستان و سەهۆڵ و شەختە وا پچڕا
بە دەستی سروە چون باریک ببوو چەشنی دەزوو ئەمڕۆ
بزەی زێڕین و گەرمی خۆر دەبزوێنێ دڵی سەحرا
دەخەملێ هەرد و کەژ وێنەی بەهەشتی ئارەزوو ئەمڕۆ
چنوور و نێرگس و نەسرین، هەڵاڵە و مێخەک و شەوبۆ
گەزیزە و سمڵ و سۆیلانە، گوڵاوڕێژن لە ڕوو ئەمڕۆ
لە بەردا شڕ دەکەن بەرگی خەفەت، دار و دەوەن پاکی
بە سەریانا گوڵی سوور هەڵدەواسن موو بە موو ئەمڕۆ

بــه گــوڵ بــەژنــی بڵنــدی خــۆی دەڕازێنێتــەوە کوێســتان
دەتــارێنێ لــەســەر نــەینووکی دڵ ژەنــگ و کــەڕوو ئــەمــڕۆ
لــە ئیشــقی گــوڵ، هــەور گــەوهــەر دەبــارێنێ لــە چــاوانی
لـە سـایەی گـوڵ، دەبـن پـاراو درەخـت و گیـا و دڕوو ئـەمـڕۆ
لــە بـۆ مــاچی تــەوێڵــی خـۆر، هــەمـوو پشـكووتووە لێویــان
چـرۆی هــەرمــێ و بڵاڵــووك، سـێو و بـادام و هوڵـوو ئـەمـڕۆ
دەڕەخســن گـوڵ، بــە ئاهــەنگی دڵـی شمشـاڵی كـاكی شـوان
كە دانیشتووە لە ژێر سای بسكی سەوزی دار بەڕوو ئەمڕۆ
دەكــەن شــادی لــە نێــو باخــان هــوزار و كــۆتر و شــالوور
لەسەر كێوان كەو و كوڕكوڕ، هەڵۆ و كوند و پەپوو ئەمڕۆ
لــە حاســتی كــاری جــوانی بــاری ســەریــان دانــەوانــد پــاكی
شـلێرە و شـۆڕەبـی، پـۆلی وەنـەوشـە و شـۆڕەتـوو ئـەمـڕۆ
بــەهــارە، ســەوزە دەشــت و دەر، دڵــم بۆیــە وەكـوو بولبـول
لـە باخـا بـۆ گوڵاڵـەی سـوور و گـەش دەگـرێ گـوڕوو ئـەمـڕۆ
بـــە غـــەیری بولبـــولی مـــاتی دڵـــی دیلـــم كـــە تـــەنیایـــە
مـــەلیتـــر پـــاكی دڵشـــادن دەخـــوێنن دوو بـــە دوو ئـــەمـــڕۆ

**ئەمین گەردیگلانی**

٣-كاك سمایل سەیداوا ناسراو بە سمایل پەپوولە بە ڕاستی لە ڕاستی و پاكیدا وەك پەپوولە وایە پیاوێكی دڵسۆز و هەڵسووڕ و بە ئەدەب و توند و تۆڵ بوو دیارە خاوەنی ماشینەكەش ئەو بوو.

٤ كاك حەمەساڵح ناسراو بە وەستا ساڵحی جۆشكار كەسێكی تەیار بۆ سەفەر، پیاوێكی قسە خۆش و بە ئەدەب و هەڵسووڕ بوو

کابان و چاوساغی سەفەرەکەمان ئەو بوو کە چەند جاری دیکە چوو بووە ئەو شوێنانە و کوێستانانە، ئەو بوو بە چاوساغی کاروان.

٥- نووسەری ئەو دێڕانە بە نێوی مەلا مستەفا ڕەشیدی(زاواکێو) کە شانازی هاوڕێی و لە خزمەتدا بوونیانم هەبوو. دیارە ئەمنیش پیری کاروان بووم. بۆ ساعەت ٩ بەیانی گەیشتینێ لاماندا جێگایەک بارگەو بنەمان دانا خێوتمان هەڵدا ئاورمان کردەوە و قەرەوانەمان کولاند و چایمان ساز کرد ئەو جێگایە دواتر مەعلووم بوو کوێستانی دۆڵەمەیە هاوڕێیان ڕۆیشتن دیار بوو لە کارگ دەگەڕان دەنا سەوزی و گیا و گژی دیکە وەکوو مەندێ و کەما و لووشە و خوژە و سیر و کوڕادە و و پنگە و قونسوور دەبوو بە داسی بیدرووی کاک سمایل دوو کارگی زۆر گەورە و خڕ و خۆڵی دیبووە. تا دوای نیوەڕۆ لەوێ بووین کاک ئەمین توربێنێکی کوڕادە بۆ من هێناو کوتی ئەتۆ ناتوانی ئەوە پیرانەیە، زۆرم دۆعا بۆ کرد. دوای نیوەڕۆ بڕیار درا شەو لێرە نابین دەچینە جێ هەوارێکی دیکە ڕوومان لە چڕ و چەوێڕێک کرد پێکەوە دڵپاک بووین بۆیە لەو لێژ و هەڵدێرە ماشینەکەمان ڕزگاری بوو، دەنا نزیک بوو وەک تاوێر هەڵدێرێ بەڵام پاکی و ڕاستی و ئەمینی خۆمان دۆعای دایک و باب و شەخس و پیران لە سەرەوەی هەمووان ڕوحمی خوداوەند مەنان ڕایگرت هەڵی گرت ڕزگاری کرد بۆ شەو ڕۆیشتین بۆ سەر کانی و ئاو و کۆلێکی کە بە ڕاستی دڵی دەلەرزاند هەستی دەبزواند ئێشی لە لەش لا دەبرد نۆش و خۆشی هەموو گیانی مرۆڤی

دادەگرت هات و چۆ و خرتە و پرتەی ژیژک مارمێلکە و سەر مازەڵە و زەردەقۆڕە و کیسەڵ و مشکەکێوی ئەوەندەی کە سروشتەکەی ڕەنگاندبوو. لەسەر کانی بۆق و جرج و مڵە هەوایەکی تایبەتی دابوویە لە سەرچاوە ئاوەکە هەڵدەقوڵی نیازی بە ئاوڕوونکەرە و قەوزە و ئەوە نەبوو دەوری کانی بە پنگ و کوزەڵە و هۆزەڵاو وا رەنگابوو دەتکوت هەزار وێنەگر و تابلۆنووس کاریان لێ کردووە بەڵام کوا چ نەقش و نگارێک دەگاتە دەستکاری هەستی هەر ئی وی جوانە و لەو جوانە شەو لەوێ بووین. دیار بوو ئەوێ «هەواری قەڵپەز» بوو ڕۆژەکەی باش بوو بەڵام شەوەکەی سارد بوو سەرما سڕ و گێژ و وڕی کردین.

به هیچ شتێک گەرممان نەدەهاتەوە بەڵام چونکە سەفەرەکە بە دڵ بوو و جێگایەکە نێوگوڵ بوو کۆڕەکە گەرم و گوڕ بوو سەرماش گوزەرا. ئیتر ڕۆژ هاتە سەر سۆیە گزنگ لە سەرانیدا مەندێ و کەما و کوڕادە دەتکوت بازنەی زێڕ و خەڵخاڵە لە مەچەکی بێری مەڕیدا دەدرەوشێتیەوە، گوڵە شلێرە لەبەر ڕندووی بەفر سێپەڕەی دابوو دەتکوت ڕووی سووری کیژی کوردە هەتاو لێی داوە لەسەر بستوو شیر مەشکی بە کۆڵەوەیە لە بێری بەرەو چادری دێتەوە چاوەڕوانی دەزگیرانە حەڵاڵەکەی دەکا کە بە سواری لە سەفەری بێتەوە لغاوی وڵاغی بۆ بگرێ ئاوزنگی بۆ داخا و لەو بەفراوە بۆی بێنێ و ماندوویی نەمێنی و بحەسێتەوە. ئێمەش بە شنەبای بەیانی و تینی تیشکی هەتاو و بۆنی ڕوحبزوێن و خەمڕەوێنی گوڵ و گیای ئەو دەورووبەرە و نواڵ

و لاپاڵ کە دای لە خێوەتەکە گەرم بوینەوە کرِی و و سری و دژی و گرژی شەوێمان وەلا نا وەک ئەو گوڵە شلێرە گەشاینەوە و( کاک ئەمین دەستی خۆش بێ وێنەکەی کێشاوە و هێناویە). ئەو گیا و گژ و گوڵ و گوڵزارە لاپاڵ و نواڵ و نسار و پەسارە لاباسک و خر و دۆڵ و مێرگە و حەوشە و حەسارە، ئەو جۆگە و بازگە و مشتە و بەر و بوار و بریان و پرِدەڵەو پردەباز. ئەو قەڵپەز و رِەوەز و تەقتەق و بەرد و شاخ و ماهو بەرقەد و قووڵەمەندی و سەر و بەر و تاڤگە و هەڵدێر و خورِێن و پۆنگاو و زەلاو. نێوپزنچک، قووڵەمەشک و سندە و کەندەڵان و بوورە و بەیار و مێژورد و ئەو نەرمان و راوەند و پرِ ئاو و جۆگا و بێدرِوو و کنگر و قەڵچغ و داسوو دارە بۆ دیتن و گەرِان و گەشت و گوزار و سەیرانگایە.



**کارگی ماینبڵاغ**

بە ڕاستی گیانێکی تازە تەزوویەکی نوێ دەدا بە لەش و هەموو لەشێک بێئێش دەکا. ئیتر دوای گەڕان و سووڕان و سەیر و سەیاحەت، خواردن و کردن و بردنەوەی گیا و گژێکی زۆری ئەو کوێستانە. قسەی خۆش و حکایەت و جەفەنگ و شیعر و گۆرانی و بەیت و باو و وزەو ویرەو بالوێرە و نەزیلە و نەقڵ و ئەوانە هەر یەک بە دەستێک گوڵی کۆشیان تێکەڵ دەگەڵ بیرەوەری هەر دەراوەی هەنگاوێک، لە هەر گوڵەی گەڵایەک، لە هەر چڵەی پەلێک، لە هەر پەلەی توولێک لە بوخچەی بیرەوەریمان خست و لە سینەمان هاویشت. ئەوە ئێستا بۆ ئەوەی لا نەچێ و لە بیر نەچێ نەگۆڕێ و نەفەوتێ دەیڵێم و دەینووسم. با بمێنێ بۆ دەورانی بیرەوەری، دەورانی دووری یا نەمان. دوای نیوەڕۆژی جومعە هەر لەو ڕێگایەوە ڕوویبووین بەرەو ماڵ گەڕاینەوە بەڵام بە کۆشوو و دەست و دەروون پڕ. بە دونیایەک پڕ لە خۆشەویستی و لە بیر نەچوونی یەکتر چونکە ڕەفیقی سێ جێگا لەبیر ناچێ ١. سەفەری حەج ٢. هاوڕێی بیمارستان ٣. ڕەفیقی زیندان ٤.ڕەفیقی سەفەر. ئاخ دونیای بێوەفا تا سەر لەگەڵ کەس نی و بۆ کەس تا سەر نابی.

إنماالدنیا کظلّ زائل

او کضیفٍ باتَ یوْمٍ فارتَحَلْ

«حەزرەتی عەلی (د)»




گذشت شور شباب و رسید رخـوت شـیب　　　نه زین گرفتم عبرت نه زان بدیدم کـام
دمی فراز شـباب و گهـی نشـیب مشـیب　　　از این فراز و نشیبم چه بهره جز اوهـام

**استاد سید ابراهیم ستوده**

در خزان برگ‌ریزان گلستان ناگهان　　　تنـدباد مـرگ کنـد از بـیخ سـرو راسـتان

**بابا مردوخ روحانی(تاریخ مشاهیر کرد ج۳)**

**۱۳۹۰/٦/۲۵**

# سەفەرێک بۆ کوێستانی قەڵاگا



لە هەر دەور و زەمانێکدا ئینسان بۆ زاخاوی مێشک و گەشانەوەی هەست و دەروونی و پاراو کردنی بیر و هۆشی تیماری ناسۆڕ و لابردنی ئێش و ئۆفی لەشی بۆ ساڕێژ بوونەوەی کەلێنەکانی غەم و کەسەر و دیتنی دونیا و هەوا و هەوارێکی تر گەڕان و سووڕان لە دەر و دەروو و دەورانێکیتر نیازی بە سەیر و سەیاحەت، گەشت و گەڕان و داپەڕین و ڕاپەڕینێکیتر هەیە. بۆ دیتنی دەور و سووڕ و سەیرێکی دیکە لە ژیانی ڕۆژانە. جا دیارە بۆ ئەو مەبەستە تەنیا کوێستانە خۆشەکانی کوردستانە کە ئەو ئاواتە بەدی دێنێ. هەر بۆیە کوتمان با سەرێک لە هەوارگەی دڵان، کوێستانی گوڵان بدەین. چونکە دەڵێن حەدیسە کە سێ شت غەم لا دەبا لەسەر دڵان ئاوی ڕوون و گوڵ و گوڵزار، سووڕەتی جوان. بەو بۆنەوە بڕیارمان دا دەگەڵ پۆلێک لە

هەوالآن لە ڕێکەوتی ٢٧ بانەمەڕی ١٣٨٥ هەتاوی وێکڕا و تێکڕا بە ماشین بەرەو کوێستان بڕۆین تا تەمێک لەسەر خۆ لابەرین و سەیرێک لە هەوار و چۆم و ڕووبار و جۆگە و جۆبار، نسار، پەسار و لاپاڵ و بەرپاڵ سەیرێک بکەین و چاوێک لە لەند و هەرد و بەرد و زەرد و سەخت و چڕ و چیا بکەین. هەوایەک هەڵمژین و گرژی و چرژی و دژی لە خۆ داڕنین و دیدارێک دەگەڵ ئەو هەموانە بکەین تا بەدی هێنرێ ئەوانە کە خودای مەزنە باش بناسین و گەشتێک لە دۆڵ و شیو خڕ و دەشت و پێدەشت و باسک و لاباسک، لاڕێ و بەرڕێ و کەوان و ڕاستە بکەین تا کەمێکیش لە دونیای پڕ لە غەم و تەم دوور بین و ئەوینی شادی و سەفا و وەفای دوور لە شاری ببینین. جا بۆ ئەو مەبەستە لە بۆکان شاری هونەر و هونەردۆست دەرکەوتین و لە ملەی کانی کەوچکەی گوڵولانی خودالێخۆشبوو «مامۆستا نوری» سەر کەوتین بۆ لای نسار و جێگای گوڵان هەوارگەی دڵان با دەردی لەش هەڵوەرێ دڵتەنگی داوەرێ تا گوڵ و چیا و دیمەن و چەمەن کژ و کاژێر و کەژەوان ببینین.

ئاوی کانیاو و بەفراو چۆڕاوگەی ڕەند و هەرەسی لەند و زنە و زەلاوی کوێستان وەخۆین و دوور لە کلۆر و ئاوی بۆندار و هاڕە و نەڕەی شار بین. با چاوێک لە گزینگی هەتاوی خۆرهەڵات، زەردەی ڕۆژ پەڕین سێبەری ئێواران. بووڵێڵەی شێوان، دوژمن بەزێنی گا دەرکردنەوە و ڕووناکی بەرەبەیان، ماندوویی کژ و نەحەساوەیی خەڵکی لادێ بکەین. با چاو و گوێیەک ببڕینە هات و هووتی کێوەوانی

ئێواران بریقەی داس و مەڵـەغـانی کارگـەران بـا لـوێرە و ویـرەویـری جحێڵان لە ڕێگا و گوێسوانان، ئۆحەی گالەوەڕێنان بارەی بەرغـەل و کارژیلە و فیتەفیتی بەرخەوان و کسەی شوان و باڕەی بەرخە نەبان و بـەیت و لـۆرەی مانگـا دۆش و شـڵقەشـڵقی مـەشـکە و حـەیران و ویرەویری مەشکەژێن. گزینگ هەتا و تێکەڵ دەگەڵ شنە بای لووتکەی کوێستان لـە نـواڵ و بـەرنـواڵی بـەرمـاڵ و پشـتماڵ رەونـد و لـەند و بەرقەد و بەرپێو و لاپێ کوێستانی غـەمڵیو لـە وەنـەوشـە و شـەوبۆ و شـلێر و شـەسـتپەڕ و گیاخـاو بمـژین و ئۆخـەیـەکمـان بێتـە بـەر بـا گورگەلۆقەیەک لە خڕ و کەندەڵان و حەوشە و حەشار و شیو و مێرگ و قۆنەمێرگ و زەل و زەلا و زەنوێران بکەین. با سەرێک لە چاوە و کـانی و تاتـەنوێژی لـە خـودا نزیکـانی لـە دونیـا دوور بـدەین. بـا بڕێـک دوور لـە سـات و سـەودا و نـەڕە و گـوڕە و هـەرا و هوریـای کـڕین و فرۆشـتنی کاڵـەک و کەڵـەک و کوڵـوک بـەین بـا کـەمێک دەگـەڵ سـەفـا و پاکی و چاکی و لە پەنا خێوی چاکان دابین. با چاوێک لە لادێ کەین کە خۆشـــەویســـتیی جیرانـــی و ئاومـــاڵی و پێکـــەوە بـــوون و تێکڕایـــی و وێککەوتن و گەلە کۆمەگی و هەرەوەز و دراوسێی و کار و کار کردن و نەخەوتن و نەسرەوتن و ئارەق ڕشتن بۆ کار و نان پەیداکردن کە دەبێتـە هـۆی لـەش سـاغی، لـەوان فێـر بـین. بـا چـاو ببڕینـە هـەوار و هەوارچـی تـاوڵ و خێوەت و چیـغ و شـوان و بێـر و مـەڕ و بـەرغـەل و بەردەبێر و بێری و مەڕی موڵێ و سەر حەوشە و شیرمەشک و دۆ و دۆدانە و لۆرک و شیرێژ و دەڵەمە و پەنیر و مەیلـە و ڕۆنـی کوێسـتان

وکارەی بەرخ و سارەمە و زاوومـاک و قارەی مەڕ و بێڵەی بزن و هۆهۆ و هێهێ شوان و دەنگی شمشاڵ.



با بۆنێک لە سمڵ و مێخەک و شمڵی بەربەرۆکێ کەین. با گوێ ڕایەڵین بۆ دەنگی خرمەی بێری بەربێری کە لە نێو مەڕی مولێدا بە خرمەی بازنە و خرخاڵ، گۆبەرۆک. سیخمەی پووڵەکەدار، گوارە و کرمەک و گوڵی تاسکڵاو و گوڵینگی پاشەسەر و کۆچکە لاگیرە و بەرموور و مێخەکبەند و ژێرچەنە و قەتارەی سەر پشتێنێ بکەین. با لە نانی پڕ لە فێڵاوی و جۆش و ئێش و نەخۆشی دوور بین. جەمێک کەلانە، کولێرە، هەرمێشک و کولێرە چەورەی بە ڕەشکە و کاخڵی و کونجی دەستاوی هەویر بە ڕۆن و شیر و جوانکراو بە هێلکە بە تەندووری دار و تەپاڵە داندراو لەسەر کەوڵی کەوڵ مەجوعمە پێچراوە لە نێو تێر و توربێن و خورجێن و هەگبە و هەمبانە و چارەکە و کۆلوانە بخۆین. بۆیە دەڵێ دێیە مەکۆی ژیان و ئەوین. با نرکاوێک لە ئاوی بەفراو برێک گیا و گژ بۆ خواردن و هەڵگرتن و دەرمان و جوانی و ڕاگرتنی لەش ئاودراو بە بەفراو و باران شینبوو لە نێو ڕەند و

بن‌بەفر و ڕەوەز و قەڵپەز و هەڵدێر و ئاوهەڵدێر و دیار و نادیار و نواڵ و سەرنواڵ و بەرنواڵ و پەنا بەفرەکان بخۆین کە کوود کراوە بە کوودی حەوشە و حەسار و پەین و پشکەڵ و ڕواوە لە شاخ و بن‌شاخ و بەرد و قەڵشت و تاقگە، هەڵقەنین و بەرینەوە. وەکوو شنگ و پنگ، ئەسپنگ، ئەسپۆن، شلێر و شەونم، شەستپەڕ، شەوبۆ، قۆقمیش و بزنەڕیشە، کنگر، کارگ، کەما، کەنێرە، کوڕادە، کاردوو، کووزەڵە، هۆزەڵاو، گۆزروان، گوڵەبەڕۆنە، کاڵەکەمارانە، کەڵکە، کڵچێو گورگانە، گوڵی ژارەماسی، ترشۆکە، سەیدووکە، کیفۆک، کەلەمکاشوور، دان‌دانۆکە، بەردووکە، ڕێکوڵاو، زیزڕەمەندێ، مەندێ، ئاغجەباشی، گێلم‌بەرباغی، نەعنا، جاترە، سوێسنە، هەڵاڵە، بەیبوون، گیا بەندوو خاو، بیزا، هەڵز، کڵاوبنە، ڕێواس، گندۆرە، پرپرە، شیلان، دڕدووک، زریشک، قازیاخە، گێلاخە، ئەسپەناخ، گوڵە خاش‌خاش و مێلاق، پیچکە، خوژە، لووشە، قوون‌سوور، ترشۆکە خاسە، سۆ، سیر، سیرەخاسە، سیرمۆکە، سیرەکلۆرە، بێژان، ڕازیانە، گەزگەسک، وێنجەمارانە، نانە حاجی لەک لەک، مالوێنچە، ئاڵەکۆک، ئاڵەکۆکە تاڵە، گوڵە مارە، گوڵ و گەڵای سێوەڕە، پۆڵکە، گەسکە فەقێ، گەسکە سپیلکە، چەقچەقە، مێکووک، تۆسی، تاڵیشکە، کەرتەشی، وێنجە کێویلە، گیاچەورۆکە، کاشمە، گیابڵکەنە، گیابنێشتە، سێوەڵووکە، گیاپڵاوە، گیاقیترانە، گوڵ قەباخە، چەقە، گیابەرخۆلە، مژمژۆکە، تاڵەگەزە، کاردوو، کەس‌نەخۆرە، نۆک‌نۆکیلە، گیاسالمە، شیرشیرۆکە، گوڵەزەردە، چاو پشیلە، گوڵی چنوور، چەورۆکە، گیا چنارە، پێچۆلەکە، کەرکۆڵ، قەشقە، نووسەنەکە،

زریزانـه، کەرتـەوڵ، گوڵـە گـەزیزە، گوڵـە پـاییزە، گوڵـە مێخـەک، گیـا هەوێدار، گوڵە جووتیارە، گەڵا ڕەکێشە، گیا شاتەرە، ڕۆنی گیـای کەمـە، گوڵی چەقالە کێویلە، گوڵی داری ئەرغەوان، کارگی داریێ، چـاو کەسکە، هەمیشـە بـەهارە، گوڵەکچـە، بەلبەلـە شـوانە، گیـای چـاوە شـوانە، گوڵـە بابوونـە، گوڵـە سـەدەفی، گوڵـە کـەنێرە، گوڵـە هێرۆ، ئاڵقـەتیز، بەلاڵووکـە کێویلە.



جا بۆ ئـەو گـەشـت و گـەڕان و سـووڕانە بـۆ ژینـەوە و بوونـەوە و بردنـەوەی ئـەو گیـا خـۆراکی و جوانی و دەرمانیـە کوێسـتانی قـەڵاگـای مێرگەنەخشینەمان هـەڵبژارد بـە نێو دێی مێرگـە نـەخشـینەدا تێپـەڕین و ڕاپـەڕین تـا زوو لـە چـۆم وەپـەڕین لـە داری مـەلا عـەولا سـەرکـەوتین. بسـتوو بـە بسـتوو، تـەپـک بـە تـەپـک و گـرد بـە گـرد دەگـەڵ وچـان و حەسانەوە و پشوودان تا گەیشتینە سەرچاوەی گۆڕەپانی ویشکە شـیو لە پەنا شـاخی قـەڵاگایـە لـەوێ بارگـە و بنـەمـان دانـا جێگـا هـەوار بـوو. شووڕەی تاوڵ و کۆزی بەرخان و بەردەبێرەکەی لێ مـابوو. پیشـەکـان و قەرەوانە و بەرکۆش و تێر و توربێن و خرتە و پرتەمان لـە عـەرز دا

بەفراوێکمان خوارد چاوێکمان گێڕا و هەوایەکمان هەڵمژی و هیوا سۆیەکمان هاتەوە بەری و چایەکمان بە ئاوی کانیەکچان لێنا. سەرمان وەسەر بەردی کرد و وەنەوزێکمان دا و چاوێکمان گەرم کرد و حەساینەوە و پشوویەکمان هاتەوە بەر. بەرەو لووتکە و گوندی قەلافەتی قەلای قەلاگە ڕوانیمان و سەیری ئەوبەر و بەری باوسێن و گەردنەی کەلیخان و میزەگای ساردەکۆسان و شاخ و کێوەکانمان کرد. قەلاگا لە زنجیرەکێوەکانی زاگرۆسە و لە سەفی کێوە بڵیندەکانی وەک چلچەمە، ئاگجە و ئۆگجەی و نەکەرۆزی سەرشیوی سەقز و وەستا مستەفای تورجان و لەندی شێخان و مەیدان ئەستەڕ و کوێستانی پیرەسەنانی مەهاباد و هەواری میرخاسان و مەیدان چوغەی چیای نستانییە. کێوێکی بڵیند و کوێستانێکی خۆش و بەفرگر و دەوڵەمەندە. بڵیندی لە دەریاوە ٢٣٣٠ میترە. لە باکوورەوە دەگەڵ کوڕەسووتێی وزمەڵە و پیر چۆپان هاوسایەیە. لە باشوورەوە دەگەڵ کوێستانی کانی تاڵ و سەرتوونی باوسێن و خاپوورەدێ پشتی ساوان و سەدباری بانە جیرانە. لە خۆرهەلاتەوە دەڕوانێتە گەردەنەی کەلیخان و لە لای ڕۆژاواشەوە دەگەڵ قەبری کوڕ و کچان و مەیدانان و کوێستانی گوڵی بەرکانی بانە دراوسێیە. دوای حەسانەوە هاوڕێیان بڕیاریان دا وێهەڵبن و تێهەڵبن بۆ گیا کردن، بڕۆن بۆ لەند و دوند و ڕاوەند و سەخت و لێژ و تەقتەق و تەلان و بنار و تەپک و قوتو و قولله و زەقاییەکان بۆ لاپێ و بەرپێ و سەر و بەر و ژووروو خێچ و پێچ و چاڵ و قووڵ، هەڵدێر و لادێر و ئەوانە. ئەمنیش کە تازە لە

نەخۆشی هەستابوومەوە دیارە بەرەوپیری پیریش دەڕۆم، نەمدەتوانی بۆ گیا کردن ڕاپەڕم و بە چڕ و چیا هەڵگەڕێم و لەبەر مار و دڕندەو جانەوەر دەرپەڕم. زۆرم غەم خوارد بۆ ئەو وڵاتەی خۆم کە ناتوانم لێی بخۆم و لێی بڕۆم. پیری و نەخۆشی و بێهێزی ئاسۆی مەرگ دەکا دیاری. لەو نزیکانە کانییەکی زۆر خۆش و ساردی لێیە بە نێوی **کانی کیژان** ئەگەر هەڵەم نەکردبێ ساڵی ١٣٥٥ لە خزمەت سەید عومبەری ئاجیکەند هیدایەتی کە هاتە زاواکێو لەوێیەوە بۆ ڕاوەکەو بە سواری چووینە سەر ئەو کانییە. ڕەبی قەبری پڕ بێ لە نوور. پیاوێکی لەگەڵ بوو بە نێوی حەمەدەمینی کەریم مەلا، لە مەهاباد بوو ئیشاڵڵا ماویشە. وردە وردە ڕۆیشتم دەتکوت دەچم بۆ شەوارە یا هەوێردە گرتن کە چوومە سەر کانییەکە هەر وەک خۆی مابوو زۆر سارد و زۆر و ڕوون و جوان بوو، سەد سەری مەڕ لێ پاراو دەبوو شاخی پشت کانییەکە شاخی سێبەری پێ دەڵێن هەر وا قیت و قۆز بوو ڕندۆ بەفرێکی لێ بوو سامدار سامی لێ دەکرد. تکە و چۆڕاوگەی ئەو بەفرە ئەوەندەی دیکە ئاوی کانییەکەی زۆر و سارد کردبوو.



گوڵەشلێرە سێپەڕەی کێشابوو دڵێک هەزار دڵی پێ دەگەشاوە ئاهێکم هەڵکێشا و کوتم ئەی دونیای بێوەفا نە دەگەڵ کەسی و نە تا سەر بۆ کەسی. بە خۆم کوت با بچمە پێشێ لێی نەترسێم و وت و وێژی دەگەڵ بکەم و گرێی دڵمی لە کن وەکەم.

## وت و وێژی ئاو و پیر

ڕووم تێکرد و هەڵم دایە: کانی کیژان تۆ هەر ماوی پیریش نەبووی! هەر وا جوانی ئەتۆ چۆمی، جۆگەی، چۆڕی، گۆمی، خڕاوی، تۆ هورووژمی، تۆ سێڵاوی، زۆر و کەمی، هەمووی دونیا دەتخواتەوە، لێت تێر نابێ گەر تۆش نەبی تەسەل نابێ تۆ جوانی، جوانان بە تۆوە جوان دەبن لە جوانیش جوانتری کەس بە بێ تۆ جوانیش نابێ هەر چی هەیە گەر تۆ نەبی ئەویش نابێ، غەمهێنەری، غەمڕەوێنی، تۆ فرمێسکی تۆ ئاونگی، تۆ ئارەقی سەر گۆنا و مەم و سنگانی، لەسەر پەڕی گوڵ دەنیشی، ئەتۆ زوقمی، تەرزەلووکەی، تۆ سیخواری، سێپەڕەی لە ناشتایان لەسەر چڵی هەر، لەسەردا سوێر و شیرنی، تاڵ و تفتی، هەر لەو جێیە هۆی ناسینی خودای مەزن یەک ئەوەیە هەموو جێیەک تۆ

دەبینـیَ، تـۆ حـەیاتی، کـەس نییـە نـەتخـوا، ڕوون و لیخنـی، سـارد و گەرمی، تەنانەت مردووش خوت پیَ دەشوا.تۆ لـە شـاخی، تـۆ لـە نـاخی، تۆ هەویَنی، تۆ ئەوینی، بۆ ئەوینیش تۆ هەویَنی.

## پرسیار لە کانیاو

بپرســـــە لە ئـــــاو، ســــەرچاوەی ژیــــان
بــــــۆچی ســـــــاتیَکی نیَتـــــــی هەدادان
قەتقەت ناســـــەروێ، دەڕوا بـــــێ وچــــان
ڕیَـــگەی نــــاگرن ســــەد و بەنـــد و ژان
هەر ڕیَـگە دەبـڕیَ و سـەر لە خـاک دەسـویَ
بەو ویَرەویَــــــــرە لەگەڵ کـــــــیَ دەدویَ؟
ئـــــــاواتی کانیــــــاو چۆمــــــاوە نەک زنە
یەک گــــــرتن لەگەڵ دەریـــــای بـــــێبنە
هەتـــا نەگـــاتە نیَـــو خـــزم و کەســــان
بیَشــــــک دەبینــــــیَ زەرەر و زیــــــان

## جوابی ئاو



**سەرچاوەی کانی کیژان**

ڕووی تێکـردم ئـاوی ڕوونـاکی کـانی کیـژان کـوتی هـۆ کـاکی نەخۆشی ڕێبوار ئەوەی کوتت هەمووی وایە ئاڵقەیە لە گوێچکەمدایـە بـا پێت بڵێم گیانـە ئێمـە ئـاوین هـەرچی ببین دەبینـە ئـاو ئـەمن ئـاوم قـەت ناگۆڕێم هەتا ماوم من هەر ئاوم من هەر ئاوم.

**مەلا مستەفا ڕەشیدی(زاواکێو)**

# ئاوڕێک لە جیٚ ئاورێک

## گەورک چەند بەشە

**گەورک: نێوی عەشیرەتێکی کوردە، هەنبانەبۆرینە**

**ناوچەی گەورک پێنج بەشە لە باری ناوچەیەوە:**

١ _ گەورکی سەقز کە سەر بە پارێزگای کوردستانە لە کێوی وەستا مستەفا و دێی مەرخوزەوە تا دەگاتە کێلەشین و کەلی خان و دەڕواتەوە نەکەرۆز وقوڵقوڵە و پیرۆمەران دێتە شێخ چۆپان و پیر چۆپان کە ئێستا بە دێهاتی میرەدێ دەناسرێ. ٢- گەورکی بۆکان کە بە گەورکی موکری دەناسرێ لە قوڵقوڵەو ئیسکی بەغداوە تا قالوێ و ئاغوتمان دەچێتەوە قروچاو و دەڕواتەوە برایم خەسار و گەنمان و مووسێ، زاواکێو، تا مەرزی بانە. ٣- گەورکی مەهاباد لە کانی سێو و وزنتاش دەچێتەوە گامێشان و مەناڵە و دەڕواتەوە سوێناس و گردشیلان و تۆرە و کەڵەکاویە و کاولان و قوزلوێ کە ئێستا بە دێهاتی خەلیفان دەناسرێ و نێو دەبردرێ. ٤- گەورکی سەردەشت لە دێهاتی زمزیران و نستان، سیسێر، گۆلێ، لیلانی دێتەوە سارکێ و تا نزیک پردی بریسوێ و دەچێتەوە شەندرە و شەمۆڵە کە ئێستا سەر بە

شارستانی ڕەبەتە. ٥- گەورکی نەڵێن کە دەڕواتەوە بۆ بەشی نەڵێن سەر بە میراوای سەردەشتە.

بە هۆی ئەوەی زۆری دەورانی سەرەتایی ژیانم لە ناوچەی گەورک بووە و ئەوکات هەمووی بێڕێگا و بان و بەرق و ماشێن بوو و ماوەی ٣١ ساڵ تەمەنم لەوێ تێپەڕاندووە و هەر لەوێ خۆشی و ناخۆشی و زیندان و ئازادیم دیتووە هەر بۆیە هەست و دەستم بە پێویستیان زانی وتە و کوتە و قسەی قەدیم و زاراوەی ڕەسەن و ژیانی چۆنی بوونی ئەو چەند دێیەی گەورکی سەرێ یا دێهاتی دۆڵێ یا ئاخری گەورکی موکری بنووسرێن و لە دەست نەدرێن با ون نەبن وەبن گڵ نەکەون و ببیندرێن و بزاندرێن و بێنە گۆڕێ، با لە گۆڕوو و کراڵدا بێنە ڕوو؛ بکەونە دەست گەڕۆکان و گەڕەکان بۆ ئەوەی ئەو گەنجینەیەی زانستی لەبن بەڕە بێتە دەرێ تا بەرەی داهاتوو لە ئێمە لێزانتر و پێزانتر زۆر بە هێزتر و بە پێزتر لەسەری بڵێن و بنووسن. جا ویستی ئێمە لێرەدا گەورکی بۆکانە، لە گەورکی بۆکانیش ئەو پێنج دێهاتەی دۆڵێیە، لازمە ئەوە بڵێم کە لە پشت پردی سوڵتانەوە پێنج دێی لێ هەیە بە نێوەکانی ١ _ ساردە کۆستان ٢_ زاواکێو ٣_ موسێ ٤_ برایم خەسار ٥- گەنمان کە بەو پێنج دێیە دەکوترا دێهاتی دۆڵێ جا ئەمن لە ساردە کۆستان لا دەدەم چونکە مامۆستای نەمر ڕاوچی و کاک کاوەی کوڕی بەڕێزیشی نووسیویانە و کوتوویانە.

# زاواكێو



## «دێی زاواكێو»

بڕوانـــه دێـــی زاواكێـــو وێنـــەی بەهەشـــتی بەرینـــە
هەرجێیەک تۆ ڕووی تێ دەکەی بۆنی عەتر و یاسەمینە
ئـــاوی كانیـــاو و بـــەفراوی شـــەربەتی ئەســـكەنجەبینە
حـوری و قسـور میـوەی بەهەشـت وەرە عـەزیزم ببینـە
شـەوبـۆ و شـەونـم شـایی دەكـەن هـەوێنـی دڵپێكـەنینـە

دیارە هەمووی دێهاتی کوردستان بە هۆی ڕووداوی جۆراوجۆر ئاڵوگۆڕیـان بـەسـەردا هـاتووە زاواكێـویش كـەم بـووە، زیـاد بـووە، ڕووخاوە، چاک کراوە، بەڵام بەردی بناغەی هەر ماوە لەبەر ئەوەی

دێیەکی زۆر کوێستان و سەرسەوز و دڵگیرە و چەندین دیاردەی وای لێ هەیە بۆ نووسین و زانین دەبێ هەر بۆیەش بە پێویستم زانی لە دڵ و گڵدا نەمێنێ و ببیسترێ و ببیندرێ. زاواکێو لە بناری کوێستانەکانی چەنگەرنە، گوڵی بەرکان، شاخی قەڵات، کە لە زەنجیرە کێوەکانی زاگرۆس دروست کراوە و لەسەر چۆمی سەرچاوەی ئاو دەلەومەران، سەرچاوەی چۆمی زەنبیل، تەتەهوو، «سیمینە» هەڵکەوتووە خاکێکی نەرمان، کوێستانێکی دەوڵەمەند، کانی و ئاوی زۆر، لەوەڕگە، نسار و پەسار، بەرپاڵ و لاپاڵ، سەرچۆم و بەرچۆمی زۆرە کە گیا و گژی کوێستانی زۆر هەیە. دەکرێ بڵێین لە کوێستانە دەوڵەمەندەکانە. زاواکێو چەند جێگای هەیە بۆ زانین دەبێ. **یەک:** دەوری زاواکێو دوو پەڵەداری لێ هەیە کە بە مڵکی کەمی وەبەر زاواکێو دەکەوێ بەڵام لە سەیر و چوون و بوونی بێبەش نییە.**یەکیان** سێچاکانە ئەو پەڵەدارە لە گۆڕستانی ساردەکۆستانەوە تا بەر ماڵی زاواکێوی گرتووە،



**«چۆمی ساردەکۆسان»**

چەندین هێکتار دەبێ، هەر لە زۆر قەدیمەوە بووە خۆڕستە وەک نزار سەری لێکداوە زۆریشیان داری بەرین، مەباحو ئازادن بۆ کەس قەدەغە نییە. داری گێوژی لێ هەیە بە هەموو بەشەکانیەوە. دارەکانی ئەوانەن:گێوژ(گۆیژ)، جا گێوژە مۆرە، زەردە، سپی، سوورە، تاڵە، کوڕکوژە، گێوژە گەورە، گێوژە ڕەشباڵە، گێوژە هەویرە، گێوژە ڕیخنە ئەوانە جۆرەکانی گێوژن.






هـەرمـێ، هـەرمـێ کێویلـە، کـڕووزی، کرۆسـک، شـیرنە ئـەوانـەش جۆرەکانی هەرمێ کڕووزین. گوێز: گوێزە کوێرە، گوێزی ئازا، گوێزێکی دیکـە کـە بـە گـوێزی خـەلیفـە مـەلا حـەسـەن مـەشـهوورە. داری نـزار و لێـڕەواریشـی زۆر لێیـە. داری نـزار و لێـڕەوار کـە بـە داری جـەنگـەڵ و سەختەدار بە ناوبانگە سێ بەشە:١- مازودار ٢- داری شەکی ٣- داری ویوڵ.

داری مـازوو و داریـش بـەتـەنـێ نزیـک بـە ٧ بـەر دێنـی: ١. گـەزۆ ٢.مازوو٣. بەڕوو ٤. قەشقە ٥. گزگل ٦. تسقوڵ ٧. خرنووک

دیارە بەرەگـەڵاشـی هەیـە و گـەڵاشـی لـێ دەکـەنـەوە بۆ حـەیوان لـە تایەی دەدەن بۆ زستان هەر لە نێو نزارەکەدا کە گەڵی پێدەڵێن ئەوانە بـەری داری مـازوودارن کـە هـەر یـەک بـۆ جێـی خـۆی بـۆ شـتێک و دەرمانێک بە کاری دێنن.



**داری مازوودار**

کاتێ گەڵا ئاخر مانگی هاوین بوو ئەوەی کە دەکرێ بە گەڵا بۆ حەیوان سێ بەشە

**یەک:** بڕی یا بڕدراوی پێدەڵێن ئەوە ئەوەیە ئەوساڵ کردراوە و بڕدراوە و ساڵێکی دیکە ئەوە نابڕنەوە **دوو:** کوری پێ دەڵێن ئەوەیە کە پارەکە بڕدراوە. **سێ:** خرتی پێ دەڵێن ئەوەیە کە چەند ساڵ لەوە پێش بڕدراوە ساڵی داهاتوو ئەو دوانە دەبڕن بۆ حەیوانێ گەڵاش لە داری مازوودار دەکرێ. مازوو دوو جۆری هەیە مازووی شین و مازووی سپی.



**بەڕوودار**

دیارە داری ترێی لێ هەیە. خواردن و بردنەوەی بۆ هەموو کەس ئازادە بەڵام کەس نایبڕێ و دارەکەی ناباتەوە دەڵێن گوناحە و پێمانەوە نایە پاییزان لە هەمووی دێهاتی دەوروبەر کچ و کوڕ و ژن و پیاو دێن و سەیر و سەیاحەتی خۆیان دەکەن و بەشی خۆیان و دەرو جیران دەبەنەوە بێ ئەوەی کەس دەنگیان دا و قەدەغەیان لێ بکا.




**«شێخڕەشی زاواکێو»**

پەڵـەداری دووهـەم کـە هـەر نێوی پەڵـەدارە، دیـارە پەڵـەداری شـێخ مستەفاشی پێدەڵێن.ئەویش لە بەینی موسێ و زاواکێودایە.

ئـەویـش ئـاوا زۆرە و هـەمـوو دارێکـی لـێ هەیـە جێگـای سـەیر و سـەیاحەتـە و پـاییزان لـە هـەمـووی ناوچـەکانـەوە دەچـن و لـە بـەروو بۆیـەکـەی دەبـەنـەوە بـۆ مـاڵێ. لـە ڕابردووشـدا سـووتەمـەنـی کـوورەی مزگـەوت هـەر لـەوانـەوە دەهـات نـەک بـۆ مـاڵان چونکـە ئـەوکـات هـەر کوورەی داری هەبوو.

**دووهەم** جێگایەک لە زاواکێو کە هەیـە **شـێخڕەشـە**، هـەر ئـەو شـێخ ڕەشەیە کـە لـە بـەیتی فولکلۆری کوردیدا بـە نێوی شـێخ ڕەش و شـێخ مەند وێژەوانانی کوردی کوتوویانە هەر چەند شێخ ڕەشێکی دیکە هەیـە لـەسـەر ڕێگـای شـنۆ و پیرانشـار، بـەڵام ئـەوەش لێرە هەیـە وارشـی بـە دەورەوەیە و چەند داری لە کنە لەسەر جادەیە، کە چـەند قـەدەمێک لـە دێـی زاواکێـو دوورە. زۆریـش خـەڵک و کچـان و کـوڕان دیـدەنی لـێ

دەکەن بۆ بە مراد گەیشتن بەردی پێوە دەنێن و چلدانەی لێ دەگرنەوە.




**« کێوی ئامینکوژراوی زاواکێو»**

**سێهەم:** جێگا زاواکێو دێیەکی کوێستان و وڵاتێکی سەرسەوز و بژوێن و دڵگیری هەیە. خەڵک دەچنە هەواری بۆ مەڕداری جێگا هەوارەکانیشی ئەوانەن سێوەتاڵە، گوڵی بەرکانە، شاخی کوورە، هەواری ماڵان، هەواری ئایشێ و شاخی قەڵاتە. قەڵات کێوێکی چڕو دڵ و لێژ و بڵیندە، بەڵام کوێستانێکی پڕ و تێر و تەسەل و دەوڵەمەندە. زۆربەی گیا و گوڵ و دیارییە جوانەکانی بەهاری کوردستان لەوێ هەیە. بەڵام شتێکی کە جێگای وردبوونەوەیە ئەوەیە لەسەر ئەو شاخە بڵیندە سەنگەری لێیە وەک شاخی تەرەغەیە، ئی کێیە و کەنگێیە، کەس نازانێ.

**چوارەم:** جێگایەک هەیە لەسەر ڕێگای زاواکێو، موسێ، برایمخەسار ئەو جێگایە گامێشقرانی پێدەڵێن ئەوەش ئاوا بووە حەفتا هەشتا ساڵ لەمەوبەر سێ نەفەر چەتە لەو مەڵبەندە خەڵک ڕووت دەکەن و ڕێگری دەکەن خەڵک لێیان وەڕەز دەبن. یەک نەفەر دێ بە سواری لە دۆڵهەرزنی بانەوە بە نێوی میرزا ئەحمەد تفەنگەکەی لەپێش خۆی دادەنێ دەگاتە ئەو شاخ و هەوازە ئەو سێ نەفەرە دەنگی دەدەن دەی ڕووت بە، دەنا دەتکوژین ئەویش زۆر دەپاڕێتەوە ڕێگام بۆ چول کەن لێمگەڕێن با بڕۆم لە کۆڵم بنەوە ئەوانیش ڕێگای نادەن دەڵێن تفەنگەکەو ئەسپەکەت لێ دەستێنێن. کاتێک دەزانێ بە ڕاستی ڕووتی دەکەن و ئابڕووی لە خەتەردایە دەڵێ ئەگەر وابێ نەمانم چاکترە، گورج خۆ فڕێ دەداتە خوارێ سەنگەر دەگرێ و دەست بە تەقە دەکا دوانیان لێدەکوژێ دوای ماوەیەک ئەوی دیکە بە برینداری هەڵدێ کاتێک خەڵک دێن ئەو کەلاکانە بەرنەوە دوو ڕۆژی پێ دەچێ چونکە خەڵک نەیانوێراوە زوو بچن. یەکیان زۆر هەڵدەمسێ لەو چەتانە، کابرایەک دەڵێ تەح گامێشقڕانە جا ئیتر لەو ڕۆژەوە بەو جێگایە دەڵێن گامێشقڕان.




**«دۆڵی گامێشقرانی زاواکێو»**

دیاره زاواکێو زەوی و کشت و کاڵی کەمە، خەڵکەکەی مەڕدارن و کانی و ئاوی زۆره، لەو دوایانەدا باغی دەستی و میوەی خۆماڵی لێ پەیدا بووە. جێگا خۆش و بەنێو بانگەکانی ئەوانەن: سووتمان، خرێ زێڕنە، هەڵووچان، ئەحمەد کوژراو، ئامین کوژراو، کێلێ، قۆپی، هەواری ماڵان، داری خەسرەو کوێستانی سەرێ، شێخ ڕەش.



**«چۆمی ماڵان »**

خانووەکانی بە سەنگ و ویشکەبەرد داندراوە. بە کوتک و نێڵە لە شاخی دەر دەهاتن و بە بەردکێش و گوێدرێژ دەیانهێنا بۆ سەر کاریَ، بە بەننای تایبەتی دایان دەنا. ئەوکات لە ناوچەدا دوو بەننا دەیان زانی ئەو دیوارانە چاک دابنێن. ١. لە زاواکێو عەلی مەلا بوو ٢. لە سوێناس وەستا مەحموود بوو. هاتوچۆ بۆ شارەکان هەر بە وڵاغ بوو، جا بۆ بۆکان بە سڵامەتدا و بۆ مەهاباد بە سوێناسدا دەچوون ئیدی کەس لە دێدا ماشینی نەدیبوو. تا لە ساڵی ١٣٥٥ ئەمن وەک مەلا مستەفای زاواکێو لەگەڵ چەند نەفەر ڕدێن سپی چووین بۆ مەهاباد بۆڵدزێرێکی (د ٦)مان بە کریَ گرت سەعاتی بە دووسەد تمەن، بە کۆمەگی خەڵکی ساردەکۆستان و زاواکێو و جەعفەرخانی حەیدەری ٢٠هەزار تمەنی لە لایەن مەجلیسەوە داینیَ و هێنامان بۆ ئەو دێهاتە جادەمان لیَ دا. جا خەڵک بۆلدزێلی نەدیبوو پێیان سەیر بوو، منداڵ وەدوومان دەکەوتن؛جادەمان لێدا بۆ زاواکێو. ئەوەڵین جار خەڵک کە ماشێنیان دی لە نێودیَ جێژنیان بۆ گرت. ئەوەندە شتێکی خۆش بوو، چونکە زۆرکەس هەر ماشینی نەدیبوو جاری وابوو کەسێک نەخۆش دەبوو یا ژن ژانی دەهاتیَ و لە منداڵی نەدەبۆوە لە زستاندا و لە کاتەکانی دیکەشدا دەبوو لەسەر دارەمەیتی دانێن سیَ سەعات و چوار سەعات بە ٢٠ یا ٣٠ نەفەر لەسەر شانی بیگەیەنە جێگای ماشێن ئەویش ئەگەر مابا گەیشتبا شاری. جا بۆیە خەڵک شادی و جێژنیان بۆ هاتن و دیتنی ماشێن دەگرت. ئێستا جادەی قیلەتاو، کارەبا، لوولەکەشی، شیرکەت

تەعاونی، مەدرەسەی سەرەتایی و راهنمایی، دایرەی تەندرووستی، تەلەفوون هەیە. سەیرانگا و سیاحەتگای زۆربەی شارەکانە.



«پشت ماڵی زاواکێو»

نازناوی زاواکێو وەک قەدیمیەکان دەیان گێڕاوە بۆیە پێی‌دەڵێن زاواکێو:١. دەڵێن خێڵێک لە لاوە هاتوون وەکوو گەرمێن بێ، ویستوویانە ئەوێ کە بەر ڕۆژە ئاوەدانی کەنەوە دیتوویانە ئاوەزێیە کوتوویانە زاوەکێو، یانی ئەو کێوە زاوە ئاوەزێیە بۆ دانیشتن نابێ ڕۆیشتوون هەر مەزرای ئەوێ دێیەکیان ئاوەدان کردووەتەوە، جێگا دێیەکە دەراوی کۆڕەبییە و قەبرەکانی بەنێوی قەبرە دۆم هەر ماوە. جا لازمە ئەوە بڵێم ئەوکات هەر کەسێ لە گەرمێنەوە هاتبێ یان گەرمێنیان پێ‌کەوتووە یان دۆم. ٢. دووهەم کە پێی‌دەڵێن زاواکێو وەک دەگێڕنەوە گۆیا کوڕێک و کچێک کە زۆر جوان و نازەنین دەبن دڵیان پێکەوە دەبێ چەندین جار کوڕە پیاوماقوڵ دەنیرێتە خوازبێنی کچە، بەڵام بابی کچە کە دەوڵەمەند، ساحەب عەشیرەت دەبێ

نایداتێ، ئیتر کوڕە کە نێوی ئەحمەد دەبێ ناهۆمێد دەبێ لە کچە کە بیدەنێ، وڵامی دەنێرێ بۆ کچە کە ئەویش نێوی ئامین دەبێ دەڵێ ئەمن سەری خۆم هەڵدەگرم و دەڕۆم چونکە بابت زۆر بێڕەزایە و دەوڵەمەندە ئەتۆش بە منەوە دەکوژرێی، دەزانم نات‌دا، لێم گەڕێ با سەری خۆم هەلگرم، با ئەتۆش بە منەوە تووشی بەڵا نەبی و لەبەین نەچی کچەش لە وڵامدا دەڵێ گیانم لە تۆ زیاتر نییە شەرتم دەگەڵ کردووی، گیانم دەگەڵ گیانتە لە مان و نەماندا یا هی تۆم یا هی گڵم. شەوێ کچە دوو یەختەرمە لە یەختەرمەخانەی بابی دێنێتە دەرێ، بە جووتە سوارە ڕێ دەکەون دێن بۆ دیوی سیاکێو لە دۆڵێ دەگیرسێنەوە. لەوێ حەشارێ هەڵدەگرن بۆ ماوەیەک دەمێننەوە لەو جێگایە خانوو درووست دەکەن کە ئێستا زاواکێوە بەڵام وەک دەڵێن کچە و کوڕە بە شێوەیەکی نادیار دەکوژرێن. دایک و بابی کوڕە کە بنەماڵەیەکی فەقیر و بێدەسەڵات دەبن کاتێک دەیان گەنێ بەسەر تەرمەکانیاندا دەچن ئیتر نایان گوێزنەوە هەر لەوێ دەیان نێژن دەڵێن ئەوە بە نامرادی بوونە زاوای کێوی کە هێواش هێواش بۆتە زاواکێو. ئێستا دوو لووتکەی کێوی بڵێندی لێ هەیە لە نزیک ماڵان بەنێوی ئامین کوژراو-و- ئەحمەد کوژراو و دیارە ئەو دوو جێگایە زۆریش بڵێند و خۆش و باسەفان و جێگای سەیاحەت و سەیرانگای خەڵکن. ئەوەیە زاواکێو کە نێوی زاواکێوە. جا وا دەردەکەوێ نێونانی ئەو دوو جێگایە بە نێوی ئامین کوژراو و ئەحمەد کوژراو، هەر بەو بۆنەوە بووبێ.

**سەرچاوەکان:** ١- قسەی قەدیمیەکانی بەساڵداچوو ٢- بوون و تەجرووبە و دیتنی خۆم لەو ناوچەیە.

# گوندی ساردەکوێستان



ساردەکۆسان دێیەکی دیکە لە دێهاتی دۆڵییە کە لە پشت پردی سوڵتانەوەن و کوتمان پێنج دێیە. ١- ساردەکۆسان ٢- زاواکێو ٣- مووسێ ٤- برایم خەسار ٥- گەنمان. بۆ نازناو و جێگای مێژوویی ئەو دێهاتە قسە و باسێکیان لە پشتە کە باسی دەکەین و نێوی دەبەین. ئەو پێنج دێیە سنووری شارەکانی سەقز و بانە و سەردەشت و ڕەبەت و مەهاباد وێک دەخاتەوە. ساردەکوێستان لە کوێستانی بەردەقەل و مێزەگاوە دەگەڵ شێخ چۆپان و مێرگە نەخشینەی سەقز دراوسێیە و خەتیان لێک دەگەڕێتەوە. زاواکێو لەگەڵ کوێستانی گوڵی بەرکانی و حەوزی حاجی مستەفای بانە شێنان پێکەوەن. مووسێ لە زەردەگڵی دەگەڵ بەردەڕەش و چنگەڕنە دەگەڵ کەشەنێی بانە دراوسێن گەنمان لە چیای نستان و گەردەنەی گۆڵێوە لەگەڵ ڕەبەت جیرانن. برایم خەسار لە هەواری لاس و خەزاڵ و کانییە خەزاڵێ دەگەڵ ماژگە و گردشیلان مەهاباد هاوسایەن. ئەو دێهاتە دەگەڵ هەمووی دێهاتی گەورک تا ساڵی

١٣١٥ شەڕی حەمەڕەشیدخان بەشی سەقز بوون. دواتر دران بە سەردەشت و مەهاباد. تا ساڵی ١٣٦٨ لە باری کاروباری ئیدارەییەوە دران بە بۆکان ئێستا بۆکان بە سەریان ڕادەگا بە نێوی گەورکی موکری دەناسرێن. ساردەکۆسان لە ئەسڵدا ساردەکوێستان بووە دەورووبەری شاخ و کوێستان و بەفرگیرە وا وێ دەچێ لە زوودا کەسێک یا چەند کەس لە هەوار بووبێ جا چ بە هەواری یا ڕێبواری لەوێڕا هاتبێتەوە دامێنی، کوتبێتی کوێستان سارده ئیتر بۆ دانیشتن و حاوانەوە نابێ ئێره بە کەڵک دێ سارده کوێستان. ئەوجار دێیەکەیان ئاوا نێو نابێ بە ساردەکوێستان. دێیەکی بەررۆژ و خۆش و ساحەب ڕزق و سایە چەوره، هەر لە قەدیمەوە خەڵکێکی دەست و دڵ ئاواڵە و دەرگا کراوه و سفره بڵاوی لێ بووه، بۆ نوێژ و تاعەت و خێر و خێرات چ لە کاتی جێژنەکاندا چ لە کاتی بەڵاو دڵتەنگیدا ویردی زمان و نموونەی چاولێکەری دێهاتی



دەورووبەر بوون. دەگەڵ خەڵکی زاواکێو قەدیمەکانیان دەچنەوە سەر یەک ڕیشە و ڕەگەز. لە سلسلە و زنجیرەدا پێیان دەڵێن **«پێتاوشڕە»** عادەتیان وایە ئەگەر بۆخۆیان شەڕیان بێ نێوانیان ناخۆش بێ تیغ لە یەک بسوون و سەنگەر لێک بگرن. کەسێکی دیکە دەستیان بۆ بەرێ یان بەڵایەکیان بۆ بێتە پێشێ گیر و گرفتیان بۆ ساز بێ دووژمنی و نێوان ناخۆشی خۆیان وەلا دەنێن هەموو دەرد و بەڵا و ڕووداو ئی هەمووانە و شانی وەبەر دەدەن. ئەو دوو دێیە بە نێوی پێتاو شڕە ئاوان. دەتوانم بە ڕاشکاوییەوە بڵێم هەستی هاوکاری و هاودەردی و خۆشی و ناخۆشی بوون و نەبوونی هەر کام بە ئی خۆ دەزانن خەسڵەتێکی جوانی کوردانە لە نێو ئەواندا هەر ماوە کە هاودەردی پێکەوە بوون و ئاوڕ لێکدانەوە لە کاتی تەنگانەدا. ئەوەی لە شاریشە هەر وان. ساردەکوێستان پیاوی ڕەشید و زانای زۆر لێ بووە و هەیەتی و شوێنەواری مێژوویشی لێ هەیە کارو کاسپی زۆرتر ئاژەڵداری و کار و کاروانە چونکە زەوی و زاری کشت و کاڵی کەمترە. مزگەوتی چاک و مامۆستای ئایینی و جومعە و جەماعەتی هەر بووە و هەیەتی. خەڵکەکەی کەمتر بڵاو دەبن و دەڕۆن بۆ هەندەران ئەوی لە مالێش جودا دەبێتەوە هەر لەوێ ماڵ دروست دەکا و دادەنیشێ. بە بەشە گۆشت ٧٥-٨٠ ماڵە بە ئیستلاحی ئەوێ هەمووی سەر و قوون خزم و قەومن. کوێستان و جێگای هەوار و چیغ و چادر و مەڕ و حەوشە و سەیر و سەیاحەتیان و بەرو بێر و کۆز و بێرییان مەزرا و گیادروو، کۆدە و گزرەجاڕ و لەوەڕگا و مەندێ و بەرڕۆژ و دەست

هەڵقەن، قووڵەمەندێ، زەوی و گەنم و دەغڵ و دان و بەر و بێستان و سێبەر و ئاو و ڕێگا و بان و کانی و ئاو و جۆگە و چۆم و دار و بار و نزار و لێڕەوار و قۆپی و قۆرغ و هەمووی ئەوانە ئەو جێگایانەن: مێزەگا، بەردەهەڵۆ، کانی پۆڵا، هەواری مەنسووری، شاخی قەڵات، دۆڵی بەردە قەلی، شارەزووریێ، خورما ورچان، بێگەورە، پیر خەجیجە، شێخ ڕەش، کێلەشین، خرێ بازە، هەوار قوڕاوی، سێ چاکان و چۆمی ڕەسووڵ مەولان، چۆمی سێ چاکان هەمووی ئەوانە جێگایەکی خۆش و زەنوێر و لە گیای کوێستاندا دەوڵەمەندە.



**دەراوی بەردەهەڵۆ خورما ورچان**

هەر گەشتیارێک و ڕێبوارێک دەحەسێنێتەوە و سرنجی بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و زۆر بە هێمنی لەشی ئارام دەگرێ و بەشی خۆشی دێنێتەوە لەو بەشە خودا پێداوە. قەبرستانی ساردەکوێستان لە جێگایەکە کە پێی دەڵێن سێ چاکان پیاوی چاک و بە دین و لە خودا نزیک و لە دونیا دووری زۆر لێیە. خوداوەند وەبەر سێبەری ڕەحمەتی

خۆیان بدا ئیشاڵڵا. قەبرستانی سێ چاکان و پەڵە دارەکەی لە هیچ کۆێ دیاری و باسی نەکراوە بۆ وای پێدەڵێن. نزار و دارستانێکی زۆر پڕ و دوور و درێژە هەمووی خۆڕستە مەگەر پۆلێک گوێز نەبێ کە ئەویش بە گوێزی مەلا حەسەن مەشهوورە و بە ناوبانگە ئەو ناشتوویەتی. هەموو میوەیەکی تێدایە و تا بەرماڵی زاواکێو ڕۆیشتووە و لە بەحسی زاواکێودا باسم کردووە. ئەمن دەگەڵ زۆر کەسان باسم کردووە سێ ساڵیش کە بۆخۆم لە زاواکێو بووم زۆر چووم و دەگەڵ مامۆستا مەلا کەریمی عەزیزنژاد «ڕاوچی» زۆرمان ڕاوەکەو لێ کردووە و بنەمان داناوە و زۆرم لە بەر و بووی ئەو دار و دارستانە خواردووە و بردۆتەوە هەر کوتراوە سێ چاکان و بەس. دەگەڵ مامۆستا مەلا عەلی دارەگردەڵە کە دوای مامۆستا ڕاوچی پێشنوێژی ساردەکوێستان بوو و کاک عەوڵای حەسەنزادە کە لە بنەماڵەی مامۆستا ڕاوچییە و کوڕی برا گەورەی ئەوە بۆخۆی پیاوێکی زۆر تێگەیشتوو و ڕاست و شاعیرە. هەر دووک زانا و بە هەستن شارەزایی تەواویان لەو مەڵبەندە هەیە.

هەموو پێیان وایە بۆیە پێی‌دەڵێن سێ‌چاکان چونکە ئەو دەوروبەرە سێ جێگای پیرۆزی لێ هەیە کە جێگای ڕێز و حورمەتی خەڵکی ناوچە بوون ١- پیر خەجیجە ٢- کێلەشین کە زەوی و زاری بنەماڵەی مەرحوومی خەلیفە مەلا حەسەنە ٣- سێ چاکان چونکە ئەو سیانە لێک نزیکن پێیان دەڵێن سێ چاکان. ئەو سێ‌چاکە دەڕواننە یەکتر و ئەگەر واش نەبێ سەیر نییە چونکە بۆچوونی ئێمە عەقڵی بوو نەک نەقڵی. مەبەستێکی دیکەش کە بۆ پێی‌دەڵێن سێ‌چاکان ئەوە وەک ڕاست

دەچیَ لە کەناری ڕێگایەکەوە کە لە زاواکێوەوە دێی سیَ قەبری لیَ هەیە یەکیان کێلەکەی چووەتە نێو دارێکی گەورە لەو دارە نزارەی کە لەوێن ئەو ٣ قەبرە قسە و باسیان زۆر لە پشتە کە نووریان لەسەر هەستاون یان باباغای قەدیم گۆڵیَ لە زیندانددا خەونی پێوە دیون و هەموو ساڵێکی هاتۆتە کنیان لە دیوی سەردەشتەوە و زۆر شتی دیکە. کە لەویَ شەهید بوون و ئەسحابە بوون. جا لەبەر ئەو سیَ قەبرە پێی دەڵێن سیَچاکان.




**بەندەنی لوێجاران، گوێزی خەلیفە مەلا حەسەن و سیَچاکان**

هێندێک وەکوو مەلا سەدیق عەزیزنژاد دەڵێن ئەوانە سحابەن. ئەوەش نێوەکەیانە ١- شێخ زەینەڵ٢- شێخ زاهید ٣- شێخ زەڕاڕە. ئەوانە بە غەریبی هاتوونە ئەویَ و لەویَ شەهید بوون لەو کاتەوە ئەو قەبرستان و نزارە حورمەتی لیَ گیراوە و نێوی سیَچاکانی بۆ داندراوە.




**پاش چاکانی ساردەکوێستان**

ساردەکوێستان عالم و شاعیر و پیاوی زانا و کەیخودای چاکی زۆر لێ بووە و هەیە. ١. بنەماڵەی مامۆستا مەلا حەسەن سەیادی ناسراو بە خەلیفە مەلا حەسەن هەموویان زانا و شاعیر و قسە خۆش و ڕاوچی و سفرەبڵاو بوون؛ خەلیفە مەلا حەسەن پیاوێکی زانا و شاعیر و میوانگر و جێگای ڕێز و حورمەتی خەڵکی ناوچە بووە، ئەو چەند شیعرە کە لە سروەی شمارە ٨٨ دەرم هێناوە لە نووسینی بەڕێز کاک کاوەی نەوەی.

**شیعرێک لە مامۆستا سەییادی:**

دایـــم لـــە دڵـــم جێژنـــە بـــە ئومێـــدی ویســـاڵی
خوشـنوود و سـەرئەفرازە لەبـەر فیکـرەت و خـاڵی
ماڵێکــە هــەموو دەیکەمــە قوربــانی بــە جــارێ
بــا بێتــە بــەڵاگێڕی دوو چــاوی دە غــەزاڵی
دەیســا،لە خــودا مەرحەمــەتی مەقســەدی حاســڵ

خـــەرمانی غـــەمم مەعتەلـــە بـــێ بـــایی شـــەماڵی
بینێـــــرە هــــــەتا کـــــاکوڵی مشـــــکین ببزێـــــوێ
زاهیـر بـێ ژێـر زولفـی لـی سـیاه ت خـەت وخـاڵی
سـەد نـاوی خـوا ئـەورۆ لـە نێـو پـۆلی قەشـەنگان
تەکمیلـــە قـــەد و ســـوورەت و مـــەعنایی کـــەماڵی
«سـەییادی»مەگـەر دەفتـەری عیشـقی وی دەخـوێنی
وا زیکـــری زوبانـــە بۆتـــە تەســـــریفی جـــەماڵی

مامۆسـتا مـەلا حـەسـەنی سـەییادی سـێ کوڕی بـووە بـە گـوێرەی عومر: ١. محەممەد حەسـەنزادە ناسـراو بـە حـەمـە مـەلا کـە بـە ڕاسـتی پیـاوێکی قسـە خـۆش و جـەفـەنگی و لـە هـەر جێگایـەک بایـە کۆڕەکـەی وەسـەر خـۆی دەگێـڕا، غـەم و تـەمی لـە خـەڵک دەڕەوانـد و بـە قسـەی مەجلیسی بزەی لە لێوی هەمووان پەیدا دەکرد. نان بدە و ڕاوچی چـاک و دەگـەڵ نـەخوێنـدەواری کـەلیمـاتی وای دەکـوت لـە شـیعر نـەدەمـاوە جارێک مامۆستا مەلا کەریم برای نەخۆشی دەبێ لە تاوان ئاور دەگرێ و دەڵێ: «بێ گەورە و خرێ مـاڵان دەڕواننـە پـەشـم و خـاڵان بۆچی وا بێخەبەرن لە ڕفیق و هـەواڵان.» بێ گەورە و خرێ ماڵان و لـە شـوێنی خۆش و زەنوێرن کە مامۆستا ڕاوچی و حەمە مەلا بۆ ڕاوەکـەوی زۆر چوونە ئەوێ و بنەیان داناوە. جارێک یەکێک لـە خزمـەکانی کـە کـچ بـە شوو دەدا خەمی دەبێ و دەگری بۆی، حـەمـە مـەلاش کـە وەک کوتمـان زۆر قسە خۆش بووە دەڵـێ پـوورێ مـەگری، مـەگری ئـاوا **بڵـێ «هـەی دەستار دەستار، دەستارم شکیا/ هاڕەی لەرزانە لە ماڵـەم بڕیـا»**. ئیتـر پوورێ وەپێکەنین دەکەوێ و غەمـەکـەی دەڕوێ. کاکـە حـەمـە لـە سـاڵی

١٣٧٩ ماڵ ئاوایی لە ژیان کردووە و لە گۆڕستانی میراوای تازە بە خاک ئەسپێردراوە قەبری پڕ بێ لە نوور ئیشاڵڵا. کاکە حەمە چەند کوڕی لە دوا بەجێ ماوە کوڕی گەورەی بە نێوی عەبدوڵای حەسەنزادە کە زۆرتر بە کاکە عەوڵای بانگ دەکەن دەگەڵ ئەوەی نەچۆتە حوجرە و قوتابخانە بە هۆی تەنگدەستی و کەم و کەسری بنەماڵەکەی، مەگەر کەلاسی گەورەساڵان«ئەکابیر». بەڵام هەستێکی خاوێن و زمانێکی زۆر پاراو بیرێکی زۆر وردی لە شیعر کوتندا هەیە ئەوە چەند شیعر کە لێم وەرگرتووە دەینووسم.




**چۆمی سارده کوێستان و زاواکێو**

**چەند شیعر لە کاک عەبدوڵڵا حەسەنزادە:**

لەوێ ڕۆژێوە تەندرا تار و پوودم
بە غەیرەز غەم نەبوو دەسکەوت وسوودم
بە غەیرەز ڕەنجەڕۆیی و مەینەت و دەرد
چیدی لێ شین نەبوو وەرزی وجوودم

❊❊❊

ئەگەر مردم وەسیێتم وایە خزمان
لە بەرزاییم بنێژن نەک لە نزمان
ئیوا هەن هێند نزم بوون بۆ مەزەی ژین
هەتا مەئمووری خوایان لێ عەجز مان

❊❊❊❊

کەسێ بێ بووکی ئیلهامم بۆ بانگ کا
دەسم بگرێ وشەم بۆ دەست نیشان کا
لە دایک بوونی شیعرێکم خەیاڵە
کە جوانی دیمەنی تۆم بۆ بەیان کا



**مەلا کەریم ساردەکوێستان**

**شیعرێک لە مامۆستا ڕاوچی:**

خـــــەڵکی تــــەلان و تــــەرت و ســــوێم
خونچــــــەی نــــــەدێراوم لــــــە دێــــــم
شــــەرت و مــــــەرجم تێــــک ناشـــکێ
تــوێ تـــوێ کـــرێم بـــۆ کـــورد دەدوێـــم

٢. دووهەمین کوڕی خەلیفە مەلا حەسەن (سەییادی) مامۆستا مەلا کەریم عەزیزنژاد ناسراو بە مامۆستا ڕاوچی مامۆستا مەلا کەریم دەگەڵ ئەوەی بڕوانامەی پێشنوێژی و ئایینی وەرگرتبوو لە فارسیشدا خەتێکی جوان و دەست و بردێکی تەواوی هەبوو و لە نووسین و زانین زمانی کوردیدا لە سەفی پێشەوەی نووسەران و زانایانی زمانی کوردیدا بوو دیارە بۆ زیاتر ناسینی مامۆستا ڕاوچی بچنە سەر کتێبەکەی بە نێوی بزەی شۆڕش کە کاک کاوەی کوڕی بەڕێزی بە چاپی گەیاندووە. مامۆستا ڕاوچی زۆر پیاوێکی نان بدە و قسە خۆش

و مەجلیس خۆش و نەترس و ڕەشید بوو ئەوە چەند شیعر لە شیعرەکانی مامۆستا ڕاوچی لەسەر سێ چاکان(قەبران):

بۆ سڵاوێکی لە خێڵی چاکان
دڵە سەر ڕێ کەوە بۆ سێ چاکان
چاکە هەر چاکە بە چاکی بدوێ
خاوەنی چاکە بە بێ خەم دەنوێ
چاو ببارێنە لەسەر گڵکۆیان
وردە فرمێسکی هەنیسک و ڕۆیان
سەردەمی دەم بە بزە و بریا بوون
نەبەز و دەس بە چەک و وریا بوون
چەکمە زێڕ و بە خوڕ و ڕووگەش بوون
خاوەنی ماف و تەلار و بەش بوون

**دووبارە مامۆستا ڕاوچی و سێ چاکان:**

دڵە دووبارە لە خەم دڵپڕ بە
چاو بە فرمێسکەوە گێژ و وڕ بە
با لەسەر گۆڕی گەشی پسپۆڕی
ببە فرمێسکی شەمی سەر گۆڕی
با لە سای وارشی گۆڕی بابم
شەمی بێ پیوی کوژاوی بابم

ئەشـــک و گـــڵ پێکـــەوە بـــا تێکـــەڵ بـــن
ژیلـــــەمۆی کۆنـــــەبرینان هـــــەڵ بـــــن
لێــــرە بـــن گـــڵ بـــووە «ســـەییادی» پیـــر
لێـــــرە بـــێ دڵ بـــــووە دڵـــــداری ژیـــــر
بـــا لەســـــەر گـــــۆڕی «خەلیفـــەی ســـانی»
«ســـــانی ئیســـــنەینی» خـــــەتی ســـــوبحانی
بارەگـــــای پیـــــری «قەلەنـــــدەر» شـــــێوە
ڕووگـــــە بـــــۆ نـــــاز و نـــــزای ئـــــەو نێـــــوە
هـــــــەڵوەرێ تـــــــــاوەکولّی چـــــــــاوانم
تـــــەڕ بکـــــا ئەشـــــکی ڕەجـــــا دامـــــانم

به داخەوە لە ساڵی ١٣٨٠ لە گوندی دەروێشان کۆچی دوایی کرد و لە نێو غەم و ماتەمی هەمووماندا لە قەبرستانی میراوا لە پەنا کاکە حەمەی برای بە خاک ئەسپێردرا بەهەشتی بەرین جێگای بێ ئینشاڵڵا.

٣. سێهەمین کوڕی مەرحوومی خەلیفە مەلا حەسەن کاک مەلا سەدیقە ئەویش تا ڕادەیەک باسەواد و زانایە و ماوەیەکیش لە ساردەکوێستان ئەرکی پێش‌نوێژی بە ملەوە بوو تا دواتر هاتۆتە بۆکان کاری ئازاد و کورەخانە دەکا. پیاوێکی قسە خۆش و ڕاست و نان بدەو و ڕاوچی چاک و پاک و ئەمین بوو. شوکر ماوە و لە حاڵی حەیات‌دایە. ئەوە بوو بە کورتی بنەماڵەی مامۆستا سەییادی و ڕاوچی. دیارە وەک لە بەرەوە باسمان کرد ساردەکوێستان جیا لە بنەماڵەی مامۆستا ڕاوچی زۆری دیکەی باسەواد و مامۆستای ئایینی تێدا هەن کە خەڵکی

ئەوێن و لە هەندەران خزمەت دەکەن و بە ئەرکی پیرۆزی ئایینی مەشغوولن ئەوانە لە خزمەت مامۆستا مەلا عەبدوڵلای قەدیم و مامۆستا مەلا عەلی دارەگردەڵە خوێندنی قورعان و کتێبە سەرەتایەکانیان خوێندووە. دواتر ڕۆیشتوون بۆ حوجرەی دێهات و شار تێکۆشاون بۆ فێر بوون و زانین تا بە پلەی زانست گەیشتوون، دوای کەسبی فەیز و دەرس خوێندن لە خزمەت مامۆستای زۆر باش و زانا و گەیشتن بە پلەی بەرزی مامۆستای ئایینی وەرگرتنی بڕوانامەی (ئیجازەنامە)ی مەلایەتی ئێستا هەر یەک لە جێیەک و شوێنێک خەریکی بەڕێوە بردنی ئەرکی دینی و خزمەتن.

دیارە هێندێکیش لەو بەڕێزانە ڕچە و ڕەوشتی وڵاتی کوێستانیان وەلا نەناوە هەستی نووسین و شیعریان هەیە زۆر شارەزان لەو بوارەدا و بەرهەمی جوانیشیان لەو بارەوە هەیە و لە باری نووسینەوە خۆ بە خەڵکی چڕ و چیا و هەرد و بەرد و زەرد و سەخت و لەند و ڕەوەند و ڕاوەند و نێو کوێستان و گیا و گژ و کەژ و گوڵ و گڵ و دەر و دۆڵ و لاپاڵ،و تەرت و تەلان نێو وەنەوشە و سوێسنە و هەڵاڵە و ئاوهەڵدێر و لادێر و چۆم و جۆگە و زناو و زەلاو و زۆنگای ساردەکوێستان دەزانن چون لەوێ ژەک دراون ڕا هێندراون فرچکیان گرتووە و پێیان گرتووە فێر بوون و تێر بوون تا تەواو بوون و بڵاو بوون. لە ئەرکی خۆیان زۆر سەرکەوتوو بوون شوکر بۆ خودا. ئەو بەڕێزانە ئەوانەن:

١- مەلا ئیبراهیم هەمزە پوور کوڕی کاک ڕەسووڵ

٢- مەلا نەجمەدینی خزری کوڕی کاک محەممەد

٣- مەلا سولەیمانی عەزیز تەبار کوڕی کاک حەسەن

٤- مەلا عومەری محەممەدزادە کوڕی کاک خدر

٥- مەلا عەبدوڵڵای ڕەسووڵیان کوڕی کاک ئەحمەد
٦- مەلا محەممەدی قادریان کوڕی کاک عەبدوڵڵا
٧- مەلا ڕەحمانی ڕەسووڵیان کوڕی کاک سەلام
٨- مەلا ئەسعەدی پوورکەریمی کوڕی کاک ڕەحیم
٩- مەلا هەژاری مەحموودی کوڕی کاک خدر



**دەراوی باغی کوێستانی سارده کوێستان**

**ئەوە چەند شیعر لە شیعرەکانی کاک مەلا ئیبراهیم هەمزەپوور:**

کوردم خەڵکی کوردستان — خەڵکی دێی ساردەکۆسان
گەورکیم و دێهاتی — شەرمە لەگەڵ نەهاتی
کوڕی شاخ و تەلانم — دەنگ و ڕەنگی مەلانم
لە کوێستانێکی دوورا — لە نێو سوێسنە و چنوورا
لەسەر مێرگ و چیمەنا — چاو لە جوانی دیمەنا
لە باوەشی شەشپەڕا — لەبەر سایەی دێبەرا
پەروەردەی نێو گوڵ و گیا — یەک ڕەنگ نیمە درۆ و ڕیا

لـــــه گونـــــدێکی ڕەنگینــــا    لــــه نێـــو دیـــن و ئایینــــا
دەژیـــم بـــه خـــۆم دەنــــازم    خۆزگـــه بـــه کـــەس نـــاخوازم

ئەوە بوو بە کورتی باسی گوندی ساردەکوێستان یەکێک لە دێهاتی گەورکی موکرییە و دێیەک لەو پێنج دێیەی دۆڵێیە.

**ئەوەش چەند شیعر لە شیعرەکانی مەلا محەممەدی قادریان:**

بـەژن و بـاڵای داری سیدرە سـەیرە سـێوی پێوەیـە
هـــەم دزیـــن و هـــەم ڕنینـــی ڕاونرانـــی پێوەیـــە
خـەڵکی سـەرگـەرمن لـە بـازاڕ قـاڵ و قیلن بۆ تمـەن
دڵ لـــە بـــازاری ئـــەوینـــت پـــێ بـــە داوی شـــێوەیە
ئـەو دڵانـەی بێ ئـەویـن چـەن قـاقڕ و بـێ حاسـڵن
لێـوی ئـاڵ و کـوڵمی سـوورە سـەد بـەهـاری پێوەیـە
ســاڵهایە مــن دەکێشــم نــازی عیشــقت چــاوەکــەم
ئـەو دەڵـێ مـردن خـەڵاتـە بـۆ ڕنـین ئـەو سـێوەیە
پڕ بە چاوان گەر بە چاوان چاو بڕیتە چاوەکەی
شــا دەکــا شــێت و شــێتی شــێتییە بــەو شــێوەیە
دادگا بۆ کاری خەڵکە وەرگری حەق حەقخوراو
حــەققــی مــن ئــامێزی گــەرمــە داخرانــی پێوەیــە
خۆشـی دونیا کاڵ و کرچە بێ ئـەتۆ قـەت نامـەوێ

چاوەکانت شەڕ فرۆشن مەیکە شەڕ بەو شێوەیە
دوێکە دڵ گرتی گڕوو لێم زۆر سەیر چەشنی مناڵ
من نەچووم ئەو ڕۆی بە تەنیا وا ئەڵێن لەو کێوەیە
دێم و ڕێ دەبڕم هەتاکوو بچمە سۆگەی هەڵفڕین
خۆ مەبەستم ڕوونە ئێستا گەستنی ئەو لێوەیە

# برایم خەسار و بیست و یەکەڵەی بەهار



برایمخەسار و مووسێ لە ناوچەی گەورکی موکری لە پێشدا سەر بە شاری مەهاباد و سەردەشت بوون لە ساڵی ١٣٦٨ بوونەتە بەشی بۆکان.

**برایمخـــەســـار:** دێیـەکی کوێستان و بژوێن و سـەر بـە ڕۆژی و سیایەچەورە و بە بەشە گۆشت نزیک بە چل ماڵە، لە بەرپاڵی کێوی گەورەی کەپری و مەیدان چوغە دروست کراوە جێگایەکی بەرڕۆژ و کڕاڵ و بە ئاگر و کزرانە. برایم خەسار لە بەینی سێ کوێستانی باسەفا و دیدەنیدا هەڵکەوتووە ١. سێوە سوورە کە جێگا هەواری خەزاڵی مەلا

نەبیانە کە لە بەهاراندا زۆر لە گەشتیارانی شار و دێ بۆ دیتنی ئەو کوێستان و جێگایانە وەکوو گۆمێ و سێوەسوورە دێن قەبری لاس و خەزاڵیش هەر لەوێیە دیارە بەیتی لاس و خەزاڵ بەیتێکی فولکلۆری کۆنی کوردەوارییە زۆرێک لە بەیتبێژان و وێژەوانانی کوردی کۆڕ و مەجلیسیان پێ گەرم دادێنا و خەڵکیان دڵخۆش دەکرد و بەڕێز خودا لێخۆشبوو مامۆستا مەلا کەریمی فیدایی ئەوەندەی دیکەی پێز و تام و چێژ داوە بەو بەیتە لەسەری نووسیوە و ڕوونی کردۆتەوە لە پەنا جێ تاوڵی خەزاڵێ کانییەکی لێ هەیە بە نێوی کانییە بەردینە کە جێگای مەڕ لە بێردانی خەزاڵێ بووە و لە نزیک ئەوێش کانییە سەرچاوەی کوێستانی شاڵەبەگی لێیە



**سێوەسوورە و جێهەواری خەزاڵ**

کە بە کانییەکوێستانیماڵە مەلا نەبیان مەنشوورە. ٢. پشت ماڵی برایمخەساری کێوێکی بڵیندی لێ هەیە کە بە شاخە سوورە بەناوبانگە یەکێک لەو سێ لووتکە بڵیندانەی سێکۆیە کە کوێستانێکی خۆش و

دەوڵەمەند و دیدەنییە دۆڵی سیٚکۆ کویٚستانیٚکی تێر و پڕە زۆر باسەفا و دیدەنییە هەموو گیایەکی کویٚستانی لیٚ هەیە بە تایبەت (گیاسالمە) کە گیاییەکی قیمەتیە فارس پیٚی دەڵیٚ سەعلەب، کیلۆی تا ١٢٠ هەزار تمەن دەفرۆشریٚ ئەویش دوو بەشە گردە و پەنجەی هەیە.



**چاوەی ئاویٚ**

٣. داویٚنی سیٚکۆ لووتکەی بڵیندی لیٚ هەیە بە نیٚوی دەراوی شیٚخ مەحموود دەچیٚتەوە سەر کانی ئاودەڵەومەران. لە داویٚنی ئەودا کانییەکی لیٚیە بە نیٚوی کانییە مرادان ئەویش بە کانییە خەزاڵیٚ مەنشووورە. کانی ئاو دەلە و مەران زۆری زەوی و زاری زاواکیٚو، ساردەکویٚستان، ئەو چۆمە بۆ خواریٚ پاراو دەکا و یەکیٚک لە سەرچاوەی چۆمی زەنبیل و بۆکان و سیمینەیە ئەویٚش جیٚگای چیٚشتەنگاو و پاڵیٚنی مەڕی خەزاڵیٚ بووە و لە پەنا چلپلەی عومانیٚیە کە هەر لە بەیتی لاس و خەزاڵدا باسی کراوە و ویٚژەوانان کوتوویانە لەو بەرەوبەری ئەو باسکانە تا دیار و نەدیاری تا زەرد و هەردی سەریٚ

داری تیرووی لێ هەیە ئەویش دارێکی سپی و گەڵاشین و کەمێک بڵیندە بە قەد بەڵاڵووکە کێویلە یا شیلان دەبێ. ئەویش تایبەتمەندی دەردی بالووکەی هەیە، دەڵێن هەر کەس بالووکەی پێوە بێ بچێ ئەو دارە بادا بەڵام بەغەیرەز نێوی خودا ئیتر قسە نەکا، ئاوڕ نەداتەوە توولێک لەو دارە بادا ویشک دەبێ و هەر ئەوەی کە ئەو ویشک بوو بالووکەش ویشک دەبێ و هەڵدەوەرێ. لووتکەی دیکەی سێکۆ لە پەنا کەپرێ کە وڵاتی ئالان و چۆمانی لێ دیارە.



**بەڵاڵووکە کێویلە و داری تیروو**

**مووسێ**: مووسێ دێیەکی کوێستان و خاوەن ئاو و مەرتع و لەوەڕگەیە لەسەر سەرچاوەی زۆر ڕوون و سووکی کانێیە قوڵقوڵانە لە پەنا کێوەڕەشی بە ناوبانگی مووسێیە کە کێوەڕەش چەند قسەی لە پشتە ١. دەڵێن لەسەر دوند و لووتکەی ئەو کێوە بۆنێکی زۆر خۆشی لێدێ لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا گوایە دەڵێن داری مێخەکی لێ هەیە،



**کانیێ مرادان نزیک چلپلەی عومانێ**

بەڵام زۆریش گەڕاون تا ئێستا کەس نەیدیوەتەوە زۆر بڵیندە و بە کێوی کەللەقەندی مەنشوورە. ٢. لە داوێنی ئەو کێوە جێگایەکی لێ هەیە بە نێوی کوونەپێستێ یا ئەشکەوتی پەنیران کە زۆر قووڵ و دوور و درێژە ئەو دێهاتەی دەور و بەر هەموویان لە بەهاراندا پەنیری پێستە و تەنەکە ڕۆنی زەنگ و جاری وابوو دیزە و هەنبانە گۆشتی قاورمەیان بردۆتە ئەو جێگایە تا سیخوار و زوقمی پاییزێ نەکەوتووە نەیان هێناوەتەوە. جا هەر کەس هاتۆ ئی خۆی بردۆتەوە کەسێک چاوەدێری کردووە پێیان کوتووە پێستەوان، ئەشکەوتەوان و پەنیرەوان. زۆرتر لەوێدا بنەماڵەی سۆفی سەدیق ئاگاداری و چاوەدێری ئەو جێگایەیان کردووە کە خوداڵێخۆشبوو بەڕێز مامۆستا هەژار لە چێشتی مجێوردا باسی ئەو بنەماڵەیە دەکا و دەڵێ شەوێ لە مووسێ لە ماڵە ئەوان میوان بووم و ناشتایەش بە ڕێگای زەردەگڵیدا ئاوای ئەودیوی ناوچەی بانە بووم. دێی مووسێ ئەو کوێستانە خۆشانەی لێ هەیە: پەڵەدار کە هەموو میوە و جۆرە گوێژێکی لێ هەیە.






**پەڵەداری مووسێ**

**وەکوو ئەو گۆیژانە:** گۆیژە زەردە، سپی، کوڕکوژە، گۆیژە سوورە، گـۆیژە ڕەشبـاڵا، گـۆیژە هـەویـرە، گـۆیژە ڕیخنـە. ئـەوەش **بـەشـە گـوێزەکـانی:** گـوێزی ئـازا، گـوێزە کوێرە. **بـەشـەکـانی هـەرمـێ** وەکوو هـەرمێ کرووزی، هـەرمێ کێویلە و هـەرمێ تفتە. و **بەشـەداری نزار** وەکـوو داری بـەڕوو، داری وێـوڵ، داری شـەکـی، داری مـازوودار و

کوێستانی شاخی قۆری، هەوار خیزۆک، چنگمەڕنە، ناوەڕەشان، زەردەگڵ.



**داری بەڕوو**

**ڕۆژانێکی دیکە** کە زۆر دەوڵەمەند و مەڕدار لێ ترساوە و حیسابی بۆ کردووە بیست و یەکەڵەی بەهارە بە قسەی ڕابردووەکان ئێمە سێ شەشی بەهاریمان هەیە کە دەبێتە ١٨ ڕۆژ ئەو هەر با و بارانە ڕۆژی ١٩ بورجی وشتری پیرێژنە، ڕۆژی ٢٠ بەهار ئەوەش نێویان ناوە ڕەشەبای بەهار ڕۆژی ٢١کەڵەی بەهارە، خەڵکی کوێستانی لە ڕابردوودا هەتا ٢١ ڕۆژ لە بەهار نەڕۆیشتبێ دەڵێ نەحەساوەتەوە لە بێ تفاقی و قڕکردنی مەڕەکەی هەر ترساوە.



« وشتری پیرێژن»

جا خەڵک بۆ ئەوە ئاوا دەڵێن: «بیست و یەکەڵەی بەهاریێ، بباریێ هەتا گویێ داریێ نامێنێ تاکو ئێواریێ» یان کوتوویانە: «بیست و یەکەڵەی بەهاریێ بەفر زۆریش بباریێ، دەتوێتەوە بۆ ئێواریێ». لە ناوچەی گەورکی موکری سەر بە شاری بۆکان دوو گۆندی لیێ هەیە بەنێوی برایم خەسارو موسیێ دروست بوونی ئەو دێیانە وەک قەدیمێکان دەگێڕنەوە ئاوا بووە: برایم و موسا برا بوون وماڵیان لەو دێیە بووە هەردووک مەڕدار و دەوڵەمەند بوون چونکە جێگایەکی کوێستان و بژوینە لە پەنا کوێستانی مەیدان چوغە و لە تەنیشت سێوەسووورە، جێگا هەواری خەزاڵی مەلا نەبیان قارەمانی بەیتی فولکلۆری کوردی بە نێوی بەیتی لاس و خەزاڵ کە هەر قەبرەکەشیان لەوێیە.



**«چۆمی برایم خەسار»**

موسـا کچێکـی زۆر جـوان و چـالاک و سـەرنـاس و کابـانی دەوڵەمەندی دەبێ، برایمیش کوڕێکی جوان و کاسبکاری دەبێ، زۆرجار بـرایم داوای کچـی موسـا دەکـا بـۆ کـوڕەکـەی، کچـە شـووی پـێ ناکـا. زستان بەسەردا دێ بەفرێکی قورس دەبارێ ڕێگا و بـان دەگیـرێ مـەڕ دەکـەوێ و لـە ژوورێ دەکـرێ تـا ماوەیـەکـی زۆر نـاڕوا. جێگـای بـاس کردنە لە وڵاتـی کوێستان هـەر تۆزێک عـەرز بـەدەرەوە بێ مـەڕ دەڕوا چونکـە پـووش زۆرە، هـەر بچێتـە کێـوی سـەرێـک بـڕوا و دەمێک لـە عـەرزیـدا بـەشـی خـۆی پەیـدا دەکـا کاتێـک مـەڕ ئـەوەنـدە لـە ژوورێ و لەسەر دانگە دەبێ ئیتر قۆری و کادێن ڕوو بە تەواو بوونە هەر جۆرێ خەڵک دەکەوێتە بەهارێ بەڵام مەڕ ئەوەندە لـە ژوورێ و لـەسـەر دانگە دەبێ هێنـدێک مـاڵ تفاقیـان تـەواو دەبـێ دەکـەونـە بـەهـارێ، بیسـت و یەکەڵەی بەهارێ دێ نوایەک بەفر دەبارێ، موسا قۆری و کادێنی تەواو بووە زۆر نارەحەت دەبێ. مەڕەکەشی لە ژوورێدایە هەڵدەستێ دەچێ بۆ لای برایم و پێی دەڵێ برالا ئـەمن و تـۆ براین ئـەمـن لێم قـەومـاوە

مەڕەکەم ئەوە قڕ دەکا لە ژووریدا. یان بە هیمەت یان بە قیمەت بڕێکم تفاق دەیە تو قۆریەکانت تازە نیوە بووە هاوین دەتدەمەوە برایمیش کە براگەورە دەبێ و پێی دەڵێ وەڵڵا نە تفاقت پێ دەفرۆشم نە دەتدەمێ بە گۆڕینەوە. موسا دێتەوە ماڵێ و زۆر ناڕەحەت دەبێ کچەکەی کە زۆر کابان و سەرناس دەبێ دەڵێ بابە هەستە با پێکەوە بچینە لای مامم لە تاوی بابی ئاور دەگری. دەچن بۆ لای مامی دەڵێ مامە بەفر لە عەرز کەوتووە دوونە هاتۆتەوە، خۆ دەرەتان نیە و ڕێگا و بان گیراوە جێگا قۆریم گەسک داوە هیچیان نەماوە بابیشم زۆر ناڕەحەتە ئیتر بۆخۆم هاتووم چ دەڵێی حازرم مەڕ دەڵێی دەت دەینێ، دەنا ئامادەم بە پێی خۆم هاتووم شوو بە کوڕەکەت دەکەم و دەبمە بووکت، ئیتر برایم دەڵێ نە تقاقو دەدەمێ، نە ئەتۆشم دەوێ بە ڕێی خۆتاندا بڕۆنەوە هەڵدەستن بە ناهومێدی دێنەوە، بابی نازی دیارە وەک قەدیمێکان کوتوویانە ئەو کچەی دەبێ نێوی نازی بوو، بابی زۆر غەمبار دەبێ تا سێجار دەچنە کنی نایان داتێ ئەوجار نازی دڵخۆشی بابی دەداتەوە و دەڵێ



بابە جارێ شەوە تا ئێستاش مەڕەکەمان لێی لار نەبۆتەوە با ڕۆژەوە بێ، خودا گەورەیە تەنگانە بەریان کورتە تا دەروێک دەبەستی سەد دەروان دەکاتەوە هەر کە بەیانی شەبەق دەدا کچە هەڵکێش لە پێ دەکا دەست دەداتە تەور و داس، مەڕی لە ئاغەڵێ دەردەکا ڕچەی بۆ دەشکێنێ نێریکێشی دەکا بۆ **شێخ مەحموود** لە دەراوی سێکۆیە لەوێ مەڕی ڕادەگرێ و چرۆ و پەرکەی بۆ هەڵدەپاچێ گەڵابی و تیرووی بۆ هەڵدەپەر تێوێ بۆی دەخا لەسەر بەفری مەڕ دەبووژێتەوە بەرەبەرە هەور سەران بەر دەدا کزەی شەماڵ پەیدا دەبێ عەرز ئاوی لێ دەنیشێ بەررۆژ ڕەشانگی لێ دیاری دەکا و خاڵەبەڵەک پەیدا دەبێ، ئۆخەی دەکەوێتە دڵان مەڕ دەڕوا و بڵاو دەبێ و قنیا تێ دەکا.



ماڵـە موسـا لـە تـەنگانـە ڕزگاریـان دەبێ، لای ئێـوارێ مـەڕ بـەرەو مـاڵ دێنێتەوە. ئەوجار برایم پەشیمان دەبێتەوە بەڵام موسا تازە دڵی ئێشاوە بڕیار دەدا دەگەڵی لە دێ دانەنیشێ و بڕوا لەوێ بە تەواوی. بەهـار دێ پاتـاڵ لـە غـەم دەرەخسـێ تێرەخـۆرە پەیـدا دەبێ شـینکە لـە چـاو دەدا مووسـا دەچـی لـەسـەر کانیـە چـاوی بـن کێـوەڕەش لـە دەشـتی کانیـە قوڵقـوڵان خـانووی دروسـت دەکـا ئـاوەدانی دەکاتـەوە و نێـوی دەنـێ «مووسێ» و دەشلێ برایم خەساری کرد یان خەسارەتی دا. جا بۆیـە پێی دەڵێن برایم خەسار کە دێیـەکی زۆر کوێستان و سـەر بـە ڕزقـە و گونـدی «مووسـا» دەبێتـە گونـدی «مووسـێ» کـە هـی ئـەو دوو برایـە دەبن. جا نازی وڵام لە مـامی بـرایم دەنێرێ و دەڵـێ: «لـە کیسـت چـوو گـوێ بـە گـواران، ڕەش بـووە بنـی داران، خەسـاری دا کـادێنداران، لـە بیسـت و یـەکەڵـەی ئـاداری مـەڕمان کێش کـرد بـۆ بـن دارێ، دەسـتی... کادێندارێ».

## دێی گەنمان یا چیای نستان



گەنمان دێیەکی کوێستان و سەر سەوز و دڵگیرە لە پەنا چەند کێوی بەناوبانگی کوردستان بە تایبەت ناوچەکانی مەهاباد- بۆکان- بانە و سەردەشت هەڵکەوتووە گەنمان لە ڕابردوودا بەسەر شاری سەردەشتەوە بووە بەڵام لەو دوایانەدا وەکوو زۆرێ لە دێهاتی گەورک لە مەهابادیان وەرگرتووە درا بە شاری بۆکان ئاخرین دێی بۆکانە. جێگای وەسڵبوونی بە دێهاتی شاری بانەوە ئەلێرەوەیە لە مێرگی دۆڵی داودەنۆک و کێوی هەسانان و گوندی سوتووی شاری بانە و دەگەڵ سەردەشت لە هەواری سێوە سوورە و بەردی کەڵییەوە دەگەڵ گوندی گۆڵێ لە چیای نستانەوە دەگەڵ گوندی نستان و لە تەرفی مەیدان چۆغەوە لە کوێستانی گۆمێ دولبەران و دەشتی کەپری دەگەڵ گردشیلانی مەهاباد هاوسایەن، دێیەکی پڕ ئاو و دار و خەڵکێکی زۆر

باش و میوانگر و دەست و دڵئاوەڵای لێیە مامە قالەیەکی لێ هەیە بەقالەی حاجی مینە بەناوبانگە، باغێکی ترێ و سێوی هەبوو تا ئەو سالانە نەیدەفرۆشت و نە پووڵی لە کەسێ دەستاند هەر ئاوا چووبای بەشی خۆت لێ هێنابا و قەرتاڵە و توربێنت لێ پڕ کردبا. دروست کردنی گەنمان گۆیا دەچێتەوە دەورانی میرەکوێرەی ڕەواندز. ئەویش ئاوا بووە:

ئەو جێگا دێیە جێی هەوار و کوێستانچی بووە کە چۆل بووە چوارێیانی دیوی ڕەبەت و گەورکان بووە کە ئەو کات بە ڕەبەتیان کوتووە «سەرچاوە» خێلە کە پیاوێکی دەوڵەمەند دەبێ و ماڵی لە سیادەری ناوچەی گەورکی سەقز بووە ئێستاش گۆیا جۆگەیەک ماوە لەوێ بە نێوی جۆگەی خێلە. ڕۆژێک نەفەرێک دەبینێ دەگەڵ کچەکەی قسە دەکا زۆری پێناخۆش دەبێ نایەوێ شەڕ و خوێنرێژی بێتە گۆڕێ هەڵدەستێ بە شوانەکانی دەڵێ مەڕی ئاوای ئەو دیوی سیاکێو کەن بارگە و بنە و خێوەت و چادر و حاجەت و حوجەتی خۆیان دەپێچنەوە لە داخان زۆری ڕزق و ڕۆزییکەشیان وەکوو خیگە ڕۆن و پێستە پەنیر و توورەکە شیرێژ دەرێژن، لەوێ بار دەکەن بە دێهاتی سیا کێودا دەڕۆن بۆ دیوی نزاری دەشتی کەڵوێ، ئەو کات خەڵکی لێڕەوار زستانێ تفاقیان بۆ حەیوان دانەدەخست هەر گەڵیان بۆ دەکرد و گەلایان بۆ دەخست جەم دەگەڵ جەمێ؛ چونکە دەشتی کەڵوێ گەرمێنە ئەوساڵە لە کەڵوێ دەمێنێتەوە و زستان تەواو دەبێ بەهارێ دەچێتە کن خدرئاغای گەورە کە دەبێ باپیرە گەورەی ئەو تایفەی خدری ئێستای

ناوچەی سەردەشت بووە پیاوێکی زۆر باش و بە ڕوحم و ڕەشید و خەڵک خۆشەویست بووە پێی دەڵێ دەبێ ڕێگایەکم بۆ بکێشی، ئەویش دەڵێ بچۆ گەنمان ئاوەدان کەوە بۆ خۆت چوارڕێیانە و تا ئێستا هەوارچیم بۆ دەنارد ئەو جار هەوارچی بۆ نانێرم.



**«داری گەنمان»**



**«چیای نستان و گەنمان»**

ئەویش دێ لەبەر ماڵان جێگایەکی هەیە بە نێوی کاولانە ئاوەدانی دەکاتەوە. دواتر بە هۆی بڵیندی ئاوی کانییەکە و دێبەرێکی باشی لەبەر ماڵان هەیە دەگوێزێتەوە ئەو جێگایەی کە ئێستا گەنمانە دیارە خدرئاغا کوێخایەکیان بۆ دیاری دەکا بۆ گەنمان و نستان بە نێوی «وسووی شێخ میربەگی» ئەو کات گەنمان وڵاتێکی جەنگەڵ بووە، کێوەکانی بە دار و گوێنی داپۆشراوە، بەڵام بەرەبەرە بڕدراوە و فەوتاوە دیارە لە پەنا چیای نستان سێکۆ و کەپری- کێوەڕەشی مووسێیە. ئێستا مەدرەسە و مزگەوتی باشی هەیە و دێیەکی ئاوەدانە باری

کاروبــاری ئیــدارەو هــاتوچۆی بۆکــان دەکــەن. بــەڵام لــە سەردەشت و ڕەبەت نزیکترن بە بەشە گۆشت ٤٠ ماڵ دەبێ کاروکاسپی ئەوان زۆرتر مەڕداری، وڵاغداری‌یە.

کوێستانەکانی گەنمان لـە لای خۆرهـەڵاتـەوە کە دەکەوێتـە بـەشـی بـرایم خـەسـار ئـەوانـەن: هـەواری گـۆمێ، کـڵاوڕەش، سـێوەسـوورە، قـەبـری لاس و خـەزاڵ، کانییـە خـەزاڵ، شـاخە مشـار، دۆڵـی سـێکۆ، ڕابـی هـەلـدێر و کانییـە حـەیات، لـەلای ڕۆژئاوا کە دەکەوێتە پشت گەنمان و چیای نستان، بەردەمێش، چاوەڕەش، دەشتی کەپری، لەبەینی نستان و گەنمـان ئـەوانـەن، کـە دیـارە هـەمـووی بـە چیـای نسـتان و کوێسـتانی مەیـدان چۆغەوە تێکەڵن.

بــەردە کوڕکــوڕ، کێــوی تــەرازوان لــەبــەینی نســتان و سیسێردایە سەرچاوەی بۆڵژی، سـەرچاوەی بـەردە سـووری، جێگـا هـەواری نسـتان، ئـەوانـە ئـەو جێگایانـەن کـە لـە مەیـدان چۆغـە و چیـای نسـتان دان کـە گونـدی گـەنمـان لـە بـەرقـەد و بن‌پاڵی ئەو کێوەدا هەڵکەوتووە. جێگا خۆشـەکانی دەوروبـەری گوندی گەنمان، گرد بنەوش، مێرگـە سیران، مێرگـی هـەسـانان. داو و دەنــۆک، کــەنــدوان- ســێوە ســوورە. زەلاوان، مێرگــە

نەخشینە. کێوەکانیش ئەوانەن: کێوە ڕەش، بەندەنی تۆپزەوار، مامرکوژە، شاخە سوور. کانی شینەکە. ئەوە بوو بە کورتی گەنمان، نازناوی گەنمان و دەوروبەری گەنمان.

**سەرچاوەکان:** ١-ئەنوەر عەوڵامچە کە لە بنەماڵەی خێڵەیە ٢-فەقێ کەریم ٣-مامەقالەی سۆفی مینە.



**«ئەستێرەکان»**

## حیسابی ڕابردووەکان یا فەرهەنگیی گشتی

لە ڕابردوودا لە وڵاتی کوردەواریدا کە وەکوو ئەمڕۆ کەرەسەی پێشکەوتوو نەبوو، حیسابی ساڵ و مانگ و وەرزەکان و هاتنی شەو و ڕۆژ، بە پێی داب و نەریتی ناوچەکان حیسابی جۆرا و جۆر کراوە لە لایەن پیاوی بە ساڵدا چووەکان و بەتەجروبەکان کە دەستیان بە کاری ڕۆژانە کردوون. نوێژیان پێ کردووە، پارشێو و بەربانگی ڕۆژوانیان پێ کردووە، جوتوو و ڕەپستەیان پێ کردووە گێرە و کێشە و خەلە و خرمان و قۆری و باراش و زمهەریان پێ جێبەجێ کردووە. یان ڕەنجبەر و شوان و گاوان و نێری و بەران و زەو و هەمووی ئەوانەیان هەر بەو حیسابانە و نیشانانە کردووە جا ئەوانەی ئەو حیسابانەیان پێ کراوە بریتی بوون: سێبەر، مانگ، تیشکی ڕۆژ،

ئەستێرە وەکوو گەلاوێژ، کاروان کوژە، کۆ و تەرازوو، لەیلی و مەجنوون، سۆهان، حەوتەوانان، ئەستێرەی ڕۆژ. یان شاخی بڵیند و تیشکی کولانە، کێوی بڵیند وەکوو کێوی بەناوبانگی سیسێرێ کە بە کێوی تەرازوان بەناوبانگە و چەند هۆی دیکە بوون وەکوو: هێلانەی زەردەزێڕە، هاتنەوەی جوڕە خوێندنی کەڵەباب، گوڵکردنی مێژۆرد و گێوژ و وەرینی گەڵادار لە پایزدا کە پیاوە عاقڵەکان کەڵکیان لەوانە وەرگرتووە، بۆ ئێمەش وەک فەرهەنگێک ماوەتەوە چاوی لێ دەکەین. دووبارە وەکوو حیسابی زستان، ڕۆیشتنی پاییز و هاتنی بەهار. ئەویش ئەوانە بوون: قەوسی پاییز، چلە گەورە، چلە چکۆلە، حیسابی مەلا عەبد و مەلا داود، بای وەعدە، مانگی ئادار، هاتنەوەی لەک لەک، گیسکی بەلەمس بورجی پیرێژن، خاتوو زمهەریر، دە ڕۆژەی شوقاق، بیست و یەکەڵەی بەهار، سێ شەشی بەهار، وشتری پیرێژن، ڕۆژی با ڕەشی بەهارێ. ئەوانە دەگەڵ ئەوەی حیسابیان پێ کراوە و ڕۆژ و مانگ وساڵیان پێ ڕابواردووە، هەر یەک قسە و باسێکی لە پشتە و بۆ ئێمەش چونکە وتەی ڕابردووەکان و شوێنەواری باب و باپیری نەتەوەکەمانە بۆتە فەرهەنگێک کە دەبێ بمێنێ و نەفەوتێ و لەبەین نەچێ.




**«مزگەوتی قەدیمی دێ(زاواکێو)»**

**یەکی دیکە** لە حیساب و فەرهەنگە قەدیمیانە حیسابی مەلا عەبد و مەلا داوودە ئەوانە کەسانێک بوون ڕدێن سپی و حیسابگەر و جێگای باوەڕی خەڵک حیسابی ئەوانەن، هەمیشە ١٠ ڕۆژ لە پێشەوە بووە بە جۆرێک دەقیق بوون، تووچێن بەیانی توویان چاندووە کوتوویانە شین دەبێ و دانیش دەگرێ بەڵام پاشنوێژی ئەو ڕۆژە کوتوویانە شین دەبێ بەڵام دان ناگرێ. ئەو دوو پیاوە وەک مەلا عەبد و مەلا داوود یان برا بوون یان دۆستێکی زۆر نزیک بوون، ماڵیان لە گەورکی ناوچەی مهاباد بووە یان گامێشان، قوزلوێ ئەلەوانە بوون ڕۆژێک لەسەر هاتنەوەی لەک لەک لە زستاندا لێیان دەبێتە محاکمە، مەلا عەبد دەڵێ ئەوشەو بۆ بەری بەیانی لەک لەک دێتەوە، مەلا داوودیش دەڵێ نایەتەوە. مەلا عەبد کوڕێکی زۆر باشی دەبێ، مەلا داوودیش کچێکی زۆر جوان و داوێن پاکی دەبێ دەڵێن کاکە با گرێو بکەین ئەگەر تا مەلا

بانگدانی بەیانی هاتەوە ئەسمەرێم دەیە بۆ لاوەی، ئەگەر نەشهاتـەوە چ دەڵێی دەت دەمێماڵی دونیایە. دەڵێ باشـە. مـەلا عـەبد دێتـەوە مـاڵێ و داوا لە کوڕەکەی دەکا و دەڵێ هـەڵێ، تـەزووی بـە خۆت بـدە لـە لینگان وەرێنـە ئـەوشـەو خۆ بگەیـەنـە مێرگی هـەواری شـایی کـە لـەبـەر مـاڵی میرەدێیە لە ناوچەی خەلیفان، جێگایەکی گەرماوە و قـەت بـەفر نـایگرێ و نای بەستێ ئەو مێرگەیە کە ئەو ئاوەی لە کوێستانی بەیرەم بـەرەجۆ و سـەرترەوە، دێتەوە خوارێ کردوویە بە دوو بەش ئەویش دێتەوە نێو چۆمی قوڵەبۆز کە بەشێک لـە سـەرچاوەی چۆمی تـەتـەهـوو«سـیمینە» پێک دێنێ. ئەوە لەک لەک لەوێیە لە سەرمان نـەگـەیوەتـەوە ئێرە؛ شـەو بـەسـەردا دێ، کـوڕە لـە خۆشـی گرێـوی بـابی دەڕوا و دەگاتـە مێرگـی هەواری شایی دەبینێ لـەک لـەک لـەوێیـە، لـە سـەرمـان هـەلکرووشـماوە وەک گوڵوڵەی لێ هـاتووە دەیگرن لـە توربێنی دەخـەن دەیهێنـەوە بۆ دێ دەیبەن لە بن کورسی گەرمی دەکەنـەوە دەبووژێتـەوە پێشنوێژی بەیانی دەیبەن






لەسەر قەڵاغی دادەنێن سۆفی کە بۆ نوێژێ دەچن بۆ مزگەوتی مەلا داوود لەک لەک دەبینێ ئاهێک هەڵدەکێشێ چاوێک لە مەلا عەبد دەکا و دەڵێ:

«ئەی لەک لەکی هەوار شایی      بە دەستیان بۆ ئێرە هێناوی
لەبن کورسی گەرم کراوی      لەسەر قەڵاغی داندراوی»



**«مێرگی هەواری شایی»**

بەڵام مەلا عەبد دەڵێ ئەسمەرێت هەر دەدەمێ بۆ لاوەی، ئەوانە ئاوا حیسابیان درووست بووە. یەکی دیکە لەوانە گیسکی بەلەمسە، جێگای

ئاماژە پێکردنە پیاوی دەوڵەمەند و مەڕدار زۆرینەی حەیوانەکانی نێوی هەیە چ بۆ سەربڕین یان لە کاتی نێری کێشیَ بۆ دانگە و پاراویَ یان شوان لە کاتی مۆڵ و شەوێنیَ بە نێو بانگی مەڕ و بزن دەکەن، کابانی دەوڵەمەند بەرخی لیَ ون بووە بیَ داغ بووە، ئاخەر حەیوانی هەر ماڵێک داغی دیاری کراوی خۆی پێوەیە جا ئەو کابانە ئەو بەرخەی بۆ بە مەڕ لە نێو مەڕی لاوەدا ناسیویەتەوە کوتوویە ئەوە بەرخی مەڕە کەوەسێرە کە ئاوەکی بووە، چۆتە گەل مێگەلی هەندەران و بەرانی گرتووە بەڵام ناسیومەتەوە، ئەو کابانە سەرناس بووە زانیویەتی هی کامە مەڕە، جا ئەوە بوو حەیوانیان نێو دەنا؛ وەک بزنە خەزاڵ، مەڕە کەرە، کەوەسێر، قوتە، خۆتە، چاوجوان، گویَبڕاو، بەلەمس، گویَ قوت، دوانە، مەڕەتاڵە، گویَ گەزیزە، مەڕە گویَبە گوارە، بەربەگوارە، قەشان و ئەلەوانە. گیسکی بەلەمس کە هی پیرێژن دەبیَ لە زستاندا کە کەمێک هەوا خۆشی دەکا، خۆی لیَدەگۆڕیَ و غەرە دەبیَ، جا قەدیمی کوتوویانە نە بە خۆشی زستان و نە بە پێکەنینی زۆردار فریو مەخۆ.



**«گیسکی بەلەمس»**

ئەویش زستانکە بۆتە تاو و ساو گیسکی پیرێژن دەڵیَ:«دەچمە لووتکەی کوێستان، دەخۆم گوڵ لە نیسانیَ،توورِم هەڵدا زستانیَ» ئیتر

زستانیش جوابی دەداتەوە و دەڵێ: «بزانە ڕۆژێکم بمێنێ لە کاردا، ڕەقت دەکەم لە سەرمادا، کەوڵت دەکەم بە داردا». ئیتر هەوا خۆش دەبێ مەڕ دەڕوا بۆ بەرڕۆژان ماوەیەکی پێدەچێ هەواکەی دەگۆڕێ، دەیکاتە تەپ و تۆز و کڕێوە و باڕن، شوان سەری لێ دەشێوی، مەڕ قوڵەپێچ دەکا بۆ ماڵێ، بەڵام گیسکی بەلەمس لە کەندەڵان دەکەوێ سەرما دەیبا، ئیتر پیرێژن قوڕ وەسەر دەکا و دەیکاتە شین؛ هەر ڕۆژێک ئاوا سارد دەبێ، دەڵێن بورجی پیرێژنە یان ڕۆژی کیسکی بەلەمس، بۆیە ڕۆژەکەی توش و ناخۆشە کەس ناوێرێ سەر دەرێنێ.
ئێمە مانگێکمان هەیە بە نێوی مانگی ئادار.

**هەوشار و ١٠ ڕۆژەی شوقاق:**

مەڵبەندێکی پان و بەرین و شوێنەواری مێژووی زۆرە هەوشار بە واتەی ٧ شار یا ناوچە یا حەوتمەڵبەندە کە فارسەکان پێی‌دەڵێن ئەفشار. شارێک کە ئەمڕۆ بە تکاب نێوی دەبرێ لە ناوچەی هەوشار هەڵکەوتووە لە ڕۆژئەژمێری ساڵنامەی ئاشوورییەکان نێوی دووهەمی سەدەی ٦ پێش زایین بە «زاموئا» مەنشوور بووە و هەمیشە دەکەوتە بەر هێرشی ئەوان ئەو ناوچەیە شوێنی نیشتەجێ بوونی جوقەکانی لە مێژینەی «لولووئی و گووتی» بووە کە لە مێژووی نەتەوەکان‌دا لە ڕەگەزی گەلی کورد بوون دواتر دەوڵەتی «ماننای» تێدا بەدی هاتووە لە سەردەمی حەوتی پێش زایین دەگەڵ یەکگرتن دەوڵەتی ماد ئەو ناوچەیە یەکێک لە ناوەندە گرینگەکانی بەشی ئابووری ئەو دەوڵەتە بە ئەژمار هاتووە وەکوو کاک فایق شامحەممەدی ئاشنا نووسیویەتی ناوچەی هەوشار کە ئێستا بەشێکی بەرچاوی سەر بە شاری تکابە و چەند بەشێکی دیکەشی دەگاتە شارەکانی دیکە وەکوو سایینقەڵا، بۆکان و ناوچەکانی دیکەی سەردەمی خۆی چەند حکومەتی تێدا کراوە و جێگەی چەند دەسەڵاتی و حوکمڕەوا بووە وەکوو هەخامەنشییەکان، ساسانیان، ئیلخانیان و زەردەشتیان بە بۆچوونی کاک عومەری فاروقی وەکوو بەڕێز ئاشنا لە مەجەللەی مەهاباد شمارە ١٢٧ نووسیویەتی هەوشار پێش‌تر حەوت شار بووە بۆیە پێی‌دەڵێن هەوشار. بە کورتی یەک قەڵای بلقیسای حەزرەتی سولەیمانە دوو قەڵای شێزیان تەختی

سولەیمان کە عبارەتە لە حەوشە و حەسار و چەندین بوورج و بارو گۆیا پرۆفسۆرێکی «جێرمان» و هاوکارەکانی ماوەی ٣٣ ساڵ لەوێ لێ کۆڵینەوەیان کردووە. ٣ قەڵای کەرەفتوو و ناوچەکەی کە ئەشکەوتێکی عیبادی و مێژووی بووە و لەسەر لێکۆڵینەوەکانی ئەم بەینەدا مەعلووم بووە کە چوار دەوری قەڵاکە نشینگە و جێگای خانوویە و گۆڕستان بووە سێ بەردی زەلام لەسەر دوندی بەرانبەری هەن کە مێژوونووسان پێیان وایە ئەمانە پەیکەری خودایانن کە لە کاتی میهرپەرستیدا بوون و یان هەیکەلی پادشاهانی ئەو سەردەمەی ئێرانن کە وێران بوون.٤. زیبا زێوێیە کە لە ڕۆژهەڵاتی شاری سەقزە و چەند قەڵای بەناوبانگی لێ هەیە وەکوو تیکانلوو، قەپلانتوو، و ئارامائیت(ئاڵکەلوو) دەگرنەوە. ٥. قەلایچی لای شاری بۆکانە کە مەعبەدی هەرە مەزن و پەرستشگەی مادەکان بووە. ٦. شنۆ کێلەشین دەگرێتەوە. ٧. بەشی ڕۆژهەڵات و باشووری «شیز» کە دەگاتە «زیئاگرۆس» واتە گەڕووس و قەڵای قەمچکە بەڕێز کاک فایق دەڵێ کە بەڕێز کاک عومەری فارووقی نووسیویەتی ئەبوودوولەف موسەعەری بنی موهەلهەلی خەزرەجی مێژوونووس و شاعیر و نووسەری عەڕەب لە سەدەی دەیەمی زایینی لە سەفەرنامەیەکدا لەسەر شەرحی تەختی سولەیمان وشەی شار دەکار دەکا بەو جۆرە دەنووسێ شارێکە دوای چەند ئاسار و شوێنی گرینگ لە ناوەندی شارەکە واتە تەختی سولەیمان گۆمێک هەیە کە زۆر قووڵە و کەس ناتوانێ بگاتە بنی و هیچ گیاندارێکی ئاوی تێدا نییە و ئەو جێگایە ئەو

نووسەرە ئەوە تەختی سولەیمان بوو و هەروەهاش ئەو ٦ جێگایەی دیکەش کە ناوبران سەردەمی خۆی بە شار حیساب کراون و ڕەنگە شار یا شارۆچکە بووبن دەگەڵ ئەو بەڵگە و سەنەدانە کە باس کرا هەوشار حەوت شار بووە و بەو حەوت شارە کوتراوە هەوشار کە ئێستاش ئەو ناوەی لەسەرە. هەوشار بە باوەڕی بەڕێز کاک حوسێنی شێربەگی بە بەڵگە و دەلیلی زانستی(عیلمی) هەوشار بەشێکە لە کوردی سۆرانی و بە ناوچەی موکریان دادەندرێ. لە لێکۆڵینەوەکانی مێژووناسیدا چەند ئاسەوارێک لە سەردەمی هەخامەنشیدا کە ئاماژە بە هەبوونی گەلی کورد دەکا و هەروەها لە ئاسەوارێک کە لە زیندانی تەختی سولەیمان دەست کەوتووە ئەوە دەگەینێ کە تکاب لە سەردەمی ئەشکانیان و ساسانیانیشدا ناوەندی پێشکەوتن و شارستانییەت بووە جودا لە ئەشکەوتی کەرەفتوو لە ڕۆژاوای تیکاب دەتوانین تیشک بخەینە سەر کێوی بلقیس لە ڕۆژهەلاتی تەختی سولەیمان بە سەرنجدان بە کۆمەڵێک بەڵگەی بەجێ ماو لە سەردەمی حکومەتی سەفەوی تکابی هەوشار ناوەندێکی گرینگ بووە و تا ئەو دەمە بە (ئەلەکەی سارووقۆرخان) واتە قەلای ساریقۆرخان، قۆرخان ناوی لێبراوە و ئێستاش بە ناوی ساریقۆرخان تۆمار کراوە و ئەو ناوە بە گوندێک دەکوترێ کە لە ١٨ کیلۆمیتری شاری تکابە و خەڵکی ئەو گوندە ١٢٥ کەسن و لە ڕێی کشت و کاڵییەوە دەژین ئەو گوندە و ئاسەواری مێژوویی کە لە نزیک ئەو گوندەیە کە قەلایەکی مەزنە، سەرنجی هەموو کەسی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە ئەم ئاسەوارەش قەلای

مەنشووری «ساری قۆرخانە» ئەو قەڵایە پێش مێژوو جێگەی شارستانیەتی هەزارەی یەکەم و لە سەردەمی ماد تا ساسانی نیشتمانی چەند دەستەیەک «هەر لە میللەتی کورد بووە» بە بەڵگەکانی نووسراوە و لە کتێبی «حافیز ئەبروو» لە ژێر کتێبی «جامیعوتەواریخ» لە ساڵەکانی ٧٧٧ی کۆچی مانگی دەسەڵاتداری ئەم ناوچەیە و هەروەها ناوچەی «موغتوو» کەسێک بە ناوی «تورسەن» بووە قەڵای ناوبراویش ئی ئەو بووە تکابی هەوشار لەم حاڵەدا کە زۆر بەرهەمی کشت و کاڵی تێدا بە عەمەل دێ بەرهەمی دەستکردیشی هەیە.

شوێنەوارە مێژوویی و دیدەنییەکانی ناوچەی هەوشار ١. غاری کەرەفتوو ٢. قەڵای ساری قۆرخان ٣. تەختی سولەیمان ٤. قەڵای بڵقیس ٥. کێوی زیراوا ٦. غاری پیر محەممەد لە گوندی قزڵقەبر کە لە ٢٥ کیلۆمیتری سائیندژ بە تکابە ٧. کوێستانەکانی ماینبلاغ ئەوانە و چەندین جێگای دیکەی خۆش و دیدەنی لە ناوچەی هەوشار کە سەرنجی هەر بینەرێک بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ هەر بەو بۆنەوە ناوچەی هەوشار و شاری تکاب یەکێک لەو جێگا خۆشانەی باشووری پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژاوا و چەند کانگای مەعدەنی و دیدەنی لە دێیەکانی «ئاغەرە» «زەرەشۆرە»دا هەیە و دەبیندرێ. هەر بۆیە بە نەقیمی پارێزگا مەنشوورە.

**سەرچاوەکان:** ١- مەجەللەی مەهاباد ژمارەی ١٢٧ لە نووسینی کاک فایق شامحەممەدی. ٢- دەستخەتی بەڕێز کاک حوسێن شێربەگی ٣- لێکۆڵینەوەی مەیدانی و -وتو وێژ دەگەڵ ڕدێنسپیەکانی ناوچە.



«ڕۆیشتنی مەڕ بۆ کوێستانی ماینبڵاغ»

**کوێستان و ١٠ ڕۆژەی شوقاق لە هەوشار:**

یەکێک لە هۆز و عەشیرەتی هەوشار کە زۆرتر لەبەینی مەراغە، زەنجان و تیکاب نیشتەجێ بوون و هەن. گوایە ئێستاش زمانی کوردی خۆیان پاراستووە و هەر قسەی پێدەکەن. ئەوانە لە کوێستانەکانی ماینبڵاغ نزیکن. دیارە کوێستانی ماینبڵاغ و کوێستانی سەلیمخان یا سەلیم بەگیان پێکوتووە.




له پێشدا ئەو کوێستانانە سدات و دێبۆکریشی لێبووە، ئەوە بەشێک لە ناوچەی زۆر پان و بەرینی هەوشارە. هەوشار مەڵبەندێکی گەورە و نەتەوەی ڕەشید و نەترس دەگەڵ فەرهەنگێکی غەنی و دەوڵەمەند و هەمیشە حەولیان داوە ڕێوڕەسم و دابونەریت و فەرهەنگ و زمانی خۆیان بە دروستی بپارێزن و ڕایگرن. پیاوی گەورە، شاعیر و نووسەری کەموێنە و عالمی زۆر زانایان لێ هەڵکەوتووە و لە باری کشت و کاڵییەوە ناوچەیەکی پڕپیت و بەرەکەتە.



وێنەگر: قادر نالی

کێوی تەورێز خاتوون و دیمەنی بەشێکی کەم لە گوندی تەورێز خاتوون

لێرەدا سامی قۆرەت ئەنوێنێ    خەیاڵ ناتوانێ پەل داوەشێنێ

چون لە پای کێوی تەورێز خاتوونا    لەهەر شوێنێکی ڕژاوە خوێنێ

کۆلیل

لە باری زانستی پیشەییەوە فەرشی هەوشار هەر لە زۆر قەدیمەوە ویردی زمانی کڕیاران و زەقی شەبەقداری چاولێکەران و سەرنج ڕاکێشی ناوچەکانی دیکەی ئێران و دەرەوەی وڵات بووە، ئەو فەرشە چاکانە کە بە شارەکانی دیکە دەناسرێن هەر هی هەوشارە و سەرچاوەی ئەوێ بووە و هەیە. لە باری خوو-و- خدەوە لەو پەڕی پاکی و چاکی دان لەگەڵ خۆ و بێگانە. هۆز و عەشیرەتەکانی هەوشار ئەوانەن: شوقاقی، گەرووسی، کاکەیی، کەڵهوڕی، برایمی، مەریوانی، قاڵقاڵی، گۆرانی، گەڵباغی، کاسەوەنی، چۆغەڕەشی، کاڵەمۆیی، کۆسە، بۆرەکەیی، سلێمانبەگی، بلۆاز



**«تەختی سولەیمانی هەوشار»**

یا بلّباز، هۆلمزیار دیاره زاخۆرانی، موسڵانی، شاغی، شاسەیوانی لە نزیک و دەورووبەری ساییینقەڵان، ئەوانە بە هەوشاری دانانێن دەڵێن لە هۆز و تایەفەی دیکەن(چونکە ویستی من ١٠ ڕۆژەی شوقاقە، دەنا نووسین لەسەر ناوچەی هەوشار و فەرهەنگ و داب و نەریتی ئەوێ نیازی بە نووسین و چەند کتێبی گەورە هەیە). لە باری سەرچاوە و مەعدەنەوە پڕ لە کانگای ژێرزەوی، تەنانەت دەڵێن کانگای تەڵای لێ هەیە. پیاوانی زۆر خەتخۆش و نووسەرانی کموێنە و ڕووداوی زۆر بە نرخی لێبووە و هەیە، فەرهەنگی دەوڵەمەندی زمانی کوردی وەکوو داستانی عەزیز و تەکش. لە نووسینی بەڕێز مامۆستا کۆلیل:

کێوی زێڕاوە کەتیوی مێژوون
لە ناوچەی گەڕووس تۆمارگەی کردوون
لە زەرد و هەرد و بەردی ئەژنەوی
عەزیز و تەکش نەمردوون و زیندوون

بـــۆ دیوانـــــدەرەو تـــــەواو مــــــەحاڵی
ناوچـــــەی گـــــەڵواخی و ئێلـــــی قاڵقـــــاڵی
کـــڵاورەش کێـــوی «تـــۆڕ» و «فـــاڕان»ە
دەبـــا حـــالی بـــن خێڵـــی ناحـــاڵی

کۆلیل



**«کوێستانی قەڵپەزی ماینبڵاغ»**



**کوێستانی هەوشار**

هـەروا چـەنـدین داسـتانی مێژوویـی دیکـەی لـە ناوچـەی هـەوشـار لێبووە. مەڵبەندی هەوشار مـەحموودجوغـە تـا تیکاب نزیک زەنجان و کوێستانی مـاینبڵاغ نزیـک دەبێتـەوە لـە مـەراغـە. ناوچـەکانی هـەوشـار: شاغی، شاسەیوان، چەرداڕوو، ناوچـەی موسـڵانی و زاخـۆرانی، چۆمی کەلهوڕ، ناوچەی گەڵباغی، تەختی سولەیمان، ناوچـەی بڵقیس، مـەحاڵی سەرێ و خوارێ هەوشار، تەڵای زەڕشۆران. کوێستانەکانی هەوشار و مـاینبڵاغ ئـەوانـەن: ڕووشـان، شـەقشـەق، قەڵپـەز، چـۆدار، قـزڵوەرد، شوانکارە، مەمەدتەغی، دۆڵەمە، وژدەرە، دێبەگڵی، خاڵندی، شـاوێردی، کونەورچ، زوڵمات، یونجەلی، پیرمحەممەد، شەمدیلە. جا ئێلی شوقاق کە هـۆزێکی کـوردی ڕەسـەنـن و کاریـان هـەوار و چادرنشـینیە لـەو ١٠ ڕۆژەی هـەوەڵی بەهـار بـار دەکـەن و دەچـن بۆ کوێستان. بـە خۆشـی زسـتان فریـو دەخـۆن چـون هـەوا خـۆش بـووە و تاوسـاو دواتـر کردوویەتە دوونە، هەواکەی گۆڕیوە. جا قـەدیمـی کوتوویانـە: «زسـتان

سەرهەڵتەکێن بێ، نەک کلکهەڵتەکێن» و ئیتر ساڵەکەی لێ گۆڕیون مەڕەکەیان قڕی کردووە لەو ١٠ ڕۆژەدا جا بەوە دەڵێن ١٠ ڕۆژەی شوقاق چونکە شوقاق ئەو عێلەن لەو ١٠ ڕۆژەدا بە هیلاک چوون ئیدی لەو کاتەوە ئەو ١٠ ڕۆژە بە ١٠ ڕۆژەی شوقاق بەناوبانگە و بۆتە فەرهەنگێک لە وڵاتی کوردەواریدا.

**یەکیکی دیکە لەوانە ئەستێرەی گەلاوێژە:** ئەو ئەستێرەیە دوو دانەن گەش و ڕووناک و بریسکەدارن لە دوو کاتی جودادا هەر یەک پەیدا دەبەن. یەکیان لە مانگ و نیوێک هاویندا و ئەوی تریان لە مانگ و نیوێک زستاندا بە حیسابی مانگیش دێن نەک بورج. کاتێک گەلاوێژ دەبیندرێ دەڵێن گەلاوێژ کەوتووە یان ئەنگووتووە هاتن



**«ئەستێرەی گەلاوێژ»**

یا هەڵاتن هەر دووک گەلاوێژەکان خەبەرێکی خۆش بوو و موژدەدەر بوو بۆ خەڵک. یەک لە مانگ و نیوێک هاوین کە گەلاوێژ دەکەوت ئاو سارد دەبوو، گەرما کەم دەبوو شەوانە هەوا فێنک دەبوو کاری دێهات کەم دەبوو، کاریگەر و کاسبکار لە چنگ گەرما ڕزگاریان دەبوو و جۆگە و چۆم و چۆمەڵ دەژیانەوە ئاو و زناو و زۆنگاوی

گویَ چۆم ئاویان لیَ پەیدا دەبوو حەیوان و پاتاڵ کە بە گەرما وەڕەز بوون لە چنگ میَش و مەگەز و مۆز نەجاتیان دەبوو بەرە بەرە کاتی کەشاو ڕەپستە و ئەستیَراو دەهات. گەلاویَژی دووهەم کە دەکەوت لە نیوەی زستاندا بوو ئەویش موژدەی ئەوەی پیَبوو دەیانکوت عەرز تەشقی شکاوە هەوا دەگۆڕیَ عەرز گەرم دادیَ بەفر باش دەتویَتەوە و چلە زۆری نەماوە. سیَحەب پاتاڵ دڵیان خۆش دەبوو دوای ئەوانە کاتی داچاندنی ڕەپستە دەهات. ئەویش ئاوا بوو یا بەنداو بوو یا ئەستیَراو بوو، ئاخری مانگی هاوین ئەستیَریان دەگرتەوە دواتر بەڕەڵڵایان دەکرد شەواویان لە زەوی دەنا و جوان دەیخووساند، بەوەیان دەکوت کەشاو یا شەواو ئەگەر تۆزیَک ویشک باوە دەیانکوت کزر بۆتەوە و کەشی هاتۆتەوە کاتی کیَلاَن و داچاندنی هاتووە خەت و کوزیان لیَدەدا و دایان دەچاند ماڵوویان دەکرد شین دەبوو بەوەیان دەکوت ڕەپستە.




**ئەوجار نۆبەی تیَکردنی نیَری و بەران دەهات،** لە قەدیمدا هەمیشە نیَری و بەران لەبەین مانگیَک تا مانگ و نیویَک پاییزدا بوو ئەوکات

بەرانیان تێدەکرد. چونکە دەیانکوت با بەهاری زوو زەومان نەیە، زەوی زوو لەبەر نەبوونی جێگا و ڕێگا ناسلامەت بوو بۆیە دەوڵەمەند دەیکوت - کۆزی ساوا ماڵی ئاوا- بەڵام کۆزی هەراشی کەلاک بەلاشی - لەبەر ئەوە درەنگیان بەران تێدەکرد یا تێبەر دەدا کە کاتی بەرانی دەهات بەرانیان ڕەنگ دەکرد.




هەر کەسێ حەیوانی خۆی بەسەر دەکردەوە. شوان دادەنیشت، شەرتی شوان دەدرا هەر کەسێ مەڕی خۆی هەڵدەوارد نان و شیرێژ و ڕۆن و نەهاری چاکیان دەدا بە خەڵک، نیوەرۆژیان دەخوارد تا ئێوارە قەرەوانە لەسەر ئاور بوو بۆ چایی، دوای ئەوانە لە دەوری مەڕی هەڵپەڕینیان دەگرت تا درەنگانێک. زۆر جاری وابوو لە کاتی بەران پێکردندا لە لووتکەی کێوەکان گەرداڵە بەفرێک یان کاڵەپێیەک بەفر دەباری دەیانکوت ئەوە بەفری بەرانە. دوای ئەوە دەگەیشتینە مانگێک پاییز بەوەیان دەکوت قەوسی پاییز، قەوس خوشکی چلەگەورە و چلە چکۆلە و خاتوو زەمهەریرە. لە قەوسی پاییزدا ویشکە سەرما پەیدا دەبوو، زوقم و سیخوار وسێپەڕە دەکەوت، شەختە دەکەوت،

میوە و تەماتە و هەرچی بە دارەوە مابا سەرما دەیبرد. هەرمێ کێویلە و گێوژەمۆرە و کوڕکوژە نەبێ ئەوانە درەنگ سەرما دەیان با. ئیتر مەڕ دادەکرا، بەرەبەرە سەرما هێرشی دەهێنا جاری وابوو بەفریش دەباری و مەڕ بە یەکجاری لە ئاغەڵ دەکرا، دەیانکوت مەڕ کەوت بە ئیستلاحی ئەوکات وا باو بوو دەیانکوت کە تازە بەرگی فەقیری دڕا، دەبوو خەڵک خۆ کۆکوو پۆشتە کاتەوە، کون و کەلێنی خانوان بگرن دەلاقە و گوێسوانە و کولانە(ڕۆچکە) چاک کەنەوە. خۆ بۆ لەرزینی زستان حازر کەن. ئەوەش قەوسی پاییز.



**ئەوجار حسابێکی دیکەمان هەبوو بە نێوی کەڵبەز:** کەڵبەز بە دوو جۆر باسی دەکەن، قەدیمیەکان کوتوویانە **یەک**. کەڵ و گامێش بە سەرما نەخۆش دەکەوێ و نەخۆشییەکەشیان ناوی خشخشەیە. ڕەنگە کەڵبەز بۆ حەیوانە کێوی بێ، یان چونکە کەڵ بە سەرما وەڕەزە، هەربۆیە کوتوویانە کەڵبەز واتە کەڵبەزێن.

**بەشی دووهەمیش ئەوەیە، کەڵبەز** بۆ حەیوانە کێوییە وەکوو بزن و مەڕەکێوی چون مەشهوورە کە دەڵێن وەک بزنەکێوی چاوی لە کۆیە. کۆتەرازو و چەند ئەستێرەی ڕووناک و پڕشەنگدارن (**ڕوونکردنەوە:** بە عەرەبی دوببی ئەکبەری پێی دەڵێن، بە کوردی حەوتەوانان، بە فارسی هەفت بەرادەر. بە عەرەبی دووببی ئەسغەر،بە کوردی کۆتەرازوو، بە فارسی خووشەی پەروین).



جا بزن و مەڕەکێوی ساڵ دوازدە مانگە پێکەوەن وێک ناکەون و جووتەی ناکەن تا ئەو کۆ و تەرازوویە ئاوا نەبن ئەوانیش لە ١٨ ڕۆژ پاییزدا ئاوا دەبن یانی ١٨ ڕۆژی پاییز بمێنێ. جا کە ئاوا بوون تێکەڵ دەبن و جووت دەبن وەک نێری و بەرانی خۆماڵی. فەلسەفەی ئەوەش لەوەدا ئەوەیە دەڵێن ئەگەر زووتر وێک کەون لە سەرمای زستانێ یا لێنگێزەی بەهارێ بێچوویان دەبێ ئەویش سەرما دەیبا و بەخێو ناکرێ.



بەڵام لەو کاتەدا کە ١٨ ڕۆژی پاییز دەمێنێ زەوی ئەوان دەکەوێتە ٤٠ ڕۆژ بەهار، چونکە حەیوان چ کێوی و چ ماڵی بە ٥ مانگ دەزێ بێچووی دەبێ، لە ٤٠ ڕۆژ بەهار بە تەواوی شینکە پەیدا دەبێ لەوەڕ خۆش دەبێ هەموو پاتاڵێک لە غەم دەرەخسێ. ئەوەش کەڵبەز.

# ساڵی بەفرە زۆرەکە و سێڵاوە زۆرەکە



«بەفر دارەکانی داپۆشیوە»

هــەر هــەناســەیەک لــە دەروونــی ئینســان دێتــە دەرێ مــرۆڤ دادەچڵەکێنێ کە دەبێ بۆ دواوە ئاوڕ داتـەوە و بۆ پێشـەوەش هـەنگاو بنێ و حیسابێک دەگەڵ خۆی و ژیانی ڕابردووی بکا و هەر ساتێک کە چرکـەی لێدەدا کـە تـازە ناگەڕێتـەوە بـۆ دواوە، ئـەوەی ڕابـردووە لـە خۆشی و ناخۆشی لە عومری بەشـەر کـەم دەکاتـەوە بـەڵام لـە سینەی پڕسنەی مێژوودا مێژوویەک دەنووسێ یا لە دەفتەری خاوێنی بێلایەنی مێژووناسان دەنووسرێ دیارە هەر ڕۆژێک کە گزنگی هـەتاو هەڵدێ و لــەســەر لووتکــەی بــەرزی ژیــانی ئینســانێک هیــوا پەیــدا دەکــات و ڕەوڕەوەی ژیانی کۆمـەڵ وەگـەڕ دەخا بۆخۆی مێژوویـەکە کـە دەگـەڵ ئەوەی دەیبینێ و دەیکا و هەر ڕووداوێک کە ڕوو دەدا لە ژیانی تـاک و

کۆمەڵ، جا لە تاڵ و شیرن بۆخۆی بیرەوەرییەکە بۆ بەرەی داهاتوو تا لە ژیانی ڕابردووەکانی خۆیان ئاگادار بن و ئەو ژیانە سادە و ساکارەی ئەوان کە لە عەینی حاڵدا پڕ لە خۆشەویستی و عیشق و ئەوین بە یەکتر بوون لە یاد نەکەن و لە بیر نەچێتەوە. بۆ وێنە وەک سەرماکەی ١٣١٢ هەتاوی کە ڕووی داوە و نووسراوە و زەرەر و زیانی زۆری گەیاندووە بە وڵات یان وەک سێڵاوەکەی ١٣١٥ شاری مهاباد کە لە

گەڕەکی خڕێوە هاتووە، ڕووی لە شار کردووە و زەرەری گیان و ماڵی زۆری بووە وەک بەرێز سەید محەممەد سەمەدی نووسیوێتی.

یان سەرماکەی ١٣٤٣ کە سەرمایەکی زۆر توند بوو ڕووی لە وڵات کرد کە ئەو سەرمایە لە مانگەکانی ڕێبەندان و ڕەشەمەدا بوو- و زۆری باڵندە و پەلەوەر ڕەق هەڵێناو دەست بە ئاڵقەی دەرگاوە دەیبەست. دەعبای کێوی هورژمیان هێنا بۆ نێو دێیەکان، خۆیان لە ماڵان دەهاویشت، دەیانکوت لە سەقز لەوبەری پردی ئەوکات ماڵی لێ نەبوو و گورگ هاتبوون بۆ نێو شار بە پردە ئاسنەکەوە بەستبوونی. لە مەهاباد دوو نەفەر لەکەلی بەسری ڕەق هەڵاتبوون خاڵە مەحموودی کاوڵان دەیگێڕاوە کە بەهارێ چووین بۆ بەندەنێ، دیمان زەلامێک لە کۆخی کورتەک سەرما بردوویە و نەگەیشتبووە کۆخەکە و لە سالی ١٣٥٢ بەفرە زۆرەکە باری کە سەرەتای سێڵاوەکە بوو.

## ساڵی بەفرەزۆرەکە



سالی ١٣٥٢ کە سالی بەفرەزۆرەکە بوو، سالێک بوو ئاسمان ئەوپەڕی سەخاوەت و دەستبڵاوی خۆی نیشان دابوو. هەر لە ٤١ ڕۆژی پاییزەوە یانی ١٩ی سەرماوەزەوە مەڕ کەوت.

(**ڕوونکردنەوە:** مەڕ کەوت وتەیەکە لە نێو مەڕداراندا، یانی لەو کاتەوە مەڕ خۆی ناچێ بۆ لەوەڕ و دەبێ بیبەنە سەر دانگە و گیای بۆ بخەن و بیخوا ئەوە دەڵێن مەڕکەوت یانی مەڕ دادەکرێ.)

ئیتر بەفر ئەوەندە زۆر بوو ڕێگا و بان گیرابوو و هاتوچۆی دێیەکان بە کەمی دەکرا و ئەو کات جادە نەبوو، بشبا ڕێگا لە وڵاتی کوێستاندا نەبوو. بەفر ئەوەندە زۆر بوو گورگ ئەو ماڵ و ماڵی نەدەکرد، کرێوەیەکی دەکرد چاو چاوی نەدەدیت، ڕێوی خۆی لە ماڵان داویشت، کەس نەیدەتوانی دانگەی بۆ مەڕی بخا. **ڕوونکردنەوە:** ئەگەر مەڕ دەبەنە پشت ماڵان گیای بۆ دادەنێن بیخوا، بەو جێگایە دەڵێن دانگە و بەو گیایەش دەڵێن دانگە خستن. حەسار هەموو پڕ بوو لە بەفر خەڵک هەر بە سەربباندا هاتووچۆیان دەکرد. چون حەسار و سەربان ڕێکوپێک بوون دارماڵ، ماڵی وابوو ئاوی نەبوو، بۆشی نەدەهات

بــــەفــــری دەتوانـــــدەوە بــــۆ خـــــواردنی خـــۆی و پاتاڵیــــان.
**ڕوونکردنـەوە:**پاتاڵ(حـەیوان). ئـەگـەر پاتاڵیـان دەرکردایـە، دەبـوو بـە پازدە، بیست نەفەر کە کۆ ببنـەوە بچن بۆ چۆمی بە پاچ و پێمـەڕە و تەور بە ئەندازەی سەری حەیوانێک ئەگەر سەهۆڵی چۆمییان بۆ شکابا. ئـەوە حـەیوانیان نێریکێش دەکرد و دەیانبـرد لـە چۆمی ئاویـان دەدا. زۆر ئاستـەم بـوو جـاری وابـوو کەسـێک بـانی زۆر بـا ئـەو ڕۆژە فریـا نەدەکەوت هـەمووی بمـاڵێ، ڕۆژی دواتـر خـەڵکی نێو دێ لێیان دەکردە هەرەوەز دەچوون یاریدەیان دەدا و بانەکانیان لەگەڵ دەماڵی.



**«زاواکێو لە ساڵی بەفرە زۆرەکەدا»**

ئەو کات خەڵک زۆربەی ماڵە دەوڵەمەندەکان، ناشتا یان چێشتیان لێدەنا. ئەو ماڵەش ترخێنەیان بۆ ئەو هەرەوزە لێدەنا. ترخێنە چێشتێکی قـەدیمییـە. بـەو شـێوەیە لێـی دەنـێن: ئـەوانـەی تێدەکـەن: شـێلم، نـۆک، چەوەندەر، لەتکە هەرمێی ویشک، پیواز، گۆشتی قاورمە، مێوژ ڕەشکە، ماش، نیسک، کاکڵە گوێز.




**«وەروەرەو بێڵی بەفرماڵین»**

**ڕوونکردنەوە:** گۆشتی قاورمە ئەوەیە: قەدیم کە یەخچاڵ نەبوو، زۆربەی ماڵەکان مەڕ یا بزنی قەڵەویان لە پاییزدا سەر دەبڕی سووریان دەکردەوە، سوێریشیان دەکرد ئیتر بۆ هەڵگرتن لە هەمبانەیان دەکرد و هەڵیان دەگرت. دیارە هەمبانە پێستی مەڕ و کاوڕە، پاکی دەکەن و خۆشی دەکەن. ئیتر دێن قاورمەی تێدەکەن. نانی تێدا دەبەن بۆ دەشتەوان بۆ کێوی. قەت نان ڕەق ناکا و قاورمەش خراپ ناکا و بۆگەنی ناکا. ئەو ساڵە بەفر ئەوەندە زۆر بوو تا یەک مانگ بەهار لە نزیک ماڵان ڕندووە بەفری قورس مابوو لە یەک مانگ بەهاردا بەو لاوە چاڵە بەفرمان داخست یانی هەڵماندەگرت بۆ هاوینێ. ساڵان وا نەبوو، ساڵان لە نەورۆزێدا چاڵە بەفرمان هەڵدەداوە.

**ڕوونکردنەوە:** چاڵە بەفر ئەوەیە: ڕندوو بەفر کە لە جێگایەکی قوڵ و کۆنەچاڵ و نسێ ماوەتەوە، خەڵکی بە دەستەجەمعی دەچن بە بێڵ و پاچ و پێمەڕە کۆی دەکەنەوە، هەڵیدەدەنەوە. توند توند بە چەند نەفەر دەیشێلن.



دواتر خوێی پێدا دەکەن تا سفت بێ. کای پێدا دەکەن تا زۆر تاو لێی نەدا. گڵی بە سەردا دەکەن تا داپۆشرێ و بەفر و باران لێی نەدا و ئاو نەچێتە پاڵیەوە لێیان دەگەڕا تا بەفر لە وڵات تەواو دەبوو جا ئەو کات یان پیاویان بۆ دەگرت یان مجێوری مزگەوتی ئاوەدانی ڕۆژانە دوو نان یا زیاتری لە ماڵان وەردەگرت و دەچوو بارێک یان دوو باری بەفر دەهێناوە بە پێی زیاد و کەمی خێزان دەیدا بە ماڵان، ئەگەر ئەوەش بەشی نەکردبا دووبارە مجێور دەچوو ئیدیکەی دەهێنا. بەو کابرایەیان دەکوت: چاڵەوان یان بەفرەوان، دەبوو ئاگای لێ بێ و پارێزگاری لێ بکا. ئەوەیە چاڵە بەفر. چۆلەکە و باڵندە خۆیان لە ژووران داویشت لە برسان بەڵام خەڵکی نێو دێیەکان، پێکەوە بڕیاریان دا هەر چی باڵندەیە و دەعبایە، کەس نابێ ڕاوی بکا و بیکووژێ، کەیخودا و پیاوانی ڕدێن سپی نێو دێ گەنم و هەرزنیان دەدا بە ماڵان تا بیدەن بە باڵندەکان لە برسان نەمرن. لەگەڵ ئەوەش ئەوکات گەنم کەم بوو و هەر وا بەڵێنیان دا پێکەوە هەر چی زەخیرەی لێ بڕابا دەبێ بیدەینێ و ئاوڕی لێ بدەینەوە تا قڕ نەکا و بە هیلاک نەچن. کابرایەک نێوی مام عەوڵا بوو لە دێیەکی نزیک دێیەکەی ئێمە بوو لە دێیەکی

دیکەڕا هاتبووە دێیەکەی خۆیان وەبن هەرەسی بەفر کەوتبوو و مرد تا یەک دوو ڕۆژان نەبیندراوە و دەرنەهاتەوە ئێستاش ئەو جێگایە بە عەولاّ کووژراو مەشهوورە.

ئەگەر نەخۆشێک یان سووتاوێک ببا دەبوو لە سەر داری دانێن. وەک تابووتی مردوو هەڵیگرن و بە چەند نەفەر بە بەندەنە بارنەکاندا کە بەفری کەمترە. بیهێنن بۆ شار. ئەویش چۆن دەگاتێ و کەنگێ دەگاتێ خودا دەزانێ. ئەمن ئاگام لێیە ژنێک بە نێوی ئاڵتوون بە ڕەحمەتی خودا شاد بوو. ڕۆژی هەوەڵ توانیمان هەر لە ماڵەوە بیگەیەنینە مزگەوتێ. ئەو شەوە لە مزگەوت ماوە. جا ڕۆژی دواتر تەسلیم بە خاکمان کرد تا ئێوارەی پێ چوو. ئەویش لە پەنا مالاّن، قەبران هەر هەزار هەنگاو لە دێ دوور بوو. کابرایەک زۆر دەوڵەمەند بوو ئەمری خودای بەجێ هێنا. تا حەڤدە ڕۆژان دێهاتی دەورووبەر نەیانزانی، لەگەڵ ئەوەش دەوڵەمەند بوو، دواتر خەڵکی دێهات هاتن، لەبەر کرێوە و ڕێگرتن چەند ڕۆژ مانەوە، هەر چەند نەفەر لە مالاّن بوون، ڕۆژێک لە ماڵی مەلا بوون، وەختی نان خواردن نانیان دەخوارد، ئاگام لێ بوو بە یەکتریان دەکوت زۆری تێگوشە ئەگەر بۆشت نەخورا ماڵی مەلایە قەیناکە، هەر ئەو جارەمان بۆ هەڵکەوتووە.

# قۆری و گیشه




یەکی دیکە لەوانەی زۆر باو بوو و دەکوترا و حیسابی زستانیشی پێدەکرا دووچلە بوون و ئەوەی دیکە کە لە زستان دەبێ و بۆ خەڵکی دێهات لازمە«قۆریە» کە باسی دەکەین.

جاساڵی ئاوا و زستانی ئاوا بۆ دەوڵەمەند و مەڕدار ئەوکات ناخۆش بوو. چون ڕێگا و بان نەبوو بەفریش زۆر بوو. خەڵکی کوێستان زۆر بە زەحمەت تفاق و خۆراکی حەیوانیان پەیدا دەکرد. ئەو جێگایەی گیای لێیە، وەک مەندێ، ڕێکڵاو، هەلز، بۆر، بۆرە سوورە، لۆ-لۆگەنە، سێوەڕە، هۆزەڵاو، گندۆڕ، سۆ، ئاغجەباشی، گیا سندە، بیزا و پیزەڵۆکە ئەوانە بۆ مەڕ خۆشن. ئەوانە لە جێگای چڕ و سەخت و دژوار دەڕوێن. مەڕدار دەبێ دوای دروونی هەمووی ئەوانە بە کۆڵ یا خێشک کۆیان کاتەوە و بیکاتە چەند جێگا و بە وڵاغ گێرەیان کا.



**گێرەی گزرە بە وڵاغی، وێنەگر لوقمان ڕەحیمی**

**ڕوون کردنەوە:** چەند وڵاغێک تێک دەخەن یەکیان دەبێتە بنە، ئەوی دیکە دەبێتە سەرە.ئیتر ئەو تفاقەی پێ ورد دەکەن و دەبێتە گزرە. کابرا هەڵی دەداتەوە، دەیکاتە کۆگە.) ئیتر ئەوکات لەو سەختەوە لە ڕەشکەدا دایدەگرێ و بە دوو نەفەر لە سەر وڵاغی دادەنێن و دەیهێننەوە بۆ ماڵێ. **ڕوونکردنەوە:** ڕەشکە وتاییچە، کەرەسەیەکە لە موو، لە مووی بزنی، موو دەیبڕنەوە دەیرێسن و دەیتەنن دەبێتە ڕەشکە.




«تايەی گيا»




«کادێن و سەوەتە»



لە وەڵاتی کوێستان کاروباری پێ جێبەجێ دەکەن و تفاقی پێ دەکێشن، لە پشتی وڵاغی دەنێن(ئێستر یا گوێدرێژ) بۆ ماڵێی دەهێننەوە. لەوێش لە پەنای نێو دێ لە قۆری(گیشە- تایە، کادێن) دەدەن. **ڕوونکردنەوە، کادێن:** ئەوەیە سەری دەگرن، پێنج، شەش بەرەچاوەیە، پێنج یا شەش نیرگە- کاریتە، وەسەر دەخەن، دیواری بڵیندی بۆ دروست دەکەن، سەری دەگرن، دە- دوازدە کۆڵەکەی وەبەر دەدەن، لە پشتەوە درگایەکی چکۆلەی بۆ ساز دەکەن، کا یا گزرە لەوێرا تێدەکەن. ئابەوە دەڵێن بارئەنداز، درگایەکیشی لە خوارەوە بۆ دروست دەکەن پێی دەڵێن درگای کادێن. لە زستاندا تفاق لەوێ یا لە قۆری بە سەوەتە، تەلیس یا ساقۆڕ بەوە دەیبەنەوە بۆ ماڵێ، پێی لەبەر وڵاغ و حەیوان دەکەن.



**«گیشه»**

قۆری بە شکڵی کەللەقەندی هەڵدەکەوێ. قەراغەکەی گیای لێ دادەنێن نێوەکەشی گزرەی تێدەکەن و دوایی سەرەکەی بە باقەیەک دەگرن- حدودەن وەکوو گومبەز. "ماڵی وایە ٤٠ ڕۆژ بە تفاق کێشانەوە دەبوو تا سەری قۆرییان دەگرت. ئەو کات بۆ سەر گرتنی قۆری خەڵکیان بانگ دەکرد." مەڕیان سەر دەبڕی. نەهاریان ساز دەکرد. ئەو چێشت و نانەیان دەدا بە خەڵک پێیان دەکوت سوورانەی قۆری. جا لەو حاڵەتەدا ئەگەر زستان زۆری مابایە و مەڕ زۆر لە ژوورێدا بایە دەوڵەمەند ترسی ڕێدەنیشت دەیکوت تفاق بەشم ناکا. لێم دەبڕێ خۆ ئەگەر دەوڵەمەندیش تفاقی لێ بڕا بایە کەس دەروەستی نەدەهات قڕی دەکرد. جا لەبەر ئەوە ڕاستە هەستی هاوکاری زۆر بوو و پێکەوە بوون و دەگەڵ یەک بوون بەتەواوی هەبوو و دەبیندرا. بەڵام تفاق بڕانی دەوڵەمەند بەڵایەکی گەورەیە. بۆیە دەوڵەمەند هەمیشە ڕۆژ ژماری دەکرد. لە چلە و هاتنەوەی لەکلەک و هاتنی بای وەعدە.

**ڕوونکردنەوە:** چلە، دوو چلەمان هەیە. چلە گەورە لە هەوەڵی زستانەوە دەست پێدەکا تا ١٠ ڕۆژ لە ڕێبەندان دەڕوا. ئەوە پێی دەڵێن چلە گەورە ٤٠ ڕۆژە. چلەچکۆلەش ٢٠ ڕۆژە ئەویش لە بیست و یەکەوە هەتا ئاخرین ڕۆژی ڕێبەندان ئەوە دوو مانگ زستان دەڕوا. ٤٠ ڕۆژ چلە گەورە و بیست ڕۆژیش چلە چکۆلە دەبێتە دوو مانگ زستان. دیارە بە تەواو بوونی چلەکان دەوڵەمەند دڵی خۆش دەبێ. قسە و نەقڵیشیان کوتووە بە چلەکانەوە لە قەدیمدا. بۆ وێنە:

١- چلە چکۆلە کوتوویە ئەگەر عومرم بە قەد کاکم بایە دەستی کابانم لە هەویردا ڕەق دەکرد.

٢- دووبارە چلە چکۆلە کوتوویە ئەگەر عومرم زۆر بایە سوارم بە سەر ئەسپەوە جڵغە دەدا. ئەو جار بای وەعدە کە شەماڵە مانگێکی زستان دەمێنێ بە ئارامی دێ (پێی دەڵێن بە دزییەوە دێ) بەڵام لە ١٨ی زستانەوە بە تەپڵەوە دێ ئەو کات دەوڵەمەند دەگەشێتەوە و دڵی خۆش دەبێ. چون بای وەعدە نوالان ڕادەماڵێ بەر ڕۆژ ڕەش دەکاتەوە. چڕۆ دەردەکەوێ بەفر نەرم و شەل و کەلێن کەلێن دەبێ. مەڕ دەردەکرێ و قنیات دەکا. لەکلەکیش لە ١٨ی ڕەشەمەوە دەگەڕێتەوە بۆ هێلانەکەی خۆی. یانی ئەگەر هەر دووکیان مابن دێنەوە. دەنا یەکیان دێتەوە دوایی ئەویتریان کە نەمابێ بۆی دێ، دەبنەوە دوانەکە. ئەویش موژدەیە بۆ دەوڵەمەند کە دەڵێن لەکلەک هاتەوە. **ڕوونکردنەوە:** دەڵێن لە زستان لەکلەک دەچێتەوە ئەو جێگا گەرمەسێرانە. کە ئەوکات پێیان دەکوت گەرمێن. دەمانکوت لەکلەک چووەتەوە گەرمێن. دیارە دوای ئەوانەش

مانگی ئاداره. که **دەڵێن له مانگی ئاداری/ بباریٚ هەتا گوێی داریٚ/ نامێنیٚ هەتا ئێواریٚ**. ده ڕۆژەی شوقاقیشی ماوه، دەوڵەمەند که لێی بترسیٚ، بەلام تازه ڕزگاری بووه. کاتێک شەماڵ بە تەپڵەوه دیٚ لەکلەکیش دێتەوه. خاڵه بەڵەک لەبەر ڕۆژ پەیدا دەبیٚ، سەهۆڵ له گوێخڕان و چۆمەڵ هەڵدەقەندریٚ، قاڕقاڕ دەبێتەوه. دەوڵەمەند ئۆخەی دێتەوه بەر پشوویەکی وەبەر دێتەوه و دەڵیٚ: بەهاری ژیان هاتەوه. **ڕنۆ شل دەبیٚ له نوالان/ تیشکی ڕۆژ دێته نێو مالان/ ڕۆچنه و کولانه دادەگریٚ/ شادی دیٚ غەموو تەم دەمریٚ.**

**ڕوونکردنەوه:** کاتێک بەهار دیٚ تیشکی ڕۆژ له کولاوکەی سەربانەوه دێته نێو ژوورەکانەوه، له قەدیمدا هەر به تیشک زۆرتر کاتی نوێژیان دیاری دەکرد و تەنانەت حیسابی مانگیشیان پیٚدەکرد چون دەیانزانی تیشک دەگەل ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا بوون زۆر عاقڵمەند دەیانزانی ساڵ چەندەی چووه یان بەهار و هاوین چەندەی ڕۆیوه و ئێستا لەبەین نستان و سیسێر، ناوچەی سەردەشت کێوێکی لێیه به نێوی کیوی «تەرازوان» که زانا و ڕدێن سپیەکانی ئەوکات و ئێستاش کات و سات و مانگی ساڵی پیر یادی دەکەن و دەزانن یان زۆر جاری وا بووه به سێبەر کات و وەختیان دیاری کردووه بۆ نوێژ و کارکردن. هەموو وێکڕا دەمانکوت شوکر بۆ خوا زستان ڕۆیی بەهار هات، نەهاتی ڕۆیی ئیتر خەڵکی دیٚ هاتن، وێکڕا هاوارمان دەکرد بەهاری ژیان هاتەوه، بەهاری ژیان هاتەوه.



**«چۆمی تەتەهوو (سیمینە) لە ڕابردوودا»**

ئەو بەفرە سەرەتای سێلاوێکی ماڵ وێرانکەرە بوو، ئەوساڵە کوێستانەکانی سەرچاوەی چۆمەکانی تەتەهوو و جەغەتوو لە بەفر ئاخەندرابوو و لەو لاوە کوێستانی میرخاسان، تۆرە، مەیدان چوغە، زەمزیران بەفرێکی زۆری گرتبوو دێتەوە چنگەڕنە و زەردەگڵی مووسێی قەڵاتی زاواکێو، کانی پۆڵا و بەردەڵۆ کە هیچ ساڵێک ئاوای بەفر تێنەکردووە ئەوانە سەرچاوەی چۆمی زەنبیل و قوڵەبۆزن کە لەبەر ماڵی قەرەگوێز وێک دەکەونەوە و دەبێتەوە چۆمی تەتەهوو«سیمینە» لەو لاشەوە کوێستانەکانی سەرچاوەی چۆمی جەغەتوو وەکوو قەڵاگای مێرگەنەخشینە، پیرچۆپان و کوڕەسووتێنی وزمەڵە، کێوی نەکەرۆز و ئاغجە و ئۆغجەی سەرشیو و ئەوانە لە بەهاردا ئیتر دەتەقین و هەڵی کردە با و باران، وڵات وەسەر ئاو کەوت کوێستان بەری دا سێڵاو هات لە بەهاری ١٣٥٣ ئەو لافاوە ماڵ وێرانکەرە هات کە لازمە لە مێژوودا بنووسرێ، دێهاتی گوێ چۆمی هەر بە جارێک وەبن ئاوی خست و وێرانی کرد ئەو دێهاتانەی لە گوێ هەر دووک چۆمەکان تووشی

ئـاوارەیی و زەرەدی گـەورە بـوون. وەکـوو دێهـاتی سـەرچۆمی تەتـەهوو، قـارەوا، قازڵیـان، میـراوا، عـەمبار دوو بەشـی زۆری وەسـەر ئـاو کـەوت. حسـێن‌مامە، قاڕنجـە، قەرەمووسـالیان، شـینآوا، سـەرچنار، پـردی سـووری میانـدواو هـەمووی ئەوانـە ئـاوارە و مـاڵ ڕووخـاو بـوون ئـەوە لـە چـۆمی تەتەهوو،«سیمینە»؛



**چۆمی بەرماڵی زاواکێو**

لـەو لاشـەوە سـاروقامیش، عـەسـکەرئابـاد، شـیناوا، قـانزالی، گۆیگجـەلـی، حاجیباد و هاتەوە دووبارە بن پردی سووری میاندواو لەو بەڵا گەورەیە بێبەش نەبوون. بەڵام خەڵکی شارەکان بە تایبەت بۆکان زۆریان یارمەتی دان و خۆیان لە نێو ئاو دەهاویشت تا نان و لیباس بۆ سێڵاو لێدراوەکان بگەیەنن بە تایبەت حاج سەید قادر حسێن ناسراوە بە حاج سەید قادر عەلاف ئیتر ئەو پەڕی فیداکاری و دڵسۆزی بە خەرج دا و لەو لاشەوە حاج ئەبووبەکر ئاغای موهتەدی بانگەوازی بڵاو کردەوە بە شار و دێهات و مزگەوت و مامۆستایانی ئاینیی ڕاگەیاند کە هەر کەسێ سێڵاو لێدراوە و

ئێوە بیناسن ئەمن ١٥٠ میتری زەمین لە شاری بۆکان دەدەمێ، ئیتر جەماعەتێکی زۆر لە دێهاتی سێڵاو لێدراوەوە دەهاتن زەمینیان وەردەگرت ماڵیان لێ دروست دەکرد و تێدا دەحەسانەوە.حاجی ئەبووبەکر ئاغا بەو بەخشینە زۆری فەقیر و هەژاری دێهاتی لە تەنگانە ڕزگار کرد. ئەوە بوو ساڵی بەفرە زۆرەکە و سێڵاوەکەش کە مێژوویەکە لە مەڵبەندی کوردوستانی ئێران بە تایبەت لە ناوچەکانی سەقز، بۆکان و میاندواو و ئەوە ساڵی سێڵاوە زۆرەکە بوو کە شوێنەوارێکی زۆری لەسەر ژیانی خەڵکی ئەو ناوچانانە دانا زۆرینەی دێیەکان چۆل بوون یان بوونە چەند پارچە وەکوو حسێن‌مامە بوو بە سێ بەش یان عەنبار بوو بە دوو بەش و بەشێکی چوونە کورەخانەکان و زۆریش بوون. و لە هەلۆەدایی و ئاوارەگی ڕزگاریان هات و حەسانەوە.



**«دێهاتی سێڵاوایدراو»**

**سەرچاوەکان:** ئەو قەدمییانەی لە بیریان بووە، کتێبی کاک سەید محەممەدی سەمەدی بۆ مێژووی مەهاباد. **١٩٠**

## مێژووی پەیدابوونی گەنم



بە درێژایی ژیانی بەشەر یەکێک لە خۆراکە سەرەکییەکانی نان بووە. بە هەموو بەشە جۆراوجۆرەکانییەوە نان کە پاڵاوتە و بەرهەمی گەنمە هۆی ژیان و مانەوەی ئینسانە تەنگ و چەڵەمەکانی ڕۆژگار و شەڕ و ئاژاوەکانی زەمان نیشانی داوە کە مرۆڤ بە بێ نان ناژی و نانە هۆی هێز و وورەی ئەو لە هەموو ژیانی و هەوڵ و تێکۆشانیدا. زۆرجار لە ڕابردووەکان بیستراوە و نووسراویشە کە سێ شت هۆی مانەوەی بەشەرە و بەرگری لە لەبەین چوونی دەکا، بە تایبەت لە کاتی تەنگانەدا. چ لە حاڵی ئاسایی و شەڕیشدا لە بەرابەر هەر ڕووداوێکدا هەتا ئەوانەی بووبێ تێنەشکاوە ورەی دانەبەزیوە. بەڵام هەریەک لەوانەی لێبڕابێ ئەویش لە بران هاتووە یا قڕی کردووە یا تێشکاوە:

١) نان ٢) ئاو ٣) ئاور. ئەو سییانە هۆی مانەوەی بەشەرە لە هەر حالێکدا.

نان لە گەنم پەیدا دەبێ بە هەموو جۆرەکانییەوە. لە مێژووی پەیدابوونی گەنمەوە تا دەبێتە نان. گەنم یەکێک لە هەوەڵین گیای کشت و کاڵییە کە دیندراوەتەوە و کەڵکی لێ وەرگیراوە و بە وەسیلەی ئینسان داچێندراوە و بەرهەمی لێ بەدەست هاتووە، مێژووی بە دەستهێنان و دۆزینەوەی گەنم ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ١٢ هەزار ساڵ پێش میلادی مەسیح.



**«نان و ڕفیدە، تیرۆک، ئەنگوتکی نانی»**

دەستپێکردن و پەیداکردنی تووی گەنم بە کۆکردنەوەی چین و تویژەکانی گەنمی کێوی کە ئەمڕۆ لە دەستدایە و کەڵکی لێ وەردەگیرێ. لە بارەی جێگا و شوێنی گەنم مێژوویەکی ڕاست بە دەستەوە نییە. عومری مێژووی جووت و گا و کاری وەرزێڕی

دەورووبەری ۱۰۰۰۰ ساڵ لەمەوبەر دەبیندرێ، بۆ ئەو گەنمانەی کە لە چاڵەکانی ژارمۆ «jarmo» نزیکی شاری سلیمانیەی عێراق بە دەست هاتووە بە یارمەتی «کەربۆن ڕادیۆئەکتیو» توانیویانە نزیکی ۱۰۰۰۰ ساڵ عومری چاڵەکانی ژارمۆ«jarmo» گەنم دیاری بکەن کە هەیە و بووە. سەرەتای پەیدابوونی گەنم و نان و بە دەستهێنانی گەنم لە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیادا بە دەست هاتووە و لە ڕووی نووسراوەکانی سەدەی ۱۹ پێش میلاد لە سووریە نانی گەنم پەیدا بووە و ڕێگای وردکردنی بە ئارد و سازکردنی بە نان بیندراوە و کەڵکی لێ وەرگیراوە. هێرۆدۆت مێژوونووسی بە ناوبانگی یوونانی لە ڕاپۆرتەکەی کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ٥ پێش میلاد لە مێسر ئیشارە دەکا گۆڕستانەکانی مێسر و ڕوودی نیل دیوارێکیان هەیە کە شێوەی وەرزێری و کشت و کاڵی و بە ئاشیکردنی گەنم بە ئارد و دروستکردنی بە نان لەو زەمانەی پێشوو نیشان داوە و نووسراوە و ئاو و هەوای ئارامی دەورانی چاخی بەردین بۆتە هۆی داچاندنی گەنم، جۆ، هەرزن. مەعلوومە کە بەشەر لە سەرەتاوە گەنم و دەغڵ و دان و دانەوێڵەی بە شێوەی ئەورۆی بە کار نەهێناوە بەڵکوو کەڵک وەرگرتن لە دانەوێڵە و گەنم و خواردەمەنی بە سوورەتی دەنک و درشت خوراوە و قووت دراوە، شایەد هێندێک لەوانە سەر و بنیان ورد کردبێ دواتر ئیتر تێکیان هەڵشێلابێ«هێربێرت هووێر Herbert Hoover لە بارەی نان بۆ ژیانی بەشەر لە شەڕەکانی دونیادا کوتوویە هەوەڵین

قسەیەک کە لە شەڕ و بەربەرەکانیدا هاتۆتە پێش، زۆر زۆر گرینگی پێدراوە. هەوەڵیان چەک و تەقەمەنی بوو، دووهەمیشیان نان بوو. دیارە نان هۆی ژیان و مانەوەی هەر ئینسانێکە.

## مێژووی لێکۆڵینەوەی گەنم لە ئێران



لە هەموو بەشەکانی نانخواردن، کەم خواردەمەنی هەڵدەکەوێ، نانی دەگەڵ نەبێ و تێکەڵی نەبێ. جا بەو بۆنەوە بایخی نان و کەڵک و سوودەکانی بۆ لەشی مرۆڤ لە قەدیمەوە تا ئێستا پارێزراوە و ڕاگیراوە و ماوەتەوە.

لە کۆتایی ساڵەکانی ١٣٠٩ لە تاقیکردنەوە سەرەتایەکانی دانەوێڵە و تووی چاندنی زەوی و زار لە ئیدارەی تاقیکاری باغی فێردۆسی زانستگای کشت و کاڵی کەرەج بەکار هات و لە ساڵی ١٣١٤ ئیدارەی چاکسازی و ئامادەکردنی توو لە ئێران لە کەرەج داندرا لە سەرەتاوە دوکتور شنیدێر ئاڵمانی Schneider بە خۆی گرت، ماوەی شەش ساڵ لە لایەن ئیدارەی گەشتی وەرزێڕی لەوێ ماوە ناوبراو لە

ئاخرێکانی ١٣١٥ بۆ چاکسازی و ئامادەکردنی تۆو و کەرەسەی پێویست کە موناسب بێ دەگەڵ ئاو و هەوای مامناوەندی و گەرمەسێری وڵات هەڵسووڕانی پێویستی کرد. گەنمی شاپەسەند ئومید ڕۆشەنی و تۆوی جۆ لە کالیفۆرنیا بۆ کەشاوەرزانی دانیشتووی کەرەجی هێنا و گەنمی ڕیحانی و ئیتالیای بۆ ناوچەکانی وەرامین هێنا و لە نێو جووتیاراندا بڵاوی کردەوە.

بەرابەری ڕاپۆرتی عەلی ئەسغەرپوور لەساڵی ١٣٣٠ وەزارەتی کشت و کاڵی بە یارمەتی ئیدارەی پیشەی ئێران و ئامریکا بە شێوەی پێویست دەستیان کرد بە بڵاو کردنەوەی تۆوی گەنمی شاپەسەندی ئیتالیایی و ڕیحانی و جۆ و گەنمی ماکیان لە ئیدارات دەدا بە جووتیاران و تۆوی کەمپیت و ناحەزیان لێ وەردەگرتنەوە. ئەو تۆوە خۆماڵیەیان دەداوە بە ئیدارە ناوچەکە تا بە هەرزان بیدەنەوە بە جووتیاران بۆ نان و ئارد تا ساڵی ١٣٣٦ دەوامی بوو و لەو ماوەدا نزیکەی ٢٠٢٥ تۆن گەنم و جۆ لە بەشە جۆراوجۆرەکانی وڵات دەگەڵ گەنمی خۆماڵی ئاڵ و گۆڕ کرد.

لە ساڵی ١٣٣١ تا ١٣٣٣ دوکتور هێرمەن کوکوک[١] ئاڵمانی، بۆ بەرپرسی ئیدارەی تاقیکاری تۆو جۆراوجۆرەکانی گەنم و لە ساڵی ١٣٣٣ تا ١٣٤٧ پرۆفسور مودرا[٢] لێزان و کارناسی چاککردنی دەغڵ و دان لە لایەن وەزارتی کشت و کاڵی بوو بە بەرپرسی تایبەتمەندی

---

١ Kukuck Herman

٢ Mudra

تۆوەکانی گەنم لە ئێران و هەوەڵین نەفەری ئێرانی کە دەستی بە چاکسازی تۆوی داچاندن کرد، خودا لێخۆشبوو ئەحمەد حوسێن عەدڵ بوو بە وەزیری کشاوەرزی. دوای وی ئەندازیار(مهەندیس) مەنسووری عەتایی کە مامۆستای زانکۆ بوو نزیک بە ٣٠ساڵ لەسەر گەنم و بەشەکانی تۆو کاری کرد و دواتر مهەندیس ئیسماعیل قەرەباغی کارەکانی تەواو کرد و لە ساڵی ١٣٤٥ واریدی لێکۆڵینەوەی زانستی گشتی جیهانی بوو«سازمانی جیهانی کشاوەرزی» Simmyt بەشەکانی جۆری گەنم کە ئێستا بە دەست وەرزێڕانەوەیە کە نێویان دەبەین: گەنمی سەرداری، گەنمە شووشە، گەنمە ئامریکا، گەنمە زەڕین، گەنمە بەهاروو، گەنمە گوڵرووت، گەنمە سمەوەچ، گەنمە ئالوەند، گەنمە سپی، گەنمە گوڵپەرشە، گەنمە سەبەلان، گەنمە مەلا، گەنمە ئازەری یەک، گەنمە ئازەری دوو، ئەوە مێژووی پەیدا بوونی گەنم و جۆری گەنمەکان بوو.

## شێوەی تۆو داچاندن و کێڵانی زەوی



**«گای جووتی»**

**زەوی کێڵان:** ئەوکات دیارە بە وڵاغ بوو کە پێیان دەکوت جووت. ئەوە لە هەوەڵەوە بە گوێدرێژ بوو. دواتر بووەتە وڵاغەبەرزە بوو. تا ڕۆژێکی ئیمپراتوری ڕۆمی بە نێوی «ئوکالێکولا» تەواوی ئەسپەکانی ڕۆمی بۆ پێویستەکانی شەڕ کۆ کردەوە ئیتر لەوەوە بڕیاری دا کە جووت بە ئەسپ نەکرێ. دوای ماوەیەک ئەوجار لە ئێران ڕەشەوڵاغیان، ماڵی کرد «حیمایەت» لە ناوچەی خوراسانی گەورە گایان فێری جووت کرد و بوو بە شوێن. **جووت دوو کات هەیە. یەک)** پاییزان **دوو)** بەهاران و **کێڵانیشی** دوو جۆرە. **یەک)** شێو **دوو)** وەرد.




**تـــۆوی بـــەهـــاران ئـــەوانـــەن:** پـــەڕش، نـــۆک، نیســـک، گـــەنمـــە شامی(سـەرداری)، گوڵـە بـەڕۆژە، پۆڵکـە، شـەمێلـە، ماش، بێستانە دێم، زەرحات، توتن، تەماتە، یەڕەڵماسی، چەوەندەر و چەند شتی دیکە کە ئێستا پەیدا بووە. دیارە چاندن و چەقاندنی هەر یەک لەوانە ڕێوشوێنی خۆی هەیە و کەرەسەی پێویست بە خۆی هەبووە و هەیە. کاتێک جووتیار دەڕوا بۆ سەر زەوی، خەتێکی دوور و درێژ لەو سەر و سەری زەوێکە دەدا دواتر بەین بەین خەتی دیکە لێدەدا ئەبەوە دەکوترێ **خەت و کووز**. ئەوجار ئەو کووزانە تۆوی پێوە دەکەن ئەو سەر و سەری کووزەکان پێی دەڵێن **هۆگان**. کۆتایەکەی پێی دەکوترێ سەری هۆگان. ئەو تۆوەی کە بە عەرزەکەوە دەکرێ هەر چی بێ پێی دەڵێن تۆو. دەبێ کەسێکی لێزان و تایبەتی تۆو بچێنێ کە پێی دەڵێن **«تۆوچێن»**. تۆوچێن توربێنێک یان دەسرەیەک دەکاتە بەرکۆش و تۆوەکەی تێدەکا، لە سەری کووزەکەوە دەهات لە لای چەپەوە دەهات

زووزوو دەڕۆی و مستێکی گـەنـم یـا هـەرچـی بـا دەردێنـا و بـڵاوی دەکردەوە دەڵێن دەی‌پڕژاند، ئەوەی دەی‌چاند دەبوو تۆوەکە نە زۆر بێ کە پێیان دەکوت: **پڕە**. نە کەم بێ کە بە ویشیان دەکوت: **تـەنکـە**. دەبوو هیچیان نەبێ دیارە ئەو کەسەی بە دەستی چەپە تۆوی چاندبا



**دێراو هەڵدان و کەردووکێشان، وێنەگر ئەحمەد یاسینی**

دەیان‌کوت: چەپەیە. زۆریش دەکوترا کە تۆو چاندنی چـەپـە تـەنکـە. تۆوی زەوی بەراو دەبوو پڕتر بێ لە زەوی دێمـەکـار. کـابرای تـۆوچێن کاتێک تەواو دەبوو دەیکوت شـەش کـووزەم چانـدووە. ئـەو گـایانـەی کـە جووتیـان پێدەکرێ جـا کـەڵ بـێ یـان گـا، دەبـوو بـاش بـەخێو بکرێ و زۆرباش بلەوەڕێن. لە مانگێک بـەهـار دەبـوو دەگـەڵ کەڵـەبـاب خوێنـدنی پارشێوێ دەریان کەیە دەرێ، ئەبەوەیان دەکوت گـا دەرکردنـەوە و کـە دەچووە سـەر لەوەڕی شینە؛ دەیان‌کوت کەڵ و گا تەڕ کراونەتەوە یـانی لە گیا دەلەوەڕێن. دەبوو بیان بەنە جێگایەک کـە گیـای زۆرە و لـەوەڕی خۆشـە، وەکـوو: گـوێ جۆگـە، قوڵاغـان، نێـوان گـەنمـان، قوونـە مێرگـان

بلەوەڕێن. هەتا زەردە لە سەرانی دەدا جا لە جووتیان دەکردن بەوەیان دەکوت جووت دابەستن.

لە تۆو داچاندندا دوو بەش هەبوو کە باسمان کرد بەهارەکیڵ و پاییزەکێڵ و لە پاییزە کێڵیش‌دا دوو بەشە: **ویشکەورد و ڕەپستە؛** ئەویش ئاوایە مانگێکی هاوین دەمێنێ ئاو لە زەوی دەگرن کە بەوە دەڵێن ئاوی لێ ئاژن دەکەین. ئەویش ئەگەر کانیاو بێ و هەر ئی خاوەن مووچە بێ ئەستێری بۆ دەگرێتەوە تا پڕ دەبێ ئەگەر پڕ بوو، بەری دەدەن زەوێکەی پێ دەدێرن بۆ ئەوە دەیکوت کەشاو دەکەم و ئەگەر بەنداو یا چۆماو با لە نۆبەی خۆیدا دەی‌داشت دوای داشتنەکەی کەمێک زەرد هەڵگەڕابا دەیکوت کەشی هاتۆتەوە ئیتر تۆوی پێوە دەکرد دەی‌کێڵا دواتر دەبوو ماڵوو بکرێ ماڵووش دارێکی ئەستوور، لابەلا دێنن بە دارێکی دیکە بە دووی گایان ڕادەکێشن بۆ ئەوەی عەرزەکە ڕێک و پێک بکا. ئیتر دوای چەند ڕۆژ شین دەبێ، بەوەی دەڵێن ڕەپستە. دیارە ڕەپستە دەبێ ئاو بدرێ کە پێی دەڵێن بەراو و ئەوەی ئاوی پێدا دەچێتە سەر گەنمەکە، نێوی جۆگەیە؛بەریان، بەربەست، کەوچکە، کەردوو، قەمتەرە، بەند، جۆگە، ئەستێر، شێلەگە ئەوەی دەڕواتە نێو گەنمەکەوە، **کەلوو یا بەریانی پێ دەکوترێ.** ئەگەر گەنم هات لە عەرز جودا بووە دەڵێن پنجی کردووە. ئەگەر کەمێک گەورەتر بوو دەڵێن مەرەخۆرە بووە. ئەگەر بڵیند بوو دەڵێن لە قەف و گوڵدایە یان کەروێشکەی دەکا، دێتە ئەوەی دان بگرێ دەڵێن دانی گرتووە یان کاتی داناوێتی(ئاو دانێتی)، ئەگەر دانی دەگرێ بەڵام زۆربە دەڵێن شلکە یا شیری تێدا ماوە کەمێکی

دیکە توند دەبێ دەڵێن فەریکە بووە و ئەگەر سپی هەڵدەگەڕێ دەڵێن گەیشتووە دەبێ ئەوە بزانین جووتی کەڵان یان گایان بە دوو دار دەکرێ کە نێویان نیر و ئاموورە ئاوانیش ئاوان. **نیر** دارێکە لە بی چۆمی، کە پێیدەڵێن دارەبی لە داری بنتا، یا سەختە دارێکی سووک وەک دار بناو ساز دەکرێ، ئەو سەر و سەری لایە دوو کونی تێدەکەن هەر کونەدارێکی نیو گەزی تێدەخەن زۆرتر لە داری بڵالوک یان داری لاوێن؛ ئەوانە ملی گایەکەی تێداوێن نایەتە دەرێ بەو دوو دارە پێیان دەڵێن کەڵەوە. لە بن ملی گایەکە بەنێک قایم دەیبەستن بەو بەنەش دەڵێن بەنکەڵەوە، نێوەڕاستی ئەو نیرەش قایشێکی تێدەخەن. سەرێکی ئاموورەکەی پێوە وەسڵ دەکەن، کونێک لە سەری ئاموورەکە کراوە دارێک لەو کونە دەخەن نیرەکە و ئاموورەکە بە یەکەوە قایم دەکا بەو دارە دەڵێن **سەرمژانە یا سەرگاینجە** بۆ ئەوەی لە قایشەکە نەیەتە دەرێ.



**«جووت و گا و نیر و ئاموور»**

نێوەڕاستی نیرەکە کون دەکەن، دوو داری چکۆلەی تێدەخەن سەرێکی قایشەکەی پێ قایم دەکەن بەو دوو دارە دەڵێن نێونیرە یان سەرکڵاوە؛ ئەوە نیر. **ئامووریش** ئەلەوانە پێک دێ، دارێکی درێژ دێنن پێی‌دەڵێن باسکێش دەبێ داری بی چۆم یا چناری سپی بێ، سەرێکی چەند کونی تێدەکەن یەکیان قایشی نیرەکەی تێدەکەن سەرەکەی دیکەش دارێکی دیکەی بۆ ساز دەکەن لە بەڕوو یا داری سێوەتاڵ پێی‌دەڵێن دەندە، دەندە ئەوەیە گاسنی تێدەخەن؛ گاسنیش ئاسنێکی نووکتیژە عەرزەکە دەکێڵێ هەموو لە لای ئاسنگەر تیژی دەکەنەوە پێی‌دەڵێن دمەزەرد. باسکێش بە سێ جێگای دەندەوە لێک دەدردێ و وەسڵ دەکرێ. **یەکیان** دارێکی درێژە پێی‌دەڵێن **پاشبارە**؛ پاشبارە نزیکەی نیوگەز لە باسکێش و دەندە بڵیندترە، دەسکێکی پێوەیە، جووتیار دەستی پێدەگرێ لە کاتی جووت کردندا بەوە دەکوترێ دەستەمستە. **دوو** دارێکی دیکە لە بنەوە لە دەندە هەڵدەکێشن لە باسکێش دێتە دەرێ بەوەش دەکوترێ **شیلەپە**؛ دیارە ئەوە زۆرباش دەندە و باسکێش بە یەکەوە وەسڵ دەکا.

دارێکی چکۆلە لە کونێک دەخەن کە لەبن دەندە و لەسەر باسکێش بۆی ساز دەکەن. بەوەش دەکوترێ **بەڕووڵە. سێهەم** لەبەین دەندە و باسکێش کە پێکەوە جووتن لە لای ئاخری دەندە کە پێی‌دەڵێن پشتی دەندە باسکێش و دەندە باش پێکەوە قایم دەکا پێی‌دەڵێن **خەزێنە**.

ئەوەی جووتەکە لێدەخوڕێ پێی‌دەڵێن جووتیار و ئەگەر جووتەکەی خراپ کێڵا دەڵێن پەڵەی دەداتێ، ئەگەر ماندوو بوون، گایەکان ڕادەگرێ

دەڵێن پشوویەک یا وچانێک بدەن. جووتیاریش دارێکی درێژی پێیە سەرێکی بزمارێکی تێدایە پێیدەڵێن **نەقیزە**. سەرەکەی دیکەش ئاسنێکی پانی وێدەخەن بەوەش دەڵێن **مەساسە**. لە سەری هۆگانێ دەندە و گاسنەکەی پێ پاک دەکاتەوە کە قوڕی پێوە دەنووسێ. بۆ جووتی کەڵان، قایشێکیان تێک دەهاڵاند دەیان هۆنییەوە دارێکی لە دەستان خۆشیان بۆ کون دەکرد تێیان دەخست ئەبەوەشیان دەکوت **خەرەزەنیکەڵان.** کەسێک جووتی هەبا، و زەویشی هەبا، کانی یا جۆگە یان نۆبە ئاوی هەبا، ئەبەوەیان دەکوت جووتبەندەی بەراوکێڵ یا هەر جووت بەندە. دەنا کەسانێک هەر دێمیان هەبا، نە ئاویان هەبا نە نۆبەئاو، ئەبەوەشیان دەکوت **لاکێڵ یا دێمەکارکێڵ** و کەسانێکی دیکە هەبوون لە ئاوەدانیدا کە ئەوانە هیچیان نەبوو نە دێم و نە بەراو ئەبەوەشیان دەکوت ڕەشایی، قەرە، خۆشنشێن. بەڵام هەمووی ئەوانە پێکەوە ڕێک و پێک بوون. جووت بەندە، زۆری چاوەدێری ڕەشایی دەکرد لە گەنم و جۆ و دانەوێڵەو ڕۆن و پەنیر و جاری وابوو بزنەدۆغەشیان دەدانێ. ڕەشاییش ئەوکات یاریدەی دەوڵەمەندی دەدا، ڕۆژەکاری بۆ دەکرد، سەربانی دەگەڵ دەماڵی، دروێنە و گیا و تفاقی دەگەڵ خڵاس دەکرد، ئاوداشتن و گێرە و مەڕبڕینەوە و زۆرێک لەوانە. ئەوە بوو بەحسی جووت و گا و گەنم و دەغڵ و دان لە ڕابردوودا. مێژووی جووت و گای مەحەللی لە ئێران و لە دەرەوە دەگەڕێتەوە بۆ زۆر لەمەوبەر لە هێندێک ناوچەی ڕۆژئاوای ئێران بۆ کێڵانی ئەو بەندەن و چرۆ و لێژانە کەرەسەی عەرزکێڵانی زۆر سەنگینیان بە کار

هێناوه. شەرەفخانی بدلیسی کە نووسەرێکی فارسیزمانە و بەڵام کوردە و نووسەری شەرەفنامەیە، دەڵێ بۆ کێڵانی زەوی نیر و ئامووریک کە لە ناوچەی ئەرمەنستانی ڕۆژئاوا بەکاریان هێناوه بە چوارگای نێر و گامێش ڕایان دەکێشا.

هەر بۆیەش ئەوکات هەموو کەس دەسەڵاتی نەبووه ببێتە جووتبەندە، چونکە گای جووتی بۆ نەدەکڕدرا. فێردۆسی شاعیری ناودار پەیداکردنەوە و دیتنەوەی کێڵانی زەوی بە گا و جووت بە هووشەنگ نیسبەت دەدا. **سەعالەبی** لە داستانێکدا دەگەڕێتەوە دەورانی ساسانی بە کشت و کاڵی ئیشارە دەکا کە دەڵێ زەوی و زارەکانی خۆم بە جووتێک گا دەکێڵاو دادەچاند. قابووسی وەشمگیر نووسەری قابووس‌نامە و وەسییەت بۆ کوڕەکەی دەکا بە نێوی گیلانشا دەڵێ: ڕۆڵە هەمیشە دوودانە گای چاکت لە مەزراکەتدا هەبێ و ڕایگرە و زەوی پێ بکێڵە و ماڵت بێ گا و جووت نەبێ. **دوکتور زەکی محەممەد حەسەن** لە مێژووی پیشەسازی ئێراندا دوای ئیسلام بەو جۆرە لەسەر پێشکەوتی پیشەسازانی ئێران قسە دەکا و دەڵێ: ئەگەر بڕوانینە ئێران زۆر لە ڕۆژهەڵاتەکان لە پێشترە و دەستکەوتی جۆراوجۆری کەشاوەرزی بە دەست هێناوه لە ڕابردوودا و کێبەرکێ دەگەڵ بابل، ئاشوور، مێسر، هێند و یوونان کردووە. و زۆریشی پێشکەوتن بە دەست هێناوه لە هەمووی دەورەکانی قەدیم و نێوەڕاست لە وڵاتاندا بڵاو بۆتەوە و جێگای ڕەزامەندی خەڵک و وڵاتان بووه. بە نووسینی شاردین دونیاگەڕی(جەهانگەرد) فەڕانسەوی دەڵێ: ئێرانییەکان لە دوای

هەر کێڵانێکی زەوی لە دەورانی سەفەوەیەکان بە بێڵ و پێمەڕە عەرزەکەیان ڕێک و پێک دەکرد جا تۆویان پێوە دەکرد. نەما دومان سەیاح دونیاگەڕێکی زانا بووە دەڵێ: لە سەدەی ١٧ لە ئێران، ئەمن خەرمەنکوبێکم دیوە. ئێران لە ڕابردوودا بێشکەی پێشکەوتن و زانین بووە لە هەموو بارێکەوە بە تایبەت لە ڕوانگەی کەشاوەرزی و کشت و کاڵییەوە. بە جۆرێکی وا زۆربەی سەرکەوتنەکانی کەشاوەرزی و پاتاڵداری وەکوو بەخێو کردنی ئەسپ، دروستکردنی باغ و باغات دەبێ لە نێو چاوانی ئێرانییەکانی بناسێنین. لە لێکۆڵینەوەیەکی ژێرزەمیندا کە لە تەپپەی سەیاڵەکەی کاشان بە عەمەل هاتووە، نیشان دەدا کە دەوروبەری ٦٠٠٠ هەزار ساڵ پێش لە ئێستا جووت و گا و کەشاوەرزی لە نێو خەڵکی ئەوێ ڕەسم و ڕەواجی هەبووە و ئێرانیانی پێشکەوتوو قەڕنها لەمەوبەر لەو ڕێگایە کاریان کردووە و هەروەها لە شکڵێکدا (وێنە) لە ڕووی ئوستوانەیەک کە لە شاری شووش بیندراوەتەوە مەعلووم بووە کە سێ هەزار ساڵ لە پێش میلادی حەزرەتی عیسا کە خەڵکی ئێران گەنمیان لە چاڵ و کەندوو کردووە و عەنباریان کردووە، هەڵیان گرتووە و هەم وێنجە، ئەو تفاقە خۆش و بە کەڵکەیان بۆ حەیوان و پاتاڵ لە ئێرانەوە بۆ یونان بەڕێ کردووە و لە پاشان بۆ ڕۆم و باقی دیکەی دونیا ناردووە. دیارە ئێستاش لە ناوچەی دوور و سەخت و چڕەکان هەر لە گا و نیر و ئاموور بۆ کەشاوەرزی و نان پەیداکردن کەڵک وەردەگرن.

## شێوەی جووت و گا لە ڕابردوودا لە دەورەی ئێران

نزیکەی هەزاران ساڵ پێش میلادی مەسیح جۆرێک لە جووت و گا هەبووە. عەلی شا٩٠٠ ساڵ پێش میلاد مووەفەق بووە کە زەمین بە نیر و ئامووریک بکێڵێ کە بە دوازدە گا ڕایان دەکێشا. هەر بەو جۆرە لە ساڵی ١٦٥٠ پێش میلاد بە وەسیلەی ٥ گای دەبە(گای نێری نەخەساو). لە ڕۆژهەڵاتی تورکیە بیندراوە کە جووتی پێکراوە.

**مێژووی پەیدابوونی ماشینئالاتی کشت و کاڵی تازە:** داج لە بریتانیا لە ساڵی ١٧٣٠ گاسنی فەرنگی پەرە پێداوە. توماس جەفەرسۆن ئەویش لەوانە بوو کە گاسنی تازەی دروست کرد. دەستگای تۆو داچاندن بە وەسیلەی ئامریکا و ئینگلیس و فەڕانسە لە ١٨٥٠ دروست کراوە. لە حدودی ساڵی ١٩١٠ تراکتۆر بۆ هەمووی کارەکانی کشت و کاڵی ساز بووە. لە ساڵی ١٨٣١ دی. اس راکوڵ دروستکردنی مەکینەی گەنمە شامی بە سەبت گەیاندووە. لە ساڵی ١٨٩٢ برایان دەولی دەستگای تۆو چاندنی دەنکدەنکیان هێنا بازاراوە.

## کەرەسەی دروێنە



**«دروێنە بە مەڵەغان»**

لە ڕابردوودا وەک ئێستا مەکینە و کەرەسەی ئەمرۆی کشت و کاڵی نەبوو. هەموو شت بە ماشێن بێ و کەس پێوەی ماندوو نەبێ. کورد کوتنی ئەوکات نان بە هێزی شان و باهۆ پەیدا_دەبوو. یەک لەوانە دروێنەیە دیارە ئێستاش لە شوێنە شاخاویەکان هەر ماوە کە گەنم بە دەست و بە داس بدروونەوە.



**«داس و هەسان»**

**کەرەسەی دروێنە:** داس، ڕۆن، هەسان، کەڵەشاخ، «گوێدرێژ»، پاڵە، کەپر. کاتێک کە گەنم سپی هەڵدەگەڕێ ئەوە کاتی دروونەوەیەتی. لە ڕابردوودا دەبوو بە داس و دەست بدروێتەوە ساحەب گەنم چەند نەفەری پەیدا دەکرد یا بە ڕۆژ و مانگ بە کرێی دەگرتن، یان ئاوا دێمێکی دەدانێ، بیدروونەوە کە ئەبەوانەیان دەکوت **پاڵە**. ئەوەش کە بەکرێ دەگیران پێیان دەکوت کرێکار. ئەگەر تا پاییزیش با دەیانکوت ڕەنجبەر(پیاوبەر یا نۆکەر). ئەوە کە ئاوا پەڵەگەنمێکیان دەدوورییەوە، دەیانکوت دێمێکیان درووەتەوە بە **بڕیە** (قەبەڵ) بەو دێمەش دەکوترا پەڵە گەنم. بەو پیاوانە کە دەچوون بۆ دروێنە. پێیان دەکوتن دروێنەوان، بەوەی سەرەوەیان دەکوت سەرپاڵە. بەوەی نێوەڕاستیان دەکوت نێوپاڵە، بەوەی خوارەوەشیان دەکوت قوونپاڵە یا بەرپاڵە.

دوای تەواو بوونی دروێنە پاڵە دوو ڕۆژ دەحەساوە، نەهاریان دەدانێ. بەوەیان دەکوت



سوورانە یا سەربڕانەی دروێنە. ئەوەی کە پێیان دەدوورییەوە داس بوو ئەگەر پاڵە داسەکەی لە گەنمەکە دەخست و دەیبڕی، بەوەیان دەکوت گەوزی تێدەخا کە پڕ بە مستی دەدروو بەوەشیان دەکوت سواڵە. چەند سواڵە لەسەر یەک دادەندرا بەوەشیان دەکوت مەڵۆ، چەند مەڵۆ لەسەر یەک دادەندرا دەیان کردە باقە و نیوەڕۆ یان ئێواران باقەیان دەکێشاوە لەسەر یەکیان دادەنا بەوەشیان دەکوت گیشە یا تایە، ئەگەر پاڵە ناشتای خواردبا بەوەیان دەکوت قاوەڵتووی پاڵە. بە نەهاریشیان دەکوت پاڵە چوونە جەمی نیوەڕۆیە بە عەسرانەشیان دەکوت جەمەخوێریلە. ئەگەر داسیان تێژ دەکرد دەبوو هەسانیان پێ بێ، هەسان بەردێکی تایبەتیە. جا بەو تیژ کردنەیان دەکوت داس دەسوین یان داس دەساوین و بەو بەردەشیان دەکوت هەسان. ئەوەی باقەیان پێدەبەست پێیان دەکوت باقەبێن، بەو بەستە باقەبێنشیان دەکوت گوررزی باقەبێن.



**«باقە و پاڵە»**

**هێندێک لە کەرەسە و پێویستەکانی دروێنە:** پاڵە یا دروێنەوان کاتێک ئازا دەبوو دەیان کوت گەوزی زۆرە. ئەگەر زۆری بە دەستەوە دەبوو بەوەیان دەکوت سواڵەی قەڵەوە و ئەگەر زوو زوو دای‌دەنا هەر دەی‌دروو بەوەیان دەکوت تەڕەماڵە یان پاکۆ. ئەگەر کەسێک خراپی دروێنە دەکرد دەیان‌کوت پەرێزی پیسە و ئەگەری جوانی درووبا دەیان‌کوت دروێنەوانی چاکە، پەرێزی خاوێنە و گوڵ ناخا کەسێک لە سەرەوەی درووبا بەوەیان دەکوت سەردروویە. کەسێک لە بنەوەی درووبا بەوەشیان دەکوت بن‌دروویە. گەنم ئەگەر دەی‌چنن پێی‌دەڵێن تۆو، ئەگەر بە کشاو و بەراو بێ پێی‌دەڵێن ڕەپستە. ئەگەر دێمەکاریش بێ و شین بووبێ دەڵێن شین بووە لە چاو دەدا. ئەگەر کەمێک گەنم بڵند دەبێ، پێی‌دەڵێن کەروێشکەی دەکا، بە باڵای گەنم دەکوترێ کە بڵند دەبێ قەدی گەنم یان لاسکی گەنم. بە گوڵەکەی دەکوترێ گوڵی گەنم، دانی گەنم. بە درووەکەی دەکوترێ داسوو یا قەڵچەغ، قەڵتەس. بۆیە کەسێک نالەبار و شەڕانی دەبێ پێی‌دەڵێن: دەڵێی قەڵچەغی گەنمی، کەس ناوێرێ تخونت بکەوێ.

# ئەو گەنمانەی نانیان خۆش بوو



«گەنمی سوور»

زۆرتر گەنمی بەهاروو، سەرداری، سمەوەج نانی جوانیان لێ دەهات. نان بە تەندووری خۆماڵی دەکرا. ئاوری تەندوریش دار، تەپاڵە بوو.



**شەنەی خرمان هەڵاویشتن**

## کەرەسەی نانپێکردن ئەوانە بوون:



**«تەندوور و نانکردن»**

کابان، نانکەر، پنە، تیرۆک(وەردێنە)، ڕفێدە، کەوڵی نانی، ئاوردوو، نێوکەوڵی نانی.

**کابان:** ئەو ژنە یان نەفەرە بوو نانی دەکرد.

**پنە:** دارێک بوو لە داری گوێز ساز دەکرا، نانیان لەسەر پان دەکردەوە کە پێیان دەکوت تیری‌لێدان.
**تیرۆک:** دارێکی باریک بوو و زۆر جوان ساز دەکرا نانکەر نانەکەی پێ پان دەکردەوە؛ بەڵام وەردێنە ئەستوورتر بوو.
**ڕفێدە:** لە پارچە دروست دەکرا، زۆر ئەستوور بوو، کابان نانەکەی لەسەر پان دەکردەوە و بە تەندوورەکەوەی دەدا.
**کەوڵی نانی:** زۆرتر پارچەیەکی سپی بوو، ئارد و پنەیان لەسەر دادەنا.
**ئاوردوو:** دار و تەپاڵە بوو کە تەندووری سوور دەکردەوە بۆ نانی، نێوکەوڵی نانی ئاردبوو. تەندووریش لە قووڕ دروست دەکرا و نانی پێ‌دەکرا.

## کۆکردنەوەی گەنم دوای دروون



**«کۆ کردنەوەی گەنم یا کڵۆش»**

دوای خـواردنی سـەربڕانـە و دوو ڕۆژ حـەسـانەوەی پاڵـە ئیتـر خەریکی کۆ کردنەوەی گەنم دەبوون کە پێیان دەکوت کڵۆش. دیارە کڵۆش لە ڕابردووی زۆر دووردا بە گوێدرێژ، دواتر بە ئەسب ئەوجار لە ناوچەکانی خوراسانی گەورە و بەشێکی هێندوستان وەسیلەیەکیان هێنا کە پێیان دەکوت **«گاجەگ»** کە دیارە دەبێ خێشکی ئێمە بووە. لە کوردستان دواتر عەڕابەی کۆلکە پەیدا بوو دوای ئەوانە عەڕابەی ئامریکایی«گاریە» پەیدا بوو، ئەوە بە وەسیلەی کەڵ یان جووتێک گا ڕادەکێشرا و لە ماوەیەکی کەمدا کاروباری کڵۆشکێشانی تەواو دەکرد.



**تەگەری عەڕابە، وێنەگر ئەمین گەردیگلانی**

دیارە عەڕابە کاری دیکەشی پێدەکرا، کایان پێدەکێشا. گەنمی سووریان پێ دێناوە سەر چاڵ. لە پاییزدا دار و چرپییان پێ دێناوە بۆ سوختی زستان. ئەوجار دوای کۆکردنەوەی کڵۆش نۆبەی گێرەیە، دەبوو کڵۆش بەرنە جێگایەک یا چیمەن بێ یان زەوییێک بێ چاکیان کردبێ، بۆ جێی خەرمان بۆ ئەوەی نەقەڵەشێن و گەنمەکە خەسار نەبێ، نەچێتە قەڵەشت و کەلێنی عەرزییەوە. لە ڕابردوودا چاک و سوورکردنی دەغڵ و دان و خەلە و خەرمان دانەوێڵە و بەرەچێشت و دانەچێشت هەمووی بە گێرە دەکرا و جێبەجێ دەبوو.



**گێره بە وڵاغی، وێنەگر: لوقمان ڕەحیمی**

## گێره بە دوو بەش بوو:



**«گێرەی جەنجەڕ »**

**یەک)**. لە هەوەڵەوە بە وڵاغ بوو کە ئەوانە بریتییە لە ڕەشەوڵاغ، یەستر، گوێدرێژ کە پێیان دەکوت گاگێرە، چەند وڵاغیان تێکدەخست، یەکیان لە نێو خەرمان دەوەستا بەوەیان دەکوت **بنە**. ئەوەی دیکەش هەمووی دەبوو بە

دەوری ئـەودا هەڵسـوڕێن. دیـارە بـەوەی سـەرەوەیـان دەکـوت سـەرە. ئـەو وڵاغانە دەبوو چەڵەمەیان لە مل کەن تا گوریسی لێ گرێدەن پێکـەوە وەک زنجیرەیـەک. بـە شـووڵی دار یـان بـەن دەمیـان دەبـەسـتن، بـەوەیـان دەکوت دەمبێن. بەو وڵاغانەیان دەکوت گاگێرە و ئەوەی گێرەی لێ دەخوڕی پێیـان دەکوت پیاوی گێرە. جەنجەریش ئـەوە بـوو، دوو داری چـاکراو سـاز دەکـرا، نووکە ئاسنی تیژیان بۆ دروست دەکرد وەک دەمی تەشۆ کـە پێیـان دەکوت دەمەجەنجـەڕ. هـەر دارەی ٢٤ دانـە بـوو. دوو لای دار کـون دەکـرا، بـەوەیـان دەکـوت لاجامـەی جـەنجـەڕ، کورسـییەکیـان سـاز دەکـرد نـەفـەری لـەسـەر دادەنیشـت ئـەو گایانـەی جـەنجـەڕیان پێ دەکرت لێی دەخـوڕێن بـەوەشـیان دەکـوت کورسـی جـەنجـەر. ئـەوجـار دوای گێـرەکردنـی کڵـۆش دەبـوو بـە خەرمان، کە پێیان دەکوت«خۆیان» کە دەبوو بە خۆیان چـاوەڕێی بـا بـوون، ئەگەر بای هاتبا بە بایان دەکرد دەیانکوت: شـەنکردن، خەرمان هەڵداوین بۆ ئەو کارە شەنەی دار لازم بوو، شـەنە ئاسن، بێڵ، گەسک.



**«باڵەکەو کردن و گەنم سوور کردن»**

ئەو کەسەی کاری دەکرد دەیکوت شەن دەکەم، ئەگەر شەماڵ هاتبا ئەوە شەن بە شەماڵ بوو دەنا بە زریان بوو. ئەگەر گەنم سوور دەبوو پێیان دەکوت مالووسکە- مالوێنجە، ئەگەر دەبوو بە دوو دەیانکوت دوو مالووسکە مالوێنجەمان دەر کردووە. خەرمان سوور دەبوو هەڵیان دەدا نیشانەیان دەکرد پێیان دەکوت شەقڵ، بەوەشیان دەکوت کۆی سوور. ئەگەر لە هەڵاویشتن تەواو دەبوو دەیانکوت گەنمەکە سوور بووە یان لە کا دەرهاتووە، ئەوەی دەکەوتە بەر بایەکە کا بوو و ئەوەی لە گەنمەکە دەگیرا پێیان دەکوت **کوێزر**. بۆ گەنم چاککردن لەسەر خەرمان ئەوانە لازم بوون: بێژنگ، شێلگیر یا داژگیر، کەو. بۆ خاوێن کردنەوەی گەنم دەیانکوت باڵەکەو دەکەین، نەفەرێک گەنمەکەی باڵەکەو دەکرد ئەوەی دەهاتە خوارێ بە بێژنگ یان کەو گەنمی سوور بوو، ئەوەی دەماوە پێیان دەکوت سەرکۆتەڵ یان سەرکۆزەرە ئیتر ئەوە گەنمی سوور ساز دەبوو ئەوە ئامادەی بردنەوەیە کە پێیان دەکوت خەرمان هەڵگرتن. ئەمڕۆ خەرمان هەڵدەگرین، کاتێک گەنم لە کا دەهاتە دەرێ سوور دەبوو و هەڵدەدراوە دەبووە کوێ سوور، ئیتر کاتی هێنانەوەی دەهات بۆ ماڵێ.



**بۆ خەرمان هەڵگرتن ئەوانە پێویست بوون:** کیلە و دارکیلە، خەرمان پێو، جەواڵ، لینگە، تێر، هۆر، وڵاغ وەکوو یەستر، گوێدرێژ. بۆ ڕۆژی خەرمان هەڵگرتن خەڵکیان بانگ دەکرد. ساحەبماڵ لەوێ بوو، یەک نەفەری لێ بوو بە نێوی خەرمان پێو و پیاوی ئاغاش لەوێ بوو بە نێوی **سەرکار**، ئەوە دە-و-دووی دەکرد بۆ عەنباری ئاغای دەبردەوە، ئەو سەرکارە دەبوو کار نەکا. لە لای سەرەوە دانیشێ و سنگە مریشکیشی بۆ دابنێن، ئەسبەکەشی دەبوو جۆی بۆ دانێن، دەنا سەرکار تووڕە دەبوو. ئەوەی گەنمیان پێ دەپێوا لە دار ساز دەکرا بە نێوی کیلە بوو دیارە نیوکیلەش هەبوو، دارێکی چکۆلەشی دەگەڵ بوو بە سەرکیلەکەیان دادێنا بە نێوی دارکیلە کە کورت و خڕ و تایبەتی بوو و ئەگەر پێیان دادێنا دەیانکوت کیلەی پێ دارماڵ دەکەین و بەو حیسابانەیان دەکوت پێوان. ئەوجار دەهاتە سەرخەرمان، پێوان تا چل کیلە کە پێیان دەکوت داڵیە و ٤٠ کیلەش ١٠ تەغار بوو و هەر تەغاریش ٦٦ کیلۆ و هەر داڵیە و نیوێک خەروارێک و هەر خەروارێک

یەک هەزار کیلۆ بوو و لە هێندێک ناوچە پێوان بە کەویژ بوو و هەر کەویژ پێنج پووت بوو، هەر پووت ١٦/٥ (شازدە کیلۆ و نیو) بوو، هەر دوو کەویژ بارێک بوو و ١٠ پووت بوو.ڕبە، سیە، نیوسیە، سێی‌سابلاغ، مەن‌مەنی سەقز، درەم، گەروانکە، حەوت‌جۆش خەرمان‌پێو ئاوای دەستی پێدەکرد کە کیلەکەی پڕ دەکرد دەیکوت **یەک** خودایە بە تەنێ **دوو** بە ئیزنی توو دەیکەین بە تۆو، **سێ** بۆ خاتری ئایەت و حەدیس بەرەکەت لەو کۆگایەی برەخسێ. **چوار** هەر چوار یاری دەنەبی ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی **پێنج** بۆ خاتری هەر پێنج فەرزان گەنم و جۆ بکەی هەرزان. **شەش** ڕۆژی شەشەکانێ ئەگەر خودا دەکا دێوانێ، تکا دەکا پێغەمبەری ئاخرزەمانێ. **حەوت** خودای حەوت زەوی و ئاسمانێ بۆن بنێرە بارانێ. **هەشت** دایک و بابان بچێتە بەهەشت. **نۆ** بۆ خاتری نۆ نەبی، بە زیاد بی بە کەم نەبی. **دە** پەلێکە لەو چوارە سەر بنێتەوە بە هەزارە. **یازدە** کوڕانی حەزرەتی یەعقووب کە یوسف بۆیان بوو بە قەییوم، **دوازدە** لە دوازدە مانگی ١٠ سالێ گەنمان نەبڕێ لە چالێ. **سێزدە** پێیان وابوو نەخسە(شوومە، بەدقەدەمە) جا لەبەر ئەوە دەیان‌کوت زیادە بە کەم نەبی بە زیاد بی. **چاردە** کورەی زەوی و عاسمان لەگەڵ خودا دەیان‌کرد قسە و بەیان، **پازدە** لە پازدە ڕۆژەی شەعبانێ ڕۆزی بەش دەکرێ لە دێوانێ خودایە بۆمان زۆر کەی دەغڵ و دانێ.





دیارە تا چل کیلە دەیان پێوا و لەو حاجەتانەیان دەکرد کە باسمان کردن دەیانکوت ئەوە داڵیەک، دوای خەرمان تەواو بوون بە وشتر، گوێدرێژ، یەستر جاری وا بوو بە گاجووتیش گەنمەکەیان دەهێناوە ماڵێ و ئەوەی بۆ هەڵگرتنبا لە چاڵیان دەکرد، چاڵیش عەرزیان بۆ هەڵدەکەند لە وێنەی مەخروت «کەلەقەندی» یان دائیرە «بازنە» کایان لەبن ڕۆ دەکرد و گەنمەکەیان تێ دەکرد بەوەیان دەکوت **بنچاڵ**، چینچین گەنمیان تێدەکرد و کایان لە قەراغەکەی ڕۆ دەکرد بە دیواری چاڵەکەوە بەوەشیان دەکوت چاڵەمشتە ئەگەر تەواو دەبوو کایان بەسەر چاڵەکەدا دەکرد بۆ ئەوەی ئاو دانەدا و گڵی تینەوەری و لە پاشان بۆ مەحکەمکاری تەپاڵەشیان لەسەر دادەنا و گڵیان وەسەر دەکرد تا لازمیان دەبوو جا دەریان دەهێنا ئەوکات دەیانکوت چاڵ دەردێنین.



**کۆ کردنەوەی خرمان**

خەرمان هەڵگرتن زۆری دەرچوون دەبوو یەکیان سەرکاری ئاغا کە لەوێ بوو، سەرکار کە نوێنەری ئاغا بوو و بارگینەکەی دەبوو گەنمی سووری یا کوێزری بۆ دانێن بۆخۆی سنگە فروجوو، و لە سەرەوە دانیشێ و لێفەی بۆ دوو قەت کەن. دەنا لە لای ئاغا شەیتانی دەکرد. دیارە سەرکار پیاوی زۆر باشیان هەبوو.

**دووهەم** دوای دە-و-دووی ئاغا کە سەرکار دەیبردەوە بەراتی مەلا و مجێور و گاوان و شوان بوو. ئەویش هەتا کاتی بەرباکە نەیان دەدا، لە ترسی ئاغا وێرابای دەیکوت: «مەلام بۆ چییە نامەوێ، بێوی پەکم ناکەوێ مردووی خۆم تەڵقین ناکەم، نوێژیشی لەسەر ناکەم، بیشیدەمێ بە مەلا، چوار کیلە گەنمی بەربا، ئەویشم پێ زیادیە، لێم دەستێنن زۆریە، ئەمن زۆر دەوڵەمەندم، ببینە زێر و بەندم، کارم قەت جێنامێنێ، دەوڵەمەند دانامێنێ، دەنێرمە ساردەکۆسان، مەلا دێنم بە پێیان، ئەگەر مەلاشم بوێ، بۆ وەی پەکم نەکەوێ، لەبەر عەیبەی

دونیایە و خوێندنی فاتیحایە، سێ ڕۆژ لەسەر یەک دەبێ لە مزگەوتی بێ، وەباڵم بۆ بکێشێ، دەست لە ملی ڕاکێشێ، ناحەقم بۆ بە حەق کا، بە ئشتیای من شەرع کا، ماڵ لە خەڵک زەوت کەم، کچ لە ئیرس بێبەش کەم، ئەگەر زەکاتیش نەدەم، ڕۆژوو نەگرم و نوێژ نەکەم، دەر و جیران نەدوێنم، مزگەوتیش قەت نەبینم، نابێ نێوم بهێنێ، لە لای کەس بیدرکێنێ، من مەلام ئاوا دەوێ، ئاوا نەبێ نامەوێ، پووتێکم لێوەر ناگرێ، گەر لە برسانیش بمرێ». دیارە خەڵک ئەوکات وا نەبوون بەڵام بە داخەوە ئێستا زۆری وایە.

**سێهەم** کە لە خرمان دەردەچێ، خەرمانلۆغە و زەکاتە، خەڵکی قەدیم لەسەر خرمان زەکاتیان جودا دەکردەوە بۆ ئەوانە کە پێیان دروست بوو دەیان دانێ. خرمانلۆغە کاتێک دەزاندرا ماڵە حاجی ڕەحمان خەرمان هەڵدەگرن، هەمووی منداڵی نێودێ کۆ دەبوونەوە هەریەک بە توورکەیەکەوە دەڕۆی بۆ سەر خرمان بە دەنگ هاواریان دەکرد: «کۆیەکەو بە سەد تەغار بێ، بەشی ئێمە ماڵو ئاوا بێ. یان دەیانکوت: خرمانلۆغەی ئێمە بەرەکەتی تێکەوێ. حاجی ڕەحمان زۆری پێخۆش بوو هەمووی بانگ دەکردن دانەدانە بەڕێی دەکردن یان بە جام یان بە مست هیچی بێبەش نەدەکرد، وێکڕا بەشی هەمووی دەدا، ئەوانیش لەو لای خەرمانکە ڕادەوستان یەک دەنگ دەیانکوت: خودایە زۆری کەی ئەو خرمانە، بەشی مەی منداڵانە. دەهاتنەوە دەیاندا بە ترێ و میوە یان ماڵی وا بوو زۆر فەقیر بوو دەیخستە سەر یەک تا زۆر دەبوو، دواتر دەیفرۆشت بۆخۆی دەیدا بە لیباس.

ئەوجار کەم کەس دەما بۆ نان خواردن بانگ نەکرێ، حەیوانی چاکیان سەر دەبڕی بە نێوی سوورانەی خرمان، جاری وابوو بەشی شوان و گاوانیشیان نان و چێشت هەڵدەگرت.

**ئەوجار دەگەینە باراش یان زمهەڕ:** ئیوا بوو ساڵی دوو جار زمهەڕی دەکرد **یەک** بەهاران **دوو** پاییزان. مەگەر بەرکوتی کردبا، **بەرکوتیش** ئەوە بوو لە بەهاردا نان و گەنم کەم دەبوو و گەنم دەهاتە قەفوگوڵ چونکە ئارد تەواو دەبوو و گەنمی چاڵیش نەدەما گورج دەچوون پەڵەیەکیان گەنم یان جۆ دەدروو گێرەیان دەکرد دەیان برد بۆ ئاشی لێیان دەکرد بۆخۆیان و دەر و جیران ئەبەوەیان دەکوت: **بەرکوت.**

**باراش ئاوا چاک دەکرا:** گەنم کە لە چاڵ دەردەهات خاو بوو دەیانکوت نمی هەیە هەڵیان دەخست تا ویشک بێ ئیتر بە بایان دەکرد، گێژەویان دەدا جاروبار وەک تووتن لە تەتەڵەیان دەدا، سەرکۆتەڵەکەیان لێ دەگرت لە جەواڵیان دەکرد ئیتر بە شووژن دەیان درووو و لە بارخانەیان دەدا کاروانیان بۆ ساز دەکرد جا بە وشتر یان بە یەستر یان بە گوێدرێژ دەیانبرد بۆ ئاشی ئاوێ، ئەو شوێنانەی ئاشی ئاوی لێ بوو، دەچوون بۆ ئەوێ.

## مێژووی ئاشی ئاوی و ئاشی با

کەڵک وەرگرتن لەو کەرەسانەی کە دانەوێڵە و گەنم و دەغڵ و دان ورد دەکەن دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی زۆر لەمەوبەر کە ئینسان داچاندنی گەنم و دەغڵی زانی و دیاری کرد کاتێک ژیانی پێکەوە بوونی مرۆڤ دەستی پێکرد و گیاناسی بە ناوبانگی ڕووسی بە نێوی ان.ای. وایڵوف هەوەڵین داچاندنی گەنمی لە حدودی سەدەکانی ٥-٦ پێش میلادی مەسیح کە ئەوکات چاخی بەردین لیکولووسکراو بوو لە باکوری تورکیە نزیک ڕۆژاوای قەفقاز دەستی پێکرد و دواتر بڵاو بووە بە وڵاتاندا و پەرەی ئەستاند دوای ماوەیەکی زۆر لە ئێران بە وەسیلەی تێکەڵبوونی دەگەڵ گەنمی کێوی و گەنمی خۆماڵی گەنم داچاندن بەوجوود هات و ئەوە ئەو گەنمەیە کە لەبەر دەست دایە و ئێمە دەیکەین بە نان. لە ساڵی ٦١٢ پێش میلاد دەسەڵاتداری ئاشوورییەکان تێک ڕووخا ئیمپراتوری «ئاشوور» و شاری «سەوا» کە پایتەختی ئەوان بوو لە نێو بەڵای ئاوردا سووتا و دەسەڵاتدارێکی زۆر بە تواناتر و پان و بەرینتر هاتە سەر کار. ئەوان کە زەنجیرە پادشایانی ئێران بوون و تا قەراغی دەریای مەدیترانە چوونە پێش و پەرەیان بە دەسەڵاتی خۆیان دا. دروستکردنی ئاشی ئاوی و ئاشی بای بۆ ئەودەم دەگەڕێتەوە حکومەتی هەخامەنشی و دوای ئەوان ئەشکانیان و

دواتـر ساسـانیان کـە حکومـەتیـان کـردووە و دەسـەڵاتیـان بـووە بـۆ دروستکردنی ئەو کەرەسانەی کە هۆی خۆشگوزەرانی خەڵک بووە هـەنگاویـان نـاوە و پێویسـتی ژیـانی کۆمـەڵیان ئامـادە کـردووە ئاشـی ئاویان بۆ وردکردنی گەنم دروست کردووە و جاری وا بووە ئاشی ئـاوی و بایـان بۆ دەرەوەی وڵات نـاردووە وەک مێژوونووسـان دەڵێن کە ئەبوولۆء لۆء فیرووزی ئێرانـی هێندێک لـە مێژوونووسـان دەڵێن بـە دەستی سپاهیانی ئیسـلام لـە شـەڕدا دەستگیر کراوە و بردوویانـە بۆ لای حەزرەتی عومەر ئەویش ئازادی کردووە. هێندێکیش دەڵێن خـەڵکی نەهاوەند بووە لـە شـەڕی ئێران و ڕۆم ئـەسیری ڕۆمیان بـووە. دواتـر دەست بە دەست وەک ئەسیر و عەبدێک فرۆشراوە تـا دەگاتـە دەسـتی یەک نەفەر عەرەب بە نێوی «موغەییەربن شـەعبـە» ئـەو کـڕی فیرووز نەققاش و ئاسنگەری وارید بوو لە مەدینە کاری بۆ خەڵک دەکرد.



**ئاشی ئاوی**

ئاغاکەی ڕۆژانە دوو درهەمی لێ وەردەگرت لەو کاتەدا حەزرەتی عومەری بەنی خەتاب لە مەدینە خەلیفە بوو. فیرووز چوو شکایەتی لە ئاغاکەی کرد لە لای عومەر کوتی: موغەییەرە زۆرم لێ دەستێنێ. حەزرەتی عومەریش پێیکوت گویا تۆ کوتووتە من ئاشی بە با ساز دەکەم. فیرووزیش کوتی: بەڵێ ئەی ئەمیرولمۆئمنین. حەزرەتی عومەریش کوتی: کرێی ڕۆژانەی تۆ کە دوو درهەمە بە زۆری نازانم ئیتر فیرووز ڕووی تێکرد و کوتی ئەگەر بمێنم ئەی عومەر دەبێ ئاشێکت بۆ ساز کەم کە ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا باسی بکەن. ئیتر حەزرەتی عومەر هاتەوە ماڵێ و کوتی ئەو ئێرانییە هەرەشەی لێکردووم کە بمکوژێ. ئەوجار بۆ سبحەینێ ئەو ڕۆژە فیرووز درۆشەیەکی دوو سەری هەڵگرت لە نوێژی بەیانیدا حەملەی بە عومەر کرد شەهیدی کرد. هەروا میسرێکان نزیک بە هەزار ساڵ پێش میلادی مەسیح لە ئاشی ئاوی بۆ وردکردنی گەنم و جۆ کەڵکیان وەرگرتووە و هێندێک نووسیویانە دوو هەزار ساڵ پێش زایین و ڕۆمیەکانیش حدودی ٥٠٠ ساڵ پێش زایین و گەولها «Gaule» ئوروپا و بەشێک لە خەڵکی فەڕانسەی ئەمڕۆی کەڵکیان لە ئاشی ئاوی و سەنگی دەستی بە نێوی دەستار وەرگرتووە و دواتر بە بەرداش«هیپر بلۆئید» کە غەڵتەکی پێدەڵێن کاریان دەکرد و بەرەبەرە ئاشی ئاوی و ئاشی با پەیدا بوو بە تایبەت لە ئێراندا و ئەوە نیشان دەدا کە




**«بەرداشی ئاشی ئاوی»**

ئێرانی چەندە لە پێشکەوتندا بوون. لەو سەردەمەدا ئیرانییەکان سێ جۆریان ئاشی ئاوی بە کار هێناوە. **یەک** ئاشی تەنوورە یان ئاشی نەرەس، ئاشی پەڕە ئەوە لەسەر پایەی ڕاست، بەڵام پەڕەکانی لەسەر وێنەی کەوچک. **دووهەم** ئاشی گەڕان و هەڵسووڕان کە ڕۆمیەکان ئەبەوەیان دەکوت ئاشی وتیرویان. **سێهەم** ئاشێک بوو لەسەر گەڕانی لابەلا دەبوو دیارە وەستا و سازکراوەی یەک نەفەر بووە بە نێوی مێهرداد و بە سەبت گەیشتووە. و ئاشێکی دیکەش هەبووە کە ئاشی مەلەوانیان پێدەکوت«شناوەر» کە پەڕی گەورە وەکوو بێڵ هەڵسوڕاوە ئەوە زۆرتر گویا لەسەر چۆمەکان و ئاوەکان دەبوو ئێستاش شوێنەواری لە شووشتەر ماوە لە زەنگەوێڵ و شاری زەنگەدا دەبیندرێ.

## مێژوو و کەرەسەکانی ئاشی ئاوی



**بەرداش و بانیژە**

لە ڕابردوودا جەماوەر بۆخۆیان گەنمیان دەکرد بە ئارد و ئاردیان دەکرد بە نان کە بەوەیان دەکوت باراش یا زمهەڕ و چونکە هەمووی هەر ئی خۆی بوو گەنم و ئارد و نان و کابان دەست و دڵیشی زۆرتر بوو. جا گەنم دەبرا بۆ ئەو جێگایانەی ئاشی ئاویان لێبوو لە ناوچەی موکریاندا وەکوو دۆڵی سەردەراباد، ئاجیکەند، خۆراسانە.

**ئاشی ئاوی ئاوا ساز دەکرا:**

کانییەک یان چۆم یا جۆگەیەک هەبوو ئاوی زۆر بوو دەهاتن جێگایەکیان بۆ دیوار دەکرد ئاوەکەی تێدا ڕادەوەستا هەر بە بەرد و قوڕ بەوەیان دەکوت: گۆل یا ئەستێر. لە بڵیندیدا شوێنێکیان بۆ دەکێشا بەوەشیان دەکوت جۆگە ئێستا پێیدەڵێن کاناڵ لە جۆگەوە جێگایەکیان

بۆ ساز دەکرد تا ئاوەکە سەرەوخوار بێ پێیاندەکوت هەڵدێر لەوێوە دەرەکەیان قایم دەکرد پۆنگاوی دەخواردەوە بەوەشیاندەکوت بنەوانی ئاشی. دواتر لە نزیک ئاشەکە چەند بەردی گەورەیان دادەنا تا ئاوەکە بە سەریدا قەڵپەزەی بکا، ئەوەش حەواڵەی ئاشی. لە پەنا ئەو حەواڵەیە دارێکی گەورە و درێژیان هەڵدەقەند و کوون دەکرد تا ئاوەکەی بە توندی پێدا بڕواتە خوارێ و لەوێ لە پەڕەکانی بدا بەوەش دەڵێن دۆڵی ئاشی، ئەو دۆڵە و ئەو ئاوە بۆ هەڵسووڕانی ئاشەکە شوێنی زۆر دادەنێ. لە دوایین بەشی دۆڵەکە دوو تەختەی پێوە وەسڵ دەکەن تا ئاوەکە کۆ کاتەوە و قودرەتی زیاتر بێ بەوەش دەکوترێ شەبەکەی ئاشی، ئەو جێگایەش کە بە توندی ئاوەکەی لێ دەدرێ نێوی تۆپی ئاشییە، دەورووبەری ئەو تۆپە کونکونە، داری ڕاست یان پەڕەی بۆ ساز دەکەن لەو تۆپەی دەدەن پێیدەڵێن پەڕەی ئاشی کە ئاوەکە بە توندی لەو پەڕانە دەدا تۆپەکە هەڵدەسووڕێنێ ئیتر ئاشەکە وەکار دەکەوێ. ئەو تۆپە کە دارێکی ئەستوورە و قەراغەکەی ئەو پەڕانەی تێدایە و نێوەڕاستەکەی کونە و ئەو کونە ئاسن یان میلی تێدایە بەوەش دەڵێن بەستەی ئاشی.

**ڕوونکردنەوە:** ڕوونکردنەوەیەک بۆ کەرەسەکانی ئاشی ئاوی: حەواڵە یا سەرەنیا، بەر دیوارێکی بەردچنە دۆڵەکەی پێوە هەڵدەبەستن. **دۆڵ:** دۆڵی ئاشی دارێکی ڕاست و درێژ و ساف بوو دیوێکیان هەڵدەکولێ و کڵوریان دەکرد وەکوو تابوت، پاشان بە بزمار و تەختەی ساف و ڕێک دیوە کڵورەکەیان تەختەبەند دەکرد، بۆ ئەوەی ئاو بە دۆڵەکەدا بە

جوانی بڕواتە خوارێ، سەرێکی دۆڵەکەیان هەڵدڕی و دەیانکردە لای سەرەوەی حەواڵەکە بۆ ئەوەی ئاو بە جوانی لە سەرەنیاکەوە بێتە نێوێ، لای خوارەوەی دۆڵەکە هەر وەک خۆی دەماوە بەرێکی دەما بە ئەسکنە«برغوو» هلۆلیان دەکرد کونێکیان تێدەکرد بۆ جێزەنبوورە دەیانبردە نێو دۆزەقەوە. **زەمبورە**: لولەدارێکی وەک قۆڵە کوورە دوو بست درێژ دەبوو ئانیشێک ئەستوور بێ سەرێکیان لە نێو کونی دۆڵەکە دەترینجاند و بە هۆرە و پواز توندیان دەکرد تا ئاو نەدا بەولاولا یەکجێ بە تۆپ و تەکان لە کونی زەنبورەکەوە ئاو بێتە دەرێ و لە پەڕەی تۆپەکەی بدا و هەڵیسوڕێنێ، ئاشێک دەبوو بەرینایی بەرداشەکەی بێجگە لە کونەکەی کە گەرووی پێدەڵێن دەبوو حەوت بست بووبایە لەگەڵ کونی بەرداشەکە کە «گیر یان گەرو»یان پێدەکوت ئەویش نزیکەی بۆخۆی بستێک دەبوو. تێکڕا دەبوو بە حەوت بست و قولانجێک، چون لە کونەکەوە هەر لایەی ٣/٥٠ (سێ بست و نیو) بە هەر دووک دەبوو حەوت بست بێجگە لە گەروەکەی. دیارە ئاشی ئاوی چونکە بەرداشەکەی قورس بوو ئاوی زۆر نەبوایە کاری پێنەدەکرد. **چەقەنە**: دارێکی دوو بست و نیو بوو سەرێکی بەقەت لەپە دەستێک پان دەکەوتە سەر بەرداشەکە بە گەڕانی بەرداشەکە ئەویش هەڵدەبەزیەوە و پولوسکی دانەکە کە لە بانێژەوە دەهاتە خوارێ بۆ نێو گەروی بەرداشەکە ئەوە کارێکی وای دەکرد دانی ئاشەکە بە ئارامی و ڕێک و پێکی بێتە خوارێ. **تەوەرە**: ئاسنێکی نزیک بە دوو بست درێژ کەمێک پان و هێندێک قیللەتدار و ئەستوور

سـەرەکانیان پـان دەکـردەوە وەک دەمەتـەور هـەڵیان دەخست، نێوەڕاستەکەی باریکتر بوو، کونێکی درێژاودرێژیان تێدەکرد بۆ جێ بستە لەو بەرەوبەری کونی بەرداشەکە بە قەت دمەتەشۆیەکیان یان تەور نە قووڵتر و نە پتر، بەرداشەکەیان دادەبڕی و بۆیان دەکرد بە قەبر و دەمی تەوەرەکەیان تێدەخست بە جۆرێک کونی تەوەرەکە بکەوتبایە نێوەڕاستی کونی بەرداشەکە، بستە ئاسنێکی چوار پاڵوویە کە بە قەت دەسکە پێمەڕەیەک ئەستوور و گەز و نیوێک درێژ بوو لە تۆپە ئاشەکەیان هەڵدەکێشا سەری خوارەوەی نوکێکی باریکی بوو دەچووە سەر بەردێکی بڕێک قووڵی زۆر ڕەق نەسوێن بە نێوی مووروووەسەنگ و سەری سەرەوەش دەچووە نێو کونی تەوەرەکەوە. کاتێ ئاو بە توندی لە زەمبورەوە دەهاتە دەرێ و توند لە پەڕەی تۆپەکەی دەدا تۆپەکە هەڵدەسوڕا و بەرداشەکەی وەگەڕ دەخست و دەیخولاندەوە. **پەڕە:** چەند تەختەدارێک بوون ڕاست وەکوو داری خەدەنگ سەرێکیان باریک دەکرد و بە مەوداگەلی هەموو بە قەت یەک، دەوراندەوری تۆپەکەیان بە ئەسکەنە «برغوو» کون دەکرد و سەرە باریکەکەی تەختەکانیان تێ دەچەقاندن بۆ ئەوەی ئاوی دۆڵەکە بە توندی لە زەمبورەکە دێتە دەرێ لە پەڕەکانیدا و تۆپەکە بخولێنێتەوە و بەرداشەکە هەڵسوڕێنێ. **تۆپ:** کۆلکەدارێکی ئەستووری حەفتا، هەشتا سانتیمیتر درێژ بوو لە باری درێژەکەی کونێکی چوار پاڵوی **دیواردەریان** تێدەکرد و بستەکەیان تێ هەڵدەکێشا. **دۆزەقەی ئاشی:** جێگایەک بوو لە ژێر ئاشەکەوە تاریک بوو وەک بەرد دروستیان دەکرد

سەری خوارەوەی دۆڵەکە دەچووە نێوی و مووروو سەنگ و بستە و تۆپەکەش لە بەریەوە دادەمەزران، وەختێ ئاو بە پاستوویەکی زۆرەوە لە زەمبوورە دەهاتە دەرێ و لە پەڕەی تۆپەکەی دەدا تۆپەکە بە توندی هەڵدەسووڕا و ئاوەکە وەک تۆزی لێدەهات و لە دەرگای دۆزقەوە دەهاتە دەرێ دیارە دۆزقە تاریک و تنوک بوو وەک جەهەنم وابوو.



**بەرداش، مووروو، دۆزەقە، چەقەنە، تەوەرە، زەنبوورە، بانیژە، گەروو، تۆپ و پەڕەی ئاشی ئاوی**

**موورووی سەنگ**: بەردێکی تایبەتی یا بەردەسپییەکی زۆر جوان و یا بەردە شینەیەکی زۆر جوان بوو، تەختەکەی زۆر ڕەق‌و نەسوێن بوو لایەکی بەری چاڵ بوو لەسەر تەختە دارێکی بەری پانی یەکمیتر درێژتر دایان دەبەست و سەری خوارەوەی بستەکەیان دەخستە نێوچاڵی بەردەکەوە کاتی کارکردنی ئاشەکە بستەکە لەسەری دەخولاوە. ئەو بستەیە دوو سەری هەیە یەکیان لە بەردی بەرداشی

بنەوەیە دەچێتە دەرێ سەرەکەی دیکەشی بەردێکی بۆ دادەنێن کە پێی دەڵێن مووڕووی بەردی ئاشی کە لەودا دەمێنێ. مووڕووی ئاشی بەردێکی تایبەتیە کە ئێستا وەگیرکەوێ زۆر نایاب و بەقیمەتە و لەبن بەرداشی هەوەڵ هەڵدەسوڕێ، دیارە ئێمە بۆ گەنم بە ئارد کردن و لە ئاشی ئاوێدا دوو بەرداشمان هەیە یەکیان لە بنەوەیە ئەوەی دیکە لە سەرەوە بەوەی بنەوە دەڵێن بن بەرد و بەوەی سەرەوەشی دەڵێن سەربەرد و ئەو بەردەی سەرێ پێی دەکوترێ بەرداش و ئەو بەرداشەیە گەنم دەکا بە ئارد جا لەبن ئەو بەرداشەی بنەوە جێگایەکی خاڵی لێ هەیە ئاوی پێدا دەڕواتە دەرێ. دوای ئەوەی کە گەنم دەبوو بە ئارد حاجەتێک کە ئاردی تێدەکرا پێیان دەکوت: جەواڵ، تێر، لینگە، هۆڕ.



**خانووی ئاشی ئاوی**

جەواڵ لە مووی بزنەموو دەیبڕنەوە و دەیرێسن، تەونکەر دەیتەنێ و دەیکەن بە جەواڵ، تێر، لینگە و هۆڕ. کاتێک دێهاتی دوور و نزیک

دەهاتن بۆ ئاش دەبوو نۆبە بگرن بەوەیان دەکوت نۆبەئاش، کە نۆبەیان دەهات دەچوون گەنمەکەیان دەبرد بەوەیان دەکوت **وەسەرکردن** و ئەو جێگایەی گەنمەکەیان لێ هەڵدەڕشت بەو جێگایەیان دەکوت **بانێژە** لەبن بانێژەوە پلوسکێکیان وێدەخست گەنمەکەی پێدا دەهاتە خوارێ بۆ سەر گەرووی بەرداشەکە بەو پلوسکەیان دەکوت کەویژە ئەو کەویژەیە بە بەنێکەوە هەڵدەواسرا ئەو بنە دارێکیان تێدەخست بۆ سەر بەرداشەکە، دەچوو بە گەڕانی بەرداشەکە دارەکە دەلەرزییەوە بە لەرزانەوەکەی دارەکە پلوسکەکە یا کەویژە کە دەلەرزییەوە و گەنمەکە وردەوردە دەهاتە خوارێ بۆ نێو گەرووی ئاشی بەو دارەیان دەکوت چەقەنەی ئاشی هێندێکیان بەری بەرداشەکە هەڵدەقەند بەوەشیان دەکوت قووڵکی ئاشی. ئەوەندە گەنم دەبوو بە ئارد دەهاتە ئەو قووڵکەوە، ئەوەی ئاردیان پێ لە جەواڵ دەکرد، بێڵی ئاشیان پێدەکوت، کورت و دەسک قوڵە بوو، پێستە بەرخێکیان پەیدا دەکرد ئەو قوڵکە و جێگا ئاردەکەیان پێ دەماڵییەوە بەوەشیان دەکوت کەوڵی ئاشی. ئەوەی ساحەب ئاش وەری دەگرت لە لێ کردنی گەنم، جۆ، بڕوێش، هەرزن، بەوەیان دەکوت **مزەی ئاشی یان ئاوان.**



**«ئاش و ئاشەوان»**

ئەو کەسەی بەسەر ئاشی ڕادەگا پێی‌دەڵێن **ئاشەوان** و ئەو کەسەی دەچێ گەنم بکا بە ئارد پێدەڵێن **ئاشێر**، بەو گەنمەش دەکوترێ باڕاش و ئەو گوێدرێژەی باریان لێ دەنا پێیان دەکوت کەری ئاشی. هەر بۆیەش لە قەدیمەوە زۆرکەس کەری ئاشی و مریشکی ئاشەوانیان نەدەکڕی چونکە وا فێر دەبوون نە گیر دەبوون، نە بە دەردی دەخوارد ئەوە کە قەدیمی کوتوویانە نە ماینی دەروێشان نە کەری ئاشی و نە مریشکی ئاشەوانی، نە کوێرەدێ و نە کوێرەڕێ، پایتەخت و شەقامەڕێ. ئاشەوان هەرکات ئاشێری لێ نەدەبوو و دەیکوت: ئاشی بڕانە و هەرای دەکرد ئاش دۆڵە.

زیاد و کەمی وردی و درشتی ئارد ئەبەوە بوو دارێکی ئەستوور لە شانی ڕاستی بەرداشدا لە عەرزدا داکوترابوو سەرێکی ئەو دارە دەچووە سەر بەرداشی بنەوە جا کاتێک بە کوتک لەو دارە ئەستورەیان دەدا ئەویش بەرداشی بن بەردی توند دەکرد و قایم دەبوو، ئاش ئارام

دەگـەڕا و ئـارد ورد دەبـوو دەنـا بەرداشـی بنـەوە شـل بایـە، وەپەلـە دەکەوت ئارد درشت دەبوو جا بەو دارە ئەستوورەیان دەکوت **پێیە**. کاتێک گەنم دەکرا بە ئارد، ئارد لە جەواڵ دەکرا جەواڵیش یان جودا جودا دەدووروا و لە وڵاغیان دەنا بەوەیان دەکوت وشتربار یان دوو تایان پێکەوە دەدروو وەسەر گوێدرێژیان دەخست بەوەشیان دەکوت: **کەربار یان بارەکەر**. ئاردیان دێناوە لە ماڵێ لە حاجەتێکیان دەکرد پێیان دەکوت **کەندوو**.

**کەندوو ئاوا ساز دەکرا:** قوڕێکی سووری تایبەتی بوو کە دەچوون لەوێ دایان دەبێژت دەیانهێنا لە ماڵێ دەبوو مووی دەگەڵ خەن زۆر جوان بیشێلن دواتر وەستاکار بێت چینچین ڕۆژانە دایبنێ بە چەن ڕۆژ تەواو دەبێ، دواتر ئەگەر ویشک بووە سەرەکەی بە داری چکۆلە دەگرن لە سەرسەرەوە زارکێکی بۆ دروست دەکەن کە جەواڵی تێوە بچێ بەوە دەڵێن زاری کەندوو، کە ئاردەکەی تێدا هەڵدەڕێژن و لە بنەوەی کەندووکە کونێکی بۆ دروست دەکەن کە دەستی کابانی تێوە بچێ ئاردی لێ دەرێنن بەوەش دەڵێن زارکی کەندوو، ئاردیان لەو کەندووە دەکرد نە تەڕ دەبوو، نە مشک دەیخوارد، نە ئەسپێی دەبوو و نە خەسار و خراپیش دەبوو کە ئەوکات ئەوانە هەموو زۆر بوون. دیارە ئەو کەندووە گەورە و چکۆلەیان هەبوو، بە پێی ماڵی خێزاندار و کەمخێزان بوو یان میواندار و کەممیوان، گەورە و چکۆلەیان دروست دەکرد. ئەو جێگایانەی کە ئاشی ئاویان زۆر لێ بوو و لە کوردستانی ئێران لە ناوچەی ورمێ، دەشتەبێڵ، دزەی مەرگەوەڕ، لە ناوچەی شنۆ

و پیرانشــار، لاجــان، نــەڵێن، پێــران؛ لــە موکریــان دۆڵــی ئاجیکەنــد و خوراسانە؛ لە ناوچەی بانە دۆڵی نجنە و نەمەشیر؛ لە ناوچەی سـەقز دۆڵی سەرشـێو و میرەدێ. خولاسـە زۆربـەی جێگـا ئاوییـەکانی ئێران ئاشی ئاویان لێ بوو، ئەوە بوو مێژووی گەنم تا دەبێتە نان.

**مێژوو و جێگای ئەو کەرەسانەی بۆ ئارد لەو دوایەدا هاتنە گۆڕێ و جێگای ئاشی ئاوی و بای گرتەوە.** بەرەو پێش چوون و سازکردنی ڕۆژ دەگـەڵ ڕۆژی ئاشـی ئـاور یـان غەڵتـەکی لـە سـاڵی ١٨٠٠ زایینـی دەستی پێکردووە. **کورتێکەی ئەوەیە:**

لە ساڵی ١٨١٥ جورف ئـآنتۆن ئاشـەوانێک بوو کە لە ساڵی ١٨١٥ لە وەرشەو پاتەختی لەهستان ئاشەوانێکی ناساند کە دەیتوانی بە جێگای ئاشی بەرداش دەنکەگەنم بە وەسیلەی غەڵتەکێک کە بەرەو ئاوەژووری یەکتر هەڵدەسوڕێنێ بکاتە ئارد و لە ساڵی ١٨٢١ لەو ساڵە دەنکە گەنم بە وەسیلەی غەڵتەکی ئاشیلێکدراو- و- وارید بوو ئەو چەشنە غەڵتەکە دواتر بە وەسیلەی ئاغای پولێنگێر لە شاری ویەن و ئاغای کۆڵێر لە شاری پاریس بەرەو پێشکەوتن ڕۆیی و لە ساڵی ١٨٣١ زایین ئاغایان فیرێن موت و بۆهان کتراد کارخانەیەکی پێنجقاتی غەڵتەکی گەورەیان دروست کرد. و ئەسڵەکەی هەر ئەوەش کە بە وەسیلەی جۆرف ئانتۆن ناساندرابوو لە ساڵی ١٨٣٦ زایینی دروستکردنی غەڵتەکی لە نزیک شاری ماینسی ئاڵمان کە بە هێزی هەڵم و ئاو و ئاور کاری دەکرد ئەو ئاشە بە دەستگای جویکەرەوە«لێکهەڵاواردن» تەیار بوو. و هەر وا لە ساڵی ١٨٥٠ زایینی ئاغای ئابراهام ئەمبراخ خەڵکی زۆریخ هەوەڵین

غەڵتەکی چەندنی کە دارای شەیار«دەندە» بوو، ساز کرد. لە ساڵی ١٨٧٨ دروست کردنی هەوەڵین غەڵتەکی ئەڵمانی لە بریتانیا و لە ساڵی ١٨٧٩ دروستکردنی هەوەڵین غەڵتەکی ئاشی لە ئامریکا و لە ساڵی ١٨٨٧ زایینی دروست کردنی هەوەڵین غەڵتەکی چوار دانەیی کە ئەساسی غەڵتەک و ئاشی ئەمڕۆیی پێک دێنن. و لە ساڵی ١٩٩٠ ئاڵ و گۆڕێکی بنەڕەتی لە سەنعەت و زانیاری ڕۆژ پێک هات و سەنگ و بەرداش و ئاشی ئەمڕۆیی بە دەست هات کە ئەمڕۆ کۆمەڵی بەشەر لە بەری حەساوەتەوە. ئەوەش مێژووی ئاشی ئاردی ئاوری ئەمڕۆیی کە بەرەبەرە پەیدا بوو.

# مێژووی ئاشی بای و جێگای پەیدا بوونی



**«ئاشی بادی»**

ئاشی لەو کەرەسانە بووە کە گەنم و گەنمەشامی و جۆی پێ لێکراوە. ئاشی با بەر لە هەر جێگایەک لە هولەند دروست کراوە، چونکە هولەند وڵاتێکی دەشت و ڕێک و پێکە و جاروبار بە هۆڵەندا دەڵێن وڵاتی با یا سەرزەمینی ئاشی بادی لە حدودی ۱۳۰۰ ساڵ لەمەوبەر دروست کراوە و لە ساڵەکانی سەدەی ۷ هاتۆتە ئێرانەوە وێنەی ئاشی بای ئاوا بووە، لە پێشدا پەڕەکانی ڕاست بوون و شەش تا دوازدە پەڕی بووە و ئەو پەڕانە بە پارچە یان بە پووشی خورما داپۆشراوە لە هەوەڵەوە ئاشی با بۆ لێکردنی دانەوێڵە بووە دواتر خەڵکی هولەند پێشکەوتنیان پێدا و هێنایان تیغەیان بۆ ساز کرد وەکوو پەروانە وا بوو چاکتر

هەڵدەسورِا دەبوو واشی دانێن کە بەرەوبا هەڵکەوێ چونکە هۆڵەندا زەمینی دەشت و ویشکایی زۆرە. ئێستاش رِۆژانی جێژنی گەرِان و سەیاحەت بە رِۆژانی ئاشی بادی هۆڵەندا نێو دەبرێ. ئاشی بادی چونکە توندی با کەم دەکاتەوە دەتوانێ با لە رِووی تیغەکانی لە باڵەکانی بدا و وەگەرِیان خا وەک با کە لە باڵی فرِۆکە دەدا. ئەوە بوو مێژووی کورتی بادی لە ئێران و دەرەوە.



**«ئاشی بای یا بادی»**

# جێژنی نەورۆز



«قەڵپەزی کوێستانی ماینبڵاغ»

شتێکی سروشتیە لە ژیانی بەشەردا هەر ڕووداوێک ڕوو دەدا وەک مێژوویەک چاوی لێدەکرێ تۆمار دەکرێ لە زەمانی زۆر کۆنەوە بەرەی ئادەمیزاد لە هەر سەرکەوتن و پێشکەوتن تاک و کۆمەڵ یان پەیدابوونی خۆشی و لاچوونی غەم و تەم و تاریکی ئەوەیان بە ڕۆژی بەختەوەری جێژن نێودێر کردووە چ لە لایەن حاکمان و دەسەڵاتدارانەوە چ لە لایەن بێبەش و زوڵم لێکراوانەوە وەکوو کاوە بەسەر زوحاکی سەرە خۆرەدا زاڵ و سەرکەوت یان وەکوو پێگەیشتن بە ئامانج و ویستەکانەوە یان نەجات بوون لە تەنگانە ناخۆشی ڕۆژەڕەش جا پەیدابوونی نەورۆز و دیاری کردنی ڕۆژی نەورۆز وەک هەوەڵین ڕۆژی بەهار بەو ڕۆژە و بەو جێژنە بە هۆی یەکێک لەو ڕووداو- و پێشهاتانە بووە کە باسی دەکەین و نێوی دەبەین بە

گوێرەی نووسینی مێژووناسان و نووسەران لە زەمانی زۆر کۆنەوە لە لایەن ئێرانییەکانەوە ساڵ بە چوار بەش دابەش کراوە وەرزی سەرما و گەرما، شینایی، زەردایی هەر بەشێک یا وەرزێک بە سێ مانگ دانداروە بە گوێرە لێکۆڵینەوەی زانای بە ناوبانگی ئێرانی بەڕێز ئەبوریحانی بیرونی لە کتێبی ئاسارولباقیاتدا سەرەتای دروستبوونی ساڵی گێراوەتەوە بۆ دەورانی دروستبوونی ئینسان و لەو کاتەوە دەستی پێکردووە و لە بارەی نەورۆز و جێژنی نەورۆز ئەوەیە پێڕەوانی ئایینی ئیسلام وەک لە کتێبە دینیەکاندا نووسراوە دوو جێژنمان هەیە کە یەکیان جێژنی قوربانە لە کاتێکدا کە حەزرەتی ئیبراهیم دەستی داوەتە کەرەسەی بوتشکاندن و بوتی لە بۆتخانە بڕین و خەڵکی بۆ لای یەکتاپەرستی بانگ کرد. و لە جێژنی قورباندا بەسەر شەیتاندا زاڵ بوو و ئەمری خودای ئەنجام دا. دووهەم جێژنی ڕەمەزانە کە ئەویش مانگێک ڕۆژ و عبادەت و لە خودا نزیکی و دووربوون لە ئاکار و ڕەفتاری ناحەز و دزێو بە هۆی ئەو سەرکەوتنە پایانی مانگی ڕەمەزان دەکەینە جێژن.



**«کوێستانی ڕووشان» «وێنەگر ئەمین گەردیگلانی»**

وەک باسمان کردووە لە وەرزی جێژنە لە کوردستاندا دیارە جێژنی نەورۆز جێژنێکی کۆنی نەتەوایەتییە بۆ جێژن و ڕۆژی نەورۆز زۆری قسە لەسەر کراوە زانایان پسپۆڕان هەر یەک بە بارێک کوتوویانە و نووسیویانە. یەک لەوانە نووسراوە بناغەی لە دایکبوونی زەرتوشت بۆ ئاریایەکان ئاوایە دەڵێن زەرتوشت پێغەمبەری ئێمە بووە و ڕۆژی لە دایکبوونی هەوەڵین ڕۆژ لە هەوەڵین مانگی بەهاردا ڕووی داوە و لەو ڕۆژە لە دایک بووە و ئەو ڕۆژەیان نێو ناوە فەروەردین یانی ڕۆژی پەیدابوون«زهوور» یا «فرەوەر» کە نیشانە یا نێوێکی دیکەی زەرتوشتییە. دووبارە لە لایەکی دیکەوە چونکە لە ئایینی و باوەڕی پێڕەوانی میترائیسم کە ئەوکات دین و عەقیدەی ڕاستەوخۆی ئێرانییەکان بووە و ئەوەش لە پێش مەکتەب و دینی زەرتوشتدا بووە

ئەوان باوەڕیان وا بووە کە هەوەڵین ڕۆژی بەهار، تەبیعەت دووبارە زیندوو دەبێتەوە و ڕۆژ و ڕۆژگارێکی دیکە پڕ لە خێر و خۆشی بۆ ژیان و بوژانەوەی بوونەوەران دەست پێدەکاتەوە دوور لە سەختی پێشوو ئەو ژیانە تازەیە هەڵەسوون دێنێتەوە و بەو جۆرە هەر ساڵەی مەرگێک ڕوودەدا وەک پاییز و زستان و ژیانێکی پڕ لە خێر و خۆشی وەک بەهار و هاوین دەست پێدەکاتەوە ئەوە یاسای ئایینی میترایە و دووبارە پێش تەشکیل دەسەڵاتداری گەورەی ماد حوکومەتداری لە ئێراندا بە شێوەی ناوچەیی بووە، بەو جۆرە هەر کەسێ بە سەلیقە و عەقیدەی خۆی یاسای داناوە و دەسەڵاتداری پێکهێناوە بڕێکیان ئارام و عادڵ و خەڵکی بوون و زۆر بە مێهرەبانی دەگەڵ ڕەعیەتی خۆی ڕەفتاری کردووە و هێندێک لە حاکمانیش زۆر زاڵم و بەدڕەفتار بوون. جا یەکێک لە گەورەترین و پان و بەرینترین و بە دەسەڵاتترین ناوچەی حکومەتی ئێران ناوچە و ویلایەتی ئەوکاتی ئێران ویلایەتی ماد بووە کە ئەڵبەتە حاکمانی ئەو لە خوێنمژترین و دیکتاتۆرترین و سەرەڕۆترین حاکمان لە هەمووی ئێراندا بە حیساب دەهاتن کە لە هەموان خوێنمژتر یەک نەفەر بوو بە نێوی زوحاک کە ناسراو بە زوحاکی سەرەخۆرە بوو، هەر ڕۆژ دەبوو دوو جەوانی بۆ بەرن مەغزی سەریان دەرخواردی مارەکانی سەر شانی بدا بۆ مان و ڕاحەتی خۆی. کاوەی ئاسنگەر کە یەکێک لە ڕەعیەتەکانی ئەو بوو دوازدە کوڕی بوو زوحاک یازدە کوڕی بە فێڵ و تەڵەکە کوشتن و لەبەین بردن و درخواردی ماری سەر شانی دان. «جا ڕەنگە مار و

زوحاک هەر ئەفسانە بێ.» کوڕی دوازدەهەمی کە نێوی میدیا بووە، مابوو زوحاک خەریک بوو ئەویش لەبەین بەرێ. کاوە ئاوی گەیشتە ئێسکان، لە تاوی کوڕەکان کوتکی ئاسەنگەری لەسەر شانی دادەنێ و کەوڵە بەرکۆشەکەی بە دەوری سەریدا هەڵدەسووڕێنێ، هاوار دەکا خەڵکینە وەرنە دەرێ خەڵک کە هەر وەک کاوە لە دەست زوحاک وەزاڵە هاتوون لە دەوری کاوە کۆ دەبنەوە و تەخت و بەختی زوحاک تێک دەدەن و دەرووخێنن بۆ ماوەیەک بۆخۆی لە جێگای دادەنیشێ[٣] دواتر دیاکۆ کە پیاوێکی ڕەشید و وریا دەبێ دەسەڵات بە دەستەوە دەگرێ و ڕۆژی ڕاپەڕینی کاوە سەرەتای ڕۆژئەژمێر و مێژووی دەوڵەتی ماد بە حیساب دێ کە دەبێتە ڕۆژی ١/١/١ ڕۆژی نەورۆزە و چونکە کوردەکان خۆ لە نژادی ماد و بنەچەکەی میدیا دادەنێن هەر بۆیە نەورۆز بە ئیخۆ دەزانن و لە هەمووی ناوچەکانی کوردستان ڕۆژی نەورۆز جێژن دەگرن.

جا لەسەر پێکهێنان و بانگەوازی دەسەڵاتی ئیمپراتوری ماد ئەو چەند قەولە و وتەیە هەیە لە لایەن مێژوونووسانەوە: ١- دەڵێن بە هۆی پیری و ناتەوانی کاوە دیاکۆ لە جێگای بابی دانیشتوو هەوەڵین ئیمپراتوری مادی ئیعلام کرد و پێک هێنا و دەسەڵاتی تەواوی بە دەستەوە گرت.

---

٣ بە ڕای زۆربەی مێژوونووسان فەرەیدوون لە جێگای زوحاک چۆتە سەر تەخت.

٢- قسەی دووهەم ئەوەیە ڕزگاربوونی دەوڵەتی ماد لە کۆیلەتی و لە ژێر دەستی دەوڵەتی خوێنخۆری ئاشوور و گیرانی شاری نەینەوا بە پایتەختی ئەو دەوڵەتە بە دەستی «هووەخشتەرە» سێهەمین پادشای گەورەی ماد دامەزرانی سێهەمین ئیمپراتوری بێغەنیمی ڕۆژهەڵاتی لە لایەن ئەو پادشا مەزنەوە کە بناغەی دەوڵەتی ماد و کوردی پێک دێنێ ئەوکاتیش بە بڕوای هەمووی مێژوونووسانی ڕۆژاوا ساڵی ٦١٢ی بەر لە زایین بووە و دووبارە هێندێک لە مێژوونووسان پێیان وایە دووهەمین پادشای ماد هەم «فرودتینام بووە». دیارە هەر ئەو مێژوونووسانە باوەڕیان وایە کە بنەماڵەی پادشایانی ماد لە دەورانی ٧١٣ی پێش زایین حکومەتیان کردووە و ئەوکات بە تەواوی ئاشوورییەکان و سەکاریەکانیان لە ناو بردووە و دەوڵەتی مادیان ڕاگەیاندووە و ڕۆژی ڕاگەیاندە دەوڵەتی پانوبەرینی ماد لە ڕۆژی نەورۆزدا بوون هەر بۆیەش ئەو ڕۆژەیان بە جێژن گرتووە و لەو ڕۆژەوە هەر هەیە. نەورۆز لە ڕوایەتی دینیەوە دەگێڕنەوە پێغەمبەر لە ماڵێ نەبووە چەند ماڵ ئێرانی جیرانیان بووە ئەگەر دەچێتەوە ماڵێ جامێکی هەڵوا لەبەر دەم دادەنێن دەفەرمێ ئەوە چییە عەرزی دەکەن ئەوە نەورۆزە جێژنی ئەو ئێرانیانەیە ئەو شیرنیەیان بۆ هێناوین. ئەویش هێندێک لەو هەڵوایە دەخوا و ئەوەی کە دەدا بە دەوروەبەری ئێتر ڕەدی نەکردووەتەوە و بفەرمێ نایخۆم. لە لایەکی دیکەوە لە هێندێک سەرچاوە ئایینیەکاندا هاتووە کە نەورۆز ڕۆژێکە لەو ڕۆژەدا ئادەم و حەوا کەوتوونە سەر زەوی و لەو ڕۆژەدا ڕۆژ هەڵاتووە. لەو

ڕۆژەدا کەشتی نووح لەسەر کێوی جوود لەنگەری گرتووە. بە گوێرەی هەموو نووسراوەی مێژوونووسان جێژنی نەورۆز جێژنی کۆنی ئێرانییەکانە لە دەورانی کۆن جێژنی نەورۆز بەرابەر بووە دەگەڵ ٢١ مارس دەڵێن (زوحاک یا ئاژدهاک لە پادشایانی ماد) کەسێکی بە نێوی ئورامانیل کردە بەرپرسی ئەوە کە هەر ڕۆژ دوو جێحێڵی جوان و چاک بکوژێ و لە مەغزی ئەوان بۆ مارەکانی سەر شانی بکا بە خۆراکی ئەوان و دەرخواردی ئەوانی دەدا، ئورامانیل لەسەر تەکبیر و ڕێنوێنی یەک نەفەری ئەوکات ڕۆژانە یەک نەفەر دەکوشت و یەکی دیکەی لە پشت کێوەکان دەشاردەوە و دوای ڕووخانی زوحاک بە دەستی کاوەی ئاسنگەر پادشاهان دواتر ئەو کارەیان لەو کابرایە پرسی کوتی دەمەویست هەر ڕۆژ یەکێک لەو جحێڵە جوانانە لە مەرگ نەجات بدەم و بمێنن بۆ سەرمایەی دواڕۆژی نەتەوەکەیان. ئیتر فەریدوون کە لە پادشایان بوو کاتێک ناردی ئەو جەوانانە بیننەوە و بیان هێننەوە و لە وەختی هاتنەوەیان گەرەمەشقاڵی ئاوریان هەڵکرد و ئاوریان کردەوە و لە خۆشی نەجاتی ئەوان لە مەرگ و دیتنەوە و هاتنەوەیان بۆ نێو کەس و کاریان ئیتر لەو کاتە لە نەورۆزدا ئاور دەکەنەوە بە جێگای شادیانە سەبارەت بە چوارشەنبە سووری یا ڕۆژی سووری، ئەوەی مەعلووم و ئاشکرایە ئێمە لە ئێرانی قەدیم و کۆنەوە ڕۆژێکمان نییە بە نێوی چوارشەنبەسووری چونکە ڕۆژئەژمێری ئێران«تەقویم» ئەسڵەن ژومارە ڕۆژی بە شێوەی حەوتوو نەبووە یانی حەفتەنامە لە ڕابردوودا نەبووە و هەر ڕۆژ ڕۆژێکی تایبەتی خۆی هەبووە ڕۆژئەژمێری کە

ئێمە ئەورۆ کەڵکی لێ وەردەگرین کە لە ڕووی ئەساسی ئەوەوە هەر مانگ ٤ بەشە یا چوار حەوتوویە و هەر حەتوو ٧ بەشە و هەر بەشێکیشی لە حەوتوودا ڕۆژێکە و لە مەجمووعدا بەوە دەڵێن حەوتوو یا «هەفتە» کە بەش کراوە ئەوە لە دوای هاتنی عەرەب بۆ ئێران و لە ڕۆژئەژمێری ئەوان وەرگێڕاوە بۆ وێنە ڕۆژانی هەینی و نوێژی جومعە. دەنا لە پێش هاتنی عەرەب مانگی ئێرانی بە شێوەی پێنجپێنج بەش دەکرا کە بە هەر یەک لەوانە پێنجیان پێ‌دەکوتن وەکوو دابەش‌کردنێک کە لە وڵاتی میسری قەدیم و بابل بەرێوە چووە ڕەواجی بووە ڕۆژئەژمێری ئێرانی قەدیم دارای ١٢ مانگی ٣٠ ڕۆژەی تەواو بووە بێ کەم و زیاد، لە ئەدەبیاتی فارسی جێژنی نەورۆز وەکوو باقی جێژنە و ڕێوڕەسمەکان و فەرهەنگ و ئایینەکان بە پادشاکان نسبەت دەدەن شاعیران و نووسەرانی سەدەی ٤ و ٥ هیجری وەکوو فێردۆسی، مەنوچیهری عونسوری، بیرونی، تەبەری، سعودی، مسکۆیە و زۆری دیکە کە سەرچاوەی مێژووی و وێنەی ئەوان زانای شارەزایان لە پێش ئیسلامدا بووە نەورۆز و پێکهێنانی جێژنی نەورۆزیان لە زەمان پادشای جەمشید دەزانی کە بە چەند نیشانەیە.

جهان انجمن شد بر تخت روی　　از آن بر شده فره بخت اوی

به جمشید بر گوهر افشاندند　　هر آن روز را روز نو خواندند



**تەختی جەمشید**

محەممەدێبنی جەریر تەبەری نەورۆزی سەرەتای دادوەری جەمشید زانیوە جەمشید زانایانی کۆ کردەوە کە ئەو ڕۆژەی من لەسەر تەخت دانیشتم بۆ ئەوەی زوڵم لە کەس نەکەم ئێوە چاوەدێریم بکەن هەر چەند لەودا عداڵەت و دادوەری تێدا بێ یارمەتیم بکەن تا ئەمن ئەوە بەجێ بێنم ئەو ڕۆژەی کە جەمشید ئەو دەسەڵاتەی پێبەخشرا ڕۆژی هورمز بوو لە مانگی فەروەردین، خاکەلێوە، کە دواتر ئەو ڕۆژەیان کردە ڕۆژی ڕەسمی. ئەبوریحانی بیرونی دەڵێ بڵێند بوونەوەی جەمشید سەرەتای جێژنی نەورۆز بووە، چون دەڵێ جەمشید بۆخۆی چەرخوفەلەکێکی ساز کرد کە لەو ڕۆژەدا سواری ئەو بوو ئەو کارەی ئەو خەڵکی ڕاچڵەکاند و عەجایب مان و پێیان سەیر بوو و ئەو ڕۆژەیان جێژن گرت ئەبوریحانی بیرونی دەڵێ جێژنی نەورۆز لە پێش جەمشیددا هەر کراوە دیارە ئەو ڕۆژەی جەمشید

ڕۆژێکی تازە بووە و ئەو جێژنی کرد بەڵام نەورۆز لە پێش ویشدا ڕۆژێکی گەورە بووە و گیراوە و جێژنی پێش جەمشیدە. نەورۆز جێژنێکی زۆر لە مێژینەیە و ئێرانیەکان پێش زەرتوشت و ماد و ئاریایەکان هەر بووە و دیارە بە شێوەی جۆرا و جۆر بەڕێوە چووە.

دوکتور میهرداد بەهار دەڵێ: لە نەقشی گەورەی تەختی جەمشید وا دەردەکەوێ کە نوێنەرانی ژێردەسەڵاتی دەسەڵاتدارانی هەخامەنیشی لە ڕۆژێکی دیاری کراو کە ڕۆژی نەورۆزە لە ڕووی بەرنامە و ڕێورەسمێک دیارییەکانی خۆیان لە دیوەخانی«سەد ستوون» پێشکێشی شایان دەکرد دیارە لە دەورانی ئەشکانیان هەر بەو شوێنەدا ڕۆیشتوون بەڵام لە دەورەی ساسانیان نەورۆز جێگایەکی تایبەتمەندی بووە و ئەوکات گەورەترین جێژنی ئێرانیەکان بووە ئایینی زەرتوشت کە لە پێش هەخامەنشیان لە دەورانی حکومەتی گشتاسب پێک هاتووە. زەرتوشتیان دەڵێن کە ڕۆژی شەشی فەروەردین مانگ ڕۆژێکی گەورەیە و لەو ڕۆژەدا بۆ زەرتوشت هەلی بۆ هەڵکەوت کە دەگەڵ خوداوەند ڕاز و نیاز بکا و کەیخوسرەو لەو ڕۆژەدا فەوتی کردووە و لەو ڕۆژەدا بۆ دانیشتوانی کورەی زەوی خوشبەختی یان بەش کرد.




**چیای ئاگری، وێنەگر لوقمان ڕەحیمی**

ئەبووریحانی بیرونی زانای ناوداری ئێرانی دەڵێ ڕاستە جەمشید ڕۆژی نەورۆزی جێژن گرتووە بەو موناسبەتەی باسمان کرد بەڵام لە پێش ئەویش‌دا جێژنی نەورۆز ڕۆژێکی گەورە و بەڕێزە بووە بە بێ ئێران لە ئاسیای سەغیر و یوونان و سەرزەمینی فری-ژی وەلیدی و ئەتاتۆلی لە ڕۆژانی نەورۆز بە تایبەت لە ڕۆژانی سێ ڕۆژەی ٢٥ تا ٢٨ مارس، ٤ تا ٧ فەروەردین نەورۆزیان جێژن گرتووە و بە ڕۆژانی پیرۆزیان زانیوە بەڵام سەرچاوە و ڕیشەی ئەو جێژنە نەتەوایەتیە لە ئێرانی قەدیمەوە لەو سێ خاڵەدایە کە باسی دەکەین نێوی دێنین.١- گەڕانی زەمان لە داییرە و فکری بەشەر وای بیر بۆ دەچێ کە دەبێ لە یەک مەرکەزی دیاری‌کراو دەست پێ‌بکا و بە گەڕانی دەوران دەور و هەڵسووڕانی دائیم هەر بێتەوە ئەو مەرکەز و نوقتە دیاری کراوە. دیارە ئەو مەرکەزە یا نوقتەیە هەوەڵ و ئاخری نەورۆزە بۆ کۆتایی زستان هەوەڵ و سەرەتای نەورۆزە بەڵام کۆتایی زستانە کەوابۆ نەورۆز هەر

بووه.٢- له ئایینی زەرتوشتدا شەش جێژنی ڕواڵەتیان بووه که هەر یەک لەوانه به دەست و قودرەتی خوداوەند ڕێزی لێدەگیرا و جێژنیان بۆ دەگرت١. وەکوو بەدیهێنانی ئاسمان ٢. زەوی ٣. ئاو ٤. گیا ٥. جانەوەر ٦. ئینسان. ئەو جێژنانه بنیادەمیان وادار دەکرد که له زەمانی ڕابردوو و له هەڵه و چەوتیو گۆناحوکردەوه ناحەزەکانی ڕابردوو پەشیمان بنەوه بەڵام بگەڕێننەوه بۆ ڕێگای ڕاست.

٣- نەورۆز جێژنێکی ڕووناک و لاچوونی دونیای زستان ناخۆش و بەره و دەستکەوتی حاسڵ و بەرەکەتی ساڵی تازه و کشت و کاڵی کاری وەرزێڕی به مەعنایەکی دیکه له نەزر و باوەڕی زانای ناوداری ئێرانی ئەبووریحان بیرونی نەورۆز ڕۆژی ڕاپەڕینه بۆ گیانی تازه بۆ ژیانی تازه و بۆ دەستکەوت و دید و دیداری تازه له سروشتی تازه که خوداوەند بەدیهێناوه و ڕۆی ناوه بۆ ئینسان کەڵکی لێ وەربگرێ.

نەورۆز له مەڕاسمی زۆر قەدیمی ئێرانی ئاریایی ئەگەرچی له کتێبی ئەوێستادا نێوێکی نییه بەڵام له هێندێک له کتێبه دینییەکانی زەمانی پەهلەوی ئەوکات له نەورۆز و جێژنی نەورۆز نێوی هێناوه و باسی لێکراوه وا کوتراوه که له لایەن زەرتوشتەوه سێ نوتفه کەوتووەته دەریاچەی کسوه(kasava) که به فریشتەی ناهید، فریشتەی ئاو نێو براوه. یەکیان هەموو ساڵێک خەڵک منداڵەکانی خۆیان له ڕۆژی نەورۆزدا دەبرده ئەوێ مەلێیان پێدەکردن چونکه زەرتوشت بەوانی کوتبوو بەرەکەت به نەسیب ئەوه دەبێ که لەو دەریاچەیه(گۆل) خۆ بشوا له زەمانی هەوەڵی هاتنی ئیسلامیش دەوامی بوو. ڕێک و پێک

کردنی ساڵنامەی نەورۆز تەقویمی فارسی بە وەسیلەی نووسەر و زانا «المتوکل علی‌الله و المعتمد بالله» بەو مەنزووورە بووە. ڕەسم وا بوو کە بەیانیان خەڵک ئاویان بە یەکدا دەکرد و لە سەدەکانی هەوەڵی هاتنی ئیسلام هەر ڕەواجی بوو دیاری نەورۆز تا زەمانی عەباسیان هەر هەبوو بە تایبەت لە بەینولنەهرەین دواتر خولەفای ئیسلامی تەنانەت دیاری نەورۆزیان بە نێوی سەرانە و خەرجی ساڵیانە وەردەگرت بەڵام لەو ماوەیەشدا ئێرانیەکان بە نهێنیش بایە جێژنی نەورۆزیان هەر دەگرت ئەوجار لە نەتیجەی دەسەڵاتی ئەبوومووسلیمی خوراسانی و هاتنە سەر کار خەلافەتی عەباسی و پەرەگرتنی دەسەڵاتی بنەماڵەی بەرمەکیان و باقی وەزیرانی ئێرانی و پێکهاتنی حکومەتی تاهیریان جێژنی ئێرانی گەشەی کرد و ژیاوە و شاعیران و نووسەران هونەرمەندان شیعر و بەیت و گۆرانییان دەست پێکرد و هەزاران شیعر و قەسیدەیان لەبارەی جێژنی نەورۆز نووسیوە بۆ وێنە هەمزەی بنی حەسەنی ئیسفەهانی دانەری کتێبی «السائره فی فیروز و المهرجان» نەورۆز لە دەرباری عەباسی جێگای خۆی زۆر باش پاراستبوو بۆ نموونە ماڵیات و دیارییەک کە لە زەمانی ساسانی دەدرا و دەکرا لە زەمانی عەباسیان بەجێ دەهات ناردنی دیاری نەورۆز لە لایەن سەردارانی ئیسلامی بۆ لای خەلیفە ببووە ڕێوڕەسمێکی ئاسایی لە دەرباری خەلیفەکانەوە و ناردنی نامە بە شیعر و شاعیرانی عەباسی بە نێوی سەعیدی بنی حەمید بۆ یەکێک لە دۆستانی خۆی لە دەربار دەنووسێ من شتێکی لایقی تۆم نەبوو تا بە ڕەسمی دیاری بۆتی بنێرم

ناچار ئەو نووسراوەیەم بۆ ناردی هیوادارم لێم وەرگری. زانای بە ناوبانگ ئەبووریحانی بیرونی لە کتێبی(التفهیم) لە بارەی نەورۆزەوە دەڵێ ٦ ڕۆژی هەوەڵی بەهار نەورۆزە، ٥ ڕۆژی هەوەڵ نەورۆزی گشتییە ڕۆژی شەشم نەورۆزی خاسە، ئەو ڕۆژە، ڕۆژی پادشاهان و گەورەکان بووە. دووهەمین پادشای ماد فروودتینام بووە و بابی دیاکۆ کە سەرزەنجیرە و سلسلەی حکومەتی ماد کە ساڵی ٧١٣ پێش میلاد لەسەر تەختی پادشایەتی دانیشت. هەر ئەو نێوەی هەبووە«فرودتی» فرودتی لەهجەی ئەوێستایی فەرەوەش«Farvash» و بە پەهلەوەی فرووهەر«Farvahr» بەرابەرە لەگەڵ ئەوێستای فەرەوەش. یەکێک لە جازبەی ڕووحی پەنهانیە کە لە دوای مەرگی ئینسان لە لەشەکە جودا دەبێتەوە و بۆ لای دونیای نەهان و ڕووحی غەیبی دەڕوا. کەلیمەی ئەوێستا بە مانای هاتنە خوارێ پاکان یان دەسەڵاتی بەهێزی خوداوەندە. کەوابوو کەلیمەی فارسی فەروەردین یانی بەرەوڕووی پاکیو پاکان. دیارە لەکن هێندوان تەعریف نیاکان- پیتارا(pitara) دەگەڵ جێژنی ئێرانیەکان وەک یەک دەچن و ئیتر حکومەتی مادەکان ڕۆژی نەورۆزی ساڵی ٧١٣ یان کرد بە جێژنێکی ڕەسمی هەتا ئێستا.

کۆنترین دیاردە و نیشانەی کە لە نەورۆز لە کن قەومی ئاسیای ڕۆژاوا بە دەست گەیشتووە، جێژنی ئاگیتۆ کە جێژنی ساڵی تازەی«سومریان» و بابلیان بووە دەیانگرت. هەر بەو جۆرە لە بابل لە دوو وەرزی جیاجیا نەورۆز جێژن دەگیرا لە ئێرانی کۆن و باستان لە

دوو کاتی ساڵدا نەورۆزیان جێژن دەگرت. یەکیان سەرەتای بەهار و ئەوی دیکەش سەرەتای پاییز کە پێی دەکوترێ جێژنی میهرەگان هێواشهێواش ئەو دوانە دەگەڵ یەک تێکەڵ بوون. لێکدا تواونەوە بوونە یەک جێژنی نەورۆزی ئێستایان لێ پەیدا بوو. لە بارەی مێژووی کوردەکان پێش هەر ڕووداوێک دەبێ ئەوە وەبیر بێنینەوە کە مێژووی پێشکەوتن و تەمەدون کوردەکان زۆر لە پێش مێژووی پەیدا بوونی زەرتۆشت لە ئێراندا بووە چونکە باپیرە گەورەی کوردەکان کە مادەکان بووە هەوەڵین قەومێکی کە ئاریایی بوون و هەوەڵین ئیمپراتوری دەسەڵاتداری گەورەی ماد لەو سەرزەمینە پان و بەرینەیان پێک هێناوە و هەر ئەو ڕووداوەش بۆتە بناغەی مێژووی دروست و پێکهێنانی حکومەتی کوردەکان لە سەردەمی مادا. دوایی بە هۆی هاوکار بۆ هاودڵی هەمووی ئێرانیەکان دەسەڵاتێکی زۆر گەورە و پان و بەرینیان بە دەستەوە گرت. بەڵام کەمکەم خۆ بە زل زانین و زۆر زانین خولی گۆڕان و لا بردنی فارسەکان لە مەیدان و دەست پێکردنی زۆری و سەرەڕۆیی مادەکان تەشۆیان لە ڕەگ و ڕیشەی خۆیان دا و بەرەبەرە هۆی ڕووخان و لەبەین چوونی خۆیان پێک هێنا تا ئاخرین دەسەڵاتداریەتی و ئیمپراتوری دەوڵەتی ماد کە «ئاستیاگ» بوو بە دەستی نەوەی کچی خۆی تێک ڕووخاو نابوود بوو. ئەوجار **کوورشی کەبیر** کە کوڕی کەمبووجییە بوو. پارێزگاری ناوچەی پارسی و مادانا و کچی ئەستیاگ کە ئاخرین ئیمپراتوری مادە، یانی کوورش کوڕی کەمبووجییە و کچی ئاستیاگ بوو. کوورش بابی کەمبوجیەیە و دایکی

ئاستیاگ بووە لە نەتەوەی فارسە و دایکیشی لە نژاد مادە جا هەر بەو بۆنەوە لە نێو هەر دووک نەتەوەکان خۆشەویستی هەبوو و ڕێزی لێ دەگیرا و توانی دووبارە ئێران یەک گرتوو و یەک پارچە بکا و ئێران بگەیەنینە ئەوپەڕی گەورەی قودرەتەوە کوورش لەبەر ئەوەی کەبیر بوو پێیان دەکوت کورشی کەبیر کە بابە گەورەی بێدەسەڵاتی خۆی دەسەڵاتدار کردەوە و حورمەت و ڕێزی ڕابردووی بۆ گەڕاندەوە دایەوە دەستی حاکەمییەت و دەسەڵاتی حکومەتی مادی بە شێوەی مەشرووتە و تەعیین کراو لە ئیختیاری ئەو ناوە و بارەگایەکی گەورە و بە شکۆی بۆ دروست کرد. کوورشی کەبیر بەو دەلیلە ماوە کە دەچووە نێو هەر مللەتێک، لەشکرکشی و سپای دەبرد بە جێگای کوشت و کوشتار و خوێنرێژی و تاڵان و تاراج، عەفو و بەخششی بانگەواز دەکرد و بۆ ڕێورەسمی ئەو قەومە شکەست خواردووە ئیحترامی دادەنا و ڕێزی لێ دەگرتن و دەگەڵ ئەوەش کوورش بۆخۆی موەحەد و یەگانەپەرست بوو بەڵام بە حورمەتی ئەو نەتەوە شکەست خواردووە لە بەرابەر خودایان ئەوان چۆکی دادەدا و بەرابەر دین و ڕەسمی ئەوان حورمەتی لە خودا و موقەدەساتی ئەوان دەگرت و ئەو پادشا و دەسەڵاتدارە شکەست خواردووەی بێحورمەت نەدەکرد و لە نێو خەڵکدا سووک و چکۆلەی نەدەکردەوە و بە شەرتێک خەرج و سەرانەی خۆی دابا بە ئێران و فەرمانبرداری و حیمایەتی کردبا لە دەوڵەتی ناوندی، ئەوی لە جێگای خۆی دادەناوە و دەیهێشتەوە بێ ئەوەی بیەڵێ سەربازکێش و زەحمەت بۆ کەس پێکبێنێ یان دەست

دریژیەک بۆ گیان و نامووسی کەسێک بکا و تەنانەت بۆ بەرقەراری خزمایەتی لە نێوان ئەوان بناغەی پتەوی خزمایەتی و دۆستایەتی دادەنا لێکی نزیک دەکردنەوە.




کوورش بە هۆی ئازادکردنی یەهوودییەکان لە دەست حکومەتی سەرەڕۆ و بێبەزەی بابل و نیشتەجێکردنی ئەوان لە شاری ئورشەلیم خۆشەویستی هەموو لایەک بوو و پێڕەوی هەمووی دینەکان خۆشیان دەویست کوورش بە بەرنامەڕیزی و ڕێک و پێککردنی هەوڵین یاسا و حەقی ئینسانەکان لەسەر زەوی، هەوەڵین مەنشووری حقوق بەشەر نێوی خۆی لە مێژووی دونیادا ئەبەدی کرد بە چاکە و یادی خێری ئەویشەوە دەسەڵاتداریە تا چەند پشت دوای کوورش دەوامی هەر بووە تا ئەوکاتەی خۆ بە زلزانی و خۆویستی غرور بووە. خەسڵەتێک لە پادشایانی هەخامەنشی و یەخەی پێگرتن بە جۆرێکی لە دەورانی

دەسـەڵاتداری داریوشـی سـێهەم ئـاخرین ئیمپراتـوری حکومـەتـی هـەخامـەنشـی مـادەکـان بـە تـەواوی لـە ڕیزی حکومـەت لابردران و بێ دەسـەڵات کـران و زۆرینـەی سـەردارانـی دەسـەڵاتدار و بـەکـار و کارکوشتەی ماد لەبەین چوون و دەسەڵات و فەرمانڕەوای باقیماندە و فـەرمـانڕەواکـانی مـاد هـەر لـە چـوار چێوەی ناوچـەکـانی مـاددا کـورت کرابووە دەسەڵاتی هـیچ کۆیـەکیـان نـەبـوو و سپای فارسیش بـە هـۆی خوشگوزەرانی و نوقم بوون لـە نـاز و نیعمـەت ئـەویـش هێز و توانـای خۆی لە دەستدا بوو تا ئەو جێگایە بێدەسـەڵاتیـان دیـاری کردبـوو، لـە کاتی حەملـەی ئـەسکەندەری مـەقدوونی بـە ئێران داریـوش سـێهەم بـە جێگـای سپای یـەکگرتـووی فـارس و مـاد دەهـات لـە بـەکرێ گیراوانـی یونانی بـە هـۆی دوژمنـی دەگـەڵ ئـەسکـەنـدەر مـەقدونیـە کـە لـەو کاتـەدا دەگەڵ ئێرانیەکان ڕێک کـەوتبـوون کـەڵکی وەردەگـرت ئـەوانـی دەنـاردە مەیدانی شەڕی.

خرابتـر لـەوانـەش داریـوش سـێهەم ئـەو ئـەنـدازە لـە خـۆ ڕازی و سـەرەڕۆ بوو ئەوەندەش لـەسـەر کـەوتنی خـۆی بـەسـەر ئـەسکـەنـدەردا دڵنیا بوو کە جگە لە هێنانی دایکی و ژنەکانی بۆ مەیدانی شەر بۆ دیتنی سەرکەوتنی ئەو بەسەر ئەسکەندەردا و شکستی ئەسکەندەر بە ڕێنوێنی بـەرنامـەدانـانی سـەردار و فـەرمانبـەرەکـانی کارکوشـتە و لـێهـاتوو کۆنـەکـاری گـوێ نـەدەدا و بـە قسـەی نـەدەکـردن، تـا تووشـی هەڵـە و ئیشتباهاتێکی زۆر گەورە و تۆڵـە نـەکراوە بـوو بـە جـۆرێکی وا تـەختـی بەختی بە تەواوی وەرگەڕا و ندامەتی یەخـەی گرت و دەفتـەری ژیـانی

بە زەرەدی ئەو وەرەقی خوارد هەڵدرایەوە. لەو چاخەدا شەڕێکی گەورە لە «لیوای هەولێری ئێستا» ڕووی دا و داریوش بە دەستی دوو کەس لە خەیانتکارانی نزیکی خۆی دەکوژرێ بە نێوی «جانووسیار، و ماهیار» و ئەو دوو کەسە بە دەستووری ئەسکەندەر ئەو کارەیان کرد کە کوژرانی ئەو پیاوە«داریوش» ئیتر دەوڵەتی ماد و فارس دوایی هات و نیشتمانی ماد و فارس دەکەوێتە دەست ئەسکەندەری مەقدونییە و ئەسکەندەر توانی بە سەر ئێراندا زاڵ و لە کۆتاییدا بە سەرتەواوی ئاسیادا دەسەڵاتی پەیدا کرد و هەمووی هێنا ژێر چۆکی خۆیەوە.

لەبەر بێلیاقەتی داریوشی سێهەم، ئەسکەندەر حکومەتی ئارییایی و هەخامەنشی و ماد لە بنە هێنا و خاتمەی پێدان بەڵام پایانێکی دەردناک و غەمهێنەر بوو. جا لە دەورانی داریوش کە یەکێک لە پادشایانی هەخامەنشی بووە. لە ٤٢١ تا ٤٨٦ لە هەوەڵ هەر ساڵێک لە پەرستگای بال مەردوک کە یەکێک لە خودایان بابل بووە دیداری دەکرد دەگەڵ بال مەردوک و هەر بەو جۆرە پادشایانی پارتی و سامانیان نەورۆزیان دەگەڵ مەڕاسمێکی تایبەتی جێژن دەگرت و هەمووی ڕەعیەت و دەست و پێوەندی پادشا خۆیان ساز دەکرد جێژنانە بە پادشاوە بچن دیاری و سەوقاتیان ساز دەکرد لە شتی جۆراوجۆر وەکوو فنجان، ئاڵقە، زێڕی نووسراوە، شەمشیر، تیروکەوان، قەڵەم، مورەکەب و لە کاتی دوعا و پاڕانەوەدا کە ساڵ نوێ دەبێتەوە دەچوونە نێو کۆشکەوە و دوای دانیشتن بەرپرسانی کاخ لە ڕیزی زۆر ڕێکوپێکدا دەچوونە نێو

بارەگای شاوە و دیاریەکانیان پێشکەش شا دەکرد شا دواتر زۆری لەوانە بە نێوی نەورۆزانە دەداوە بە خۆیان. ٢٥ ڕۆژی دەما بۆ نەورۆز، دوازدە کۆڵەکەیان لە خشتی گڵ دروست دەکرد لە حەساری بەهار بەندی شادا دوازدە جۆریان دانەوێڵە پێوە دەکرد و گوڵیشیان دەگەڵ دادەچاند و لە شەشمین ڕۆژی بەهار ئەوانەیان بە نێو بارەگادا بڵاو دەکردەوە و تا ١٦ ڕۆژ لە بەهار دەچوو کە ئەو ڕۆژەیان بە نێوی مێهر یانی ڕۆژی خۆشەویستی نێودێر کردبوو ئیتر ئەوکات گوڵ و گوڵدانیان هەڵدەگرتەوە و دەیان بردنە نێو بارەگای پادشا دایان دەنا.

هێندێک لە مێژوونووسان دەڵێن جێژنی نەورۆز لە ئەسڵدا یەکێک لەو دوو جێژنەی ئاریایەکانە ئەوان لە دەورانی ڕابردوودا کاتی سەرما و گەرمایان بوو. وەرزی سەرماش و پاییز و زستان بوو زیمە zima و کاتی گەرما و سەرما Hama و هەر یەک لەو دوو کاتەی ساڵدا جێژنێک دەگیرا. هەوەڵ جێژن لە کاتی دەستپێکردنی ساڵی تازە کاتێک حەیوان و پاتاڵ لە ئاغڵەکان دەردەکران بۆ لای شینای مێرگ و چیا و چەمەن دەرۆیشتن و لە دیتنی ڕۆژی پڕتین و تیشک خوشحاڵ دەبوون ئەوە سەرەتای خۆشی و شادی هەموو بوونەوەرێک بوو دووهەم لە دەستپێکردنی سەرما کاتێک حەیوان و پاتاڵ دادەکرا و زەخیرەی زستان دەستی پێدەکرد ئەوەش جێژنی دووهەم بوو. لە دەورە و حکومەتی ساسانیان نەورۆز جێگایەکی تایبەتی لە باکوری ڕۆژهەلاتی ئێران کەوابۆ سەیر نییە لەو سەردەمەدا نەورۆز بە جێژنێکی گەورەی

دینی و مللی ئەوکات داندرابێ چونکە زەرتوشتیەکان دەڵێن ڕۆژی شەشی فەروەردین ڕۆژێکی گەورەیە لەو ڕۆژەدا بووە کە ئاشوری زەرتۆشت توانی دەگەڵ خوداوەند ڕاز و نیاز بکا. هەر بۆیەش ئێرانیان ئەو ڕۆژەیان بە ڕۆژی هیوا و هۆمێد نێو ناوە و کردوویانە بە نەورۆز. ئەو شەش ڕۆژە ئەوکات ئەوە عادەتیان بووە لە هەوەڵی نەورۆزەوە دیارە ئێستاش لە بەشی پارێزگای خوراسان هەرماوە لە نزیک ڕۆژ ئاوا بوون دەگەڵ خانەوادەی خۆیان یا دەستەدەستە کە سێ شاخە دڕوو ئاوری تێبەردەدەن دواتر پیر و جەوان و چکۆلە و گەورە بە سەریدا باز دەدەن. دەڵێن: «زردی ما از تو سرخی تو از ما».



**گوڵی بەهار**

ئەو شیعرەش دەخوێننەوە: آلا به در، بلا به در، دزد و حیز آزدیها بە در

له شەرحی دووهەم (آلا ala ) همان ئاڵ مەشهووره کە ژنێک بە خەیاڵ کز و بەدەن باریک باڵەبەرز و سورهووله و ترسێنەر کە لوتی وەکوو قور وایە و کارەکەشی دزینی جەرگ و دڵی ژنانە لە کاتی منداڵبونیاندا (دِها deha) دِها بە بنیادەمی دز و چاو داپچراو دەڵێن بە خوێندنی ئەو گۆرانییە و شێوەو و بازدان بەسەر ئاور پێیان وایە لەو ساڵەدا لە دەست ئاڵ و دز و خرابکار و چاوپیس ئەمین دەبن و ئەوانە لە ماڵەخۆیان دوور دەخەنەوە ئەوە ئێستاش لە بەشی خوراسان هەر ماوە. تا ئەو ساڵانەی دوای ئاڵ و شەوە لە کوردستانیش هەر باسی دەکرا و لەسەر زار و زمان بوو. ئێستاش لە ئێران و ئەفغانستان نەورۆز هەر وا سەرەتای ساڵی ڕەسمی مەملەکەتە و هەمیشە بە مانگی فەروەردین دەست پێدەکا کەڵک وەرگرتن لە زمان دەورانی حکوومەتی هەخامەنشی لە ساڵی هەتاوی هەر باو بووە و بەڕێوە چووە.

بەڵام دواتر بە گوێرەی هاتنە سەرکاری هەر حکوومەتێک گۆڕاوە. تا دەگاتە زانای بە ناوبانگی ئێران و ئەستێرەناسی گەورەی دونیا حەکیم عومەر خەیام لە سەدەی شەشەم کۆچی حەل بوو و لەو کاتەوە ڕۆژئەژمێری جەلالی وەکوو ڕۆژئەژمێری هەتاوی وڵات هەلبژێردرا و هەر بە حیساب ئەو دەکرا و نێوی مانگەکانی ڕۆژئەژمێری هەتاوی چەند جار گۆڕانیان بەسەردا هاتوو و ئاڵوگۆڕیان کردووە ئەوە نێوی

ئەوکات مانگەکانە بە شێوەی وتەی فارسی میانە دەنووسم کە ئی دەورانی ساسانییە کە لە ڕۆژئەژمێریدا هاتووە تا ئەو دوایانە:

١- (Fravartin(Frawashi فرەوش، ارواح گذشتگان: فروردین
٢- (Ardiwehisht(asha wahishta بهترین، بهتر(از اصول زرتشتی): اردیبهشت
٣- (Khordad(Hauwartat سلامتی: خرداد
٤- (Teer(Tishtria خدای باران: تیر
٥- (Amordad(Amartaat نامیریی، نذر گذشتی: مرداد
٦- (Shahrivar(Khshathrawara پادشاهی خواستەشدە: شهریور
٧- (Mihr(Mithra خدای مهر و قراردادهای اجتماعی: مهر
٨- (Aban(Apan آبها (لقب آناهیتا): آبان
٩- (Adhar(Atar آتش: آذر
١٠- (Dey(Dawya خدا: دی
١١- (Wahman(wahu mana تفکر برتر: بهمن
١٢- (Spandaarmadh (Spanta armaiti آرماییتی مقدس، (مادینەی خدای طبیعت): اسفند



جێژنی نەورۆز لە نێو هەمووی کوردەکان زۆر بە ڕێک و پێکی بەڕێوە دەچێ، هەر یەک بە شێوەی داب و نەریتی ناوچە جیاجیاکانی خۆیان بەڵام هەمووی کوردەکانی ئێران، عێراق، سوریە، نەورۆز بە جێژنێکی کۆنی کورد دەزانن و هەموو ڕۆژی هەوەڵی بەهار بە نەورۆز دادەنێن و بەو ڕۆژەش دەڵێن ڕۆژی نەورۆز لەسەر ئەوندە یەک قەول و یەک هەڵوێستن. لە دێهاتی کوردنشین بە تایبەت لە ئێراندا جێژنی نەورۆز بە شێوەیەکی زۆر پان و بەرین بەڕێوە دەچێ. خەڵک لە نەورۆزدا لە مەیدان و سەربان و کۆڵان کۆ دەبنەوە و ئاوری نەورۆز دەکەنەوە، پیاوان بە جودا و ژنانیش هەر وا جاری واش هەیە بە کۆمەڵ و بە یەکەوە و بە سەری ساڵی کوردی نێو دەبەن و شیعر و گۆرانی دەڵێن و هەڵدەپەڕن. بازبازێن دەکەن کورد پێی وایە زستان و ناخۆشی و سەرما و سۆڵ وخانە تەنگانە باری کردووە و جوانی و خۆشەویستی و سولح و ئاشتی بەڕێوەیە سەوزی و گوڵ و گوڵزار لە

چاو دەدا دڵ دەپشکوێ گوڵ دەپشکوێ هەر بۆیە خەڵکی کوردستان لە شەو و ڕۆژی نەورۆزدا لیباسی تازە و جوان لەبەر دەکەن بە دیداری کەس و کاریان دەچن و لە هێندێک شوێن شایی دەکەن، شایەر دێنن لە شایەکەدا ١٢ نەفەر هەر یەک گوڵێک و شەمعێک و کاسەیەک ئاوی ڕوونی شەو بەسەردا هاتوویان بە دەستەوەیە بۆ پێشوازی نوێ بونەوەی ساڵ دەچن و دۆعا و پاڕانەوە دەکەن لە بارەگای حەق کە ئەو ساڵەیان بۆ بگێڕێ بە ساڵی خێر و بەرەکەت و سوڵح و ئاشتی. دیارە کوتمان کوردەکان زمان و ئایینی جیاوازیان هەیە لە نێو کوردی ئیزەدیدا. وا باوە کە لە شەوی جێژنی نەورۆز دەچن بۆ سەحرا و ئارد دەگەڵ خۆیان دەبەن و بەو ئاردە هەویر ساز دەکەن ئەو گوڵە بەسەر دەرگای ماڵەکەیان هەڵدەواسن ئیتر پێیان وایە ئەو بەهارە ڕوو لە ماڵە وان دەکا ئەوجار ژنەکانیان نانێک دروست دەکەن بە نێوی **«سوک»** بۆ خێر و سەدەقە دەیبەن بۆ نێو قەبران.



**سفرەی حەوتسین**

دیارە کوردی ئێزەدی ئاینێکیان هەیە کە بە تەواف مەشهوورە. دوکتور خەلیل جوندی ڕەشۆ کە بۆخۆی یەکێک لەو کوردە ئێزەدیانەیە ئوستادی زانکۆی «گوتینگن»ی ئەڵمانە دەڵێ لە ڕابردوودا کورد پێی وابوو لە ڕۆژی نەورۆز کە ڕۆژی هەوەڵی ساڵە، فریشتەیەک هەیە کە مەلەک تاوەسی ناوە، دێت و دەگەڵ خۆی خێر و ڕەحمەت دێنێ و هەروا دەڵێ ئێزەدی داب و نەریتێکی تایبەت بە خۆیان هەیە لە ڕۆژانی نەورۆزدا ئەوان لەو مانگەدا ژن مارە ناکەن و ناهێنن چون دەڵێن مانگی نیسانە کە «بووک هیوانە»ی پێ دەڵێن، کەس حەقی نییە دەبێ ژنی تێدا مارە نەکرێ و هەروەها لەو مانگەدا کەس حەقی نییە عەرز بکێڵێ یا لەو چەند ڕۆژەدا زەوی داچێنن چون دەڵێن لەو مانگەدا گیا و گژ مەرخەس دەکرێ و گوڵ و گیا دێتە دەرێ. **یەکی دیکە لە داب و نەریتی کورد ئێزەدی** ئەوەیە کە هێلکە ڕەنگ دەکەن، چون شکڵ و وێنەی هێلکەش وەک زەوی وایە ڕەنگکردنی هێلکە بەو مەعنایەیە کە دونیا وەک ئەو ڕەنگانە وایە کە بە جوانی بخەملێ و دەشت و کێو شین بێ.

دواکەی کوردزمان دیکەن کە ئەوانیش تیرەیەکی دیکەن و نەورۆز بە شێوەیەکی تایبەت بە خۆیان بەڕێوە دەبەن و هێندێک لە مێژوونووسان وەکوو بەڕێز مووسا ئەنتر نووسەری کورد پێی وایە زازا هەمان ئێزەدییەکانن جارجار زازا هەمان کوردی ئێزەدی حیساب دەکرێن. ئاماری ڕاستی کوردی ئێزەدی لە دەستدا نییە بەڵام زۆرترین جەمعیەت کوردی ئێزەدی لە عێراقن، بەڵام هێندیکشیان لە وڵاتەکانی

سـووریە، تورکیـە، ئـەرمـەنسـتان، گورجسـتان، ئێرانـدا هـەن و بـڵاو بوونـەتـەوە و ئـەهلـی حـەقیشـیان پـێ دەڵـێن. ئیـزەدی باوەڕیـان بـە فریشتەیەک بـە نێوی مـەلـەک تـاوس هەیـە کـە لـە مـان و ژیانی ئـەوان لـەسـەر زەوی چاودێری دەکـا و جاروبـارە لـە ئاسـمانەوە دێتـە سـەر زەوی لە بارەی پەیدا بوون و سەرچاوەی ئیزەدی نەورۆزەوە باوەڕی جۆراوجۆر هەیە هێندێک بە بۆنەی نێوەکـەیان وەپالی بە یـەزید کوڕی معاویە دەدەن هێندێک دەڵێن ئەسڵی ئەوان لە یەزید بووە و نێویشیان دەگـەڵ ئیـزەدی زەرتۆشـت موناسـبەتـی هەیـە و بـەو جـۆرە ئیـزەدی ڕیشەی زەرتۆشتی هەیە و هێندێکی دیکە ئیزەدی یەکێک لە کۆنترین پیڕەوانی دین بابل و سومێر دەخوێننـەوە و هێندێکیش دەڵـێن ئـەوانـە ئەهلی حەقن ئەوە بوو ڕیشە و نەورۆزی ئیزەدی و زازا.



**ڕێوڕەسمی نەورۆز لە نێو کوردی ئێراندا:** دەست لـە خـەنـە دەدەن جاری وایـە کچێکی گـەڕەکی جامێک خـەنـە دەگرێتـەوە بـە هـەمـووی گەڕەکیدا دەگێڕێ تا کچ و ژن دەستیان لە خەنە بدەن. زۆرتر کوڕان بە

دەوری ئاوردا هەڵدەپەڕن، هەلاوەمەلاوە دەکەن. ئێوارێی نەورۆز ئەوە دەڵێن: «ئاور سوورە، ئاوری نەورۆز بۆخۆم سوورە بەڵای ئەوساڵ لە خۆم دوورە لە خۆم دوورە». دواتر کچ و کوڕی میرمنداڵ هەر یەک دەسرەیەک، توورەکەیەک بە دەستەوە دەگرن بەدووی یەکدا دەڕۆن بۆ ماڵان. دەڵێن: «هەلاوەمەلاوە بەشی من ماوە لەبن تاوە، کوڕەکەتان بێ بە زاوا». ساحەب ماڵیش ئەوەی سازی کردبێ و شکی بەرێ دەیان داتێ. هێلکە، برێشکە، مێوژ، گوێز، سنجو، تۆشە، نەقوڵ، خورما، دراو، برێشکەی گەنم. هەروا ئەوە ئی ڕۆژییە، بەڵام شەوێ لاوان کۆ دەبنەوە دەڵێن نۆبەی جحێڵەکانە ئەوان لەنتەر بە دەستەوە دەگرن و حاجەتی دیکە وەکوو خورجین یان سەتڵ کڵ و کڵدانو کەلتور و ئاوێنەی تێ دەخەن و دەڕۆن بۆ سەربان لە کولاوکەوە دەیخەنە خوارێ بە دەسرەیەکی و دەڵێن: «هەتەڕێ و مەتەرێ واین لەسەرکولاوکەی سەرێ نەورۆزانەمان بۆ بخەنە دەرێ». ساحەبماڵ دەزانێ ئەوانە چییان دەوێ بۆیان لە پرێسکەوە دەپێچێ و بۆیان بەڕێ دەکەن. جاری واش هەیە ئەو ماڵە کچی جحێڵیان هەیە کلدانەکە دەردێنێ لە حاجەتەکە چاوی پێدەڕێژێ لەوێی دەخاتەوە. جاری وایە لە نەورۆزدا بە شۆخی بۆ خۆشی کۆسە ساز دەکەن. کۆسە ئەوەیە بە شێوەی قورعە یەک نەفەر دەکەن بە کۆسە ئەویش دەبێ شۆخیباز بێ، لێی وارید بێ، کەس نەیناسێتەوە تا دوایی دەیهێننە سەر شکلی حەیوان یان جانەوەرێک پیاو لێی دەتۆقێ، دەیبەن بۆ ماڵان گۆرانی بۆ دەڵێن هەڵدەپەڕێ، چەپڵەی بۆ لێدەدەن **دەڵێن: «کۆسە هاتووە بۆ تووتن،**

**کەوتووە وەک سەگی کوڵکن»**. خاوەنماڵ هێلکە و مێوژ و پارە و تووتن و... دەداتێ و بەڕێیان دەکا، ئەوە بوو بە کورتی ڕێوڕەسمی نەورۆز و نەورۆزانە لە ڕابردوو تا ئێستا لە ئێراندا.



**نەورۆز لە تورکیە:** کوردی تورکیە ساڵەهای ساڵ بۆ پێکهێنان و بە ڕەسمی ناسینی نەورۆز لەو مەملەکەتەدا کە قەدەغە بوو تێدەکۆشین. بەڵام دواتر هێواشهێواش حەوڵیان دا تا ڕۆژی نەورۆز لە تورکیە لە نێو کوردەکاندا بە جێژنی زۆر گەورەی نەتەوایەتی حیساب بکەن. ئێستا بە شێوەیەکی پان وبەرین لە شارەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیە وەکوو دیاربەکر، ئورفا، ماراش و ماردین و باقی شارە کوردنشینەکان نەورۆز مەڕاسمێکی پان و بەرینی هەیە و بە شێوەیەکی زۆر خۆش بە ڕێوەی دەبەن. لە تایبەتمەندییەکانی ئەوان هەڵپەرکێ، گۆرانی، وتار خوێندنەوە و شیعر و سروود کڵەداری زۆر گەورەی قەڵاشکەری هەڵدەچنن، بە دەوریدا دێن ئاوری تێبەر دەدەن و گەرەمشقاڵ لێی بڵێند دەبێ و عالەمێکی زۆر لە ژن و پیاو و لە دەوری دەهاڵێن وسەیری دەکەن، لە ماڵانیش شیرینی خۆماڵی و تەعام و خواردەمەنی تایبەتی نەورۆز لە ڕێوڕەسمی دیکەی نەورۆزی کوردەکانی تورکیەیە.

**کوردی عێراق**: کوردی عێراق ڕێز لە هەموو جێژنەکان دەگرن چ جێژنی دینی، چ نەتەوایەتی، بە یەک چاو دەڕواننە هەموویان خەڵک لەوێ ئازادە بۆ ڕێوڕەسمی جێژنی خۆیی کورد و ئیزەدی و مەسیحی. کوردی عێراق لە جێژنی نەورۆز لە جێگای تایبەتی کۆ دەبنەوە ئاور دەکەنەوە، بەرپرسانی گەورە بەشداری دەکەن شیرینی دەدەن. شادی و چەپڵە و هەڵپەرکێ و بەرنامەی زۆر جوان دەڕازێننەوە بۆ نەورۆز. بەڵام ئەوان ڕۆژی چوارشەنبەسووری و سێزدەبەدەر بە ئی کورد

نازانن و ساڵی کوردی جودا لەوانە حیساب دەکەن. گوایە کوردی عێراق لەو ڕۆژانەدا وەک چوارشەنبەسووری و سێزدەبەدەر هیچ ناکەن و بە بەشی نەورۆزی نازانن. زۆر بە ڕێزەوە دەڕواننە نەورۆز و بە جێژنێکی گەورەی کوردی دەزانن و زۆریش کاروبار و حیسابەکانیان بە ساڵ و مانگی کوردییە و هەر بۆیەش ساڵی کوردی هەر لەوێ دەخوێندرێتەوە و دەنووسرێ.

---


**سەرچاوەکان:**

١- ویکی پدیا فارسی، نوروز

٢- فرهنگسرا، نوروز

٣- وبلاگ طلای سبز تاریخ نوروز و تحولات کمی و کیفی آن

۴- انجمن ادبی شفیقی نوروز در تاریخ

۵- هفتەنامەی نصیر بوشهر، نوروز جلوەگاه اسطورەای آفرینش

نویسندە: محسن http://gashomar. Blogfa.com

۶- آثارە الباقیە ابوریحان بیرونی

٧- مقالات ارسالی بە آفتاب

٨- عەزیز و تەکش مامۆستا عومری ساڵحی ساحێب (کوڵێل)

# سەماوەر و چایی



## سەرەتا:

چـایی کـە لـە ئـاو دەکـرێ و دەکـوڵێ دەبێتـە مـایعێکی ڕەنگـدار و بۆنـدار. تایبــەتمــەنـدی دەرمــانی و حــەســانەوەی مێشــک و ســاغی دەمارەکانی لەشی تێدایە. دیارە چایی لە چەند ڕیشـەوە بنـەمایـەک پێک هاتووە. لە کاتی پەیدا بوونی تا چەند دەیـەی دوایی دەوڵـەمـەند و پیاو ماقووڵەکان نەبا نـەیان بـوو و نـەیان دەخـواردەوە و لـە ٤٠-٥٠ ساڵەی دوایی کە زۆر پەرەی ئەستاندووە و بۆتـە گوڵی مـەجلیسێ لـە هـەموو جێگایەک هەیە و کەس بێ ئەو کۆڕ و کۆبوونەوەی بۆ پێک نایـە، بۆتـە

خۆراکی ڕۆژانه. له ڕابردوودا بۆ میوان، شەوچەله، قاوە، چایی و شتی دیکه هەبوو بەڵام ئێستا خواردنی چایی پەرەی ئەستاندووە چایی له هەوەڵەوە وا دەردەکەوێ لە قاپ، قومقومە، مەتارە و کەتریدا کوڵاوە و خوراوەتەوە. دواتر قۆری داهاتووە و لەودا دەم کراوە. بەرەبەرە سەماوەری ڕەژی، نەفتی، بەرقی، گازی پەیدا بووە لەوانە کەڵک وەردەگیرێ. ئەوە کورتەیەک لە مێژووی پەیدا بوونی چایی و سەماوەری ڕەژی باسی دەکەین و دەنووسین هیوادارم بەهەرەی پێویستی لێ وەربگیرێ ئیشاڵلا.

**٨هەتاوی**

## چایی له ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا

ڕابردووی خواردنی چایی بۆ سەدەی ١٧ زایینی دەگەرێتەوە. دونیاگەڕان کوتوویانه که دەوڵەمەند و پیاو ماقووڵەکان کۆ دەبوونەوە چاییان دەخواردەوە لە پاشان محەممەد عەلی مەشهوور بە «کاشیفوسسەڵتەنە» چایی دەچاند لە ساڵی ١٢٤٣ هەتاوی لە توربەتی حەیدەریە دەیخوێند دواتر چووە «دارولفنوون» ئیتر ڕۆیشت بۆ زانستگای سۆربۆنی فەرانسە خوێندنی تەواو کرد و بڕوانامەی وەرگرت دواتر هاتەوە ئێران لە لایەن حکوومەتی موزەفەرەددین شا کە حاکمی ئەو کاتی ئێران بوو کە بە ژێنێراڵی کونسۆری ئێران لە هێند و

لەوێ هەموو ڕێ و شوێنی چایی ڕەچاو کرد و فێر بوو هەر کە هاتەوە ئێران لەسەر ڕواڵەتی بازرگانێک شێوەی خواردن و چاندنی چایی لە ئێراندا بڵاو کردەوە و فێری خەڵکی کرد تا لە دونیادا بڵاوی کردەوە شاری لاهیجان کە جێگای نیشتەجێ بوونی«کاشیفوسسەڵتەنە» بوو بە هۆی ئاو و هەوای موناسب بۆ چاندنی چایی بە باش زانی و ئەوەی هەڵبژارد بۆ پەرە پێدانی چایی. ئێستا قەبر و ئارامگای«کاشیفوسسەڵتەنە» لە لاهیجان بە سووڕەتی سەرچاوەی ناسینی چایی ناسراوە و ڕێزی لێ دەگیرێ، پێنج دەرسەدی چایی دونیا لە ئێراندا دەخورێتەوە بۆ پەیدا بوونی چایی قسەی زۆر لە پشتە کە وەک ئەفسانە دەچێ.١- بە پێی داستانێکی قەدیمی چەند هەزار ساڵ لەمەوبەر لە ئەسەر هاتنی با گەڵایەکی چایی کەوتۆتە نێو ئیستکانێکەوە کە لە دەست«شێن نۆنگ(shennong)»دا بوو و حاکم ئەوەی بە شتێکی باش لە قەڵەم دا ئیتر چایی بوو بە عادەت.

٢- هەمان«شێن نۆنگ» سەر کردەی گەورەی چین لە سەفەردا دەبێ، ئەو کە زۆر زانا و بەناوبانگ بووە باوەڕی وا بووە ئاو دەبێ بیکوڵێنن جا بیخۆیەوە ڕۆژێکی ئاوی وەسەر نابوو بکوڵێ دیتی چەند گەڵای چایی لە ئاوەکە کەوتووە دیارە ئاوەکە کوڵیبوو. پادشا کە زۆر زیرەک و وریا بوو قومێکی لێ خواردەوە زۆری بە کەیف بوو لە تام و بۆنەکەی سەر سام ما ئیتر مەعلوومی کرد چایی خۆشە و قازانج و سوودی زۆرە.

٣- ئەوەیە کە گۆیا یەکێک لە پایەگوزاران مەکتەبی بودائی بە نێوی«بودیهارما(Bodhiharma)» نەخۆش دەبێ دەچێ بۆ سەحرا ئاو گەرم دەکا لە ناکاو چەند گەڵای چایی کێوی لە ئیستکانەکەی دەکەوێ ڕەنگ دەداتەوە، دەی خواتەوە زۆری پێ خۆش دەبێ و پێی چاک دەبێ. ئەوە ئیتر چایی بڵاو دەبێتەوە.

**چایی چەند بەشی هەیە:**

١. چای سپی

٢- چای سەوز

٣- چای سوور

٤-چای ژێنمایکا(Genmaicha)

٥- چای گوڵ عەتر.

ئەوەش بەشەکانی چایی.

## مێژووی پەیدا بوونی چایی

لە کەناری بەحری ڕەش لە ڕۆم، یونان لە پێش ساڵەکانی سەدەی ٨-٧ پێش میلاد چایی دۆزرایەوە و تۆوی چایی بۆ هەوەڵین جار لە چین ناسراوە کە بەرەبەرە تایبەتمەندی دەرمانی ئەو دیاریی کرد و بە کاریان هێنا و لە سەرەتاوە چایی بە ڕەنگ و شکڵی جۆراوجۆر لە کار دەکرا. هوڵەندێکان لە سەدەی ١٧ چاییان لە چینەوە بردە ئورووپا و لە دوکانی عەتار و عەنتێکە فرۆش دایان دەنا. بۆ ماوەیەک فرۆش و خواردنی چایی لە لایەن بریتانیا و دواتر لە ئەمریکا قەدەغە کرا سەرەنجام هەر لە لایەن ژێر دەسەڵاتی بریتانیا بە قاچاغی ٣٤٢ سەندووقیان واریدی ئوروپا کرد ئەسڵی وشەی چایی چینیە و لە چین بە کاری دێنن و لە باکوری هێندوستانیش بە کار دێ هەر بەو ڕەستەیەش واریدی زمانی کوردی و فارسی بووە و بە عەرەبیش هەر چایی پێی دەڵێن. چایی سەرچاوەیەکی سروشتییە ئەلەوانە پێک هاتووە: کافئین،تئۆفیلین، تیانین و ئانتی ئۆکسیدان تێکەڵ بووە. بەڵام بە بێ چەوری کەربۆهیدرات یان پرۆتێئین. دیارە تامێکی خۆشی هەیە کە لە لەشی مرۆڤ کار دەکا و هێندێ تامی تاڵی هەیە و تفتە بۆ بەدەن سوود و کەڵکی تایبەتی هەیە. هێمنی بە لەش دەگەیەنێ و ڕیخۆڵە خاوێن دەکاتەوە و بۆ دەمارەکانی لەش زۆر باشە و بۆنی دەمودان لا دەبا و دووبارە دەڵێن مێژوونووسان:

تۆوی چایی زۆرتر بە شێوەی سروشتی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی چین شین دەبێ.

# مێژووی سەماوەری ڕەژی



سەماوەر وشەیەکی ڕووسیە، بە مەعنای خۆکوڵ ئەو کاسە فلزییە عەنباراوێکی هەیە کە بە هۆی گەرمای ئاورخانەکەی ئاوەکە دەکوڵێ.

بە پێی دوایین هەواڵ و پرسیار و لێکۆڵینەوە جێگای پەیدا بوونی سەماوەر خوراسانی گەورە بووە کە بۆ دێم کردن و کوڵاندنی گیای دەرمانی کەڵکیان لێ وەرگرتووە و ئەو قاپە لەخۆدا دەکوڵی«خودجوش» لە سەدەی ١٨ زایینی لە ئێرانەوە واریدی ڕووسیە بووە، پێشەسازانی شاری«تۆڵا» ئەویان بە کەرەسەیەکی هونەری دانا و نێوی سەماوەریان لەسەر دانا و لە ساڵی ١٧٧٨ زایینی تفەنگ سازێکی ڕووسی بە نێوی«فئۆ

دۆرلیسیتیسیەنFydor lisitisin» بە نێوی هەوەڵین وەستای سەماوەر پیشەسازیەکی چکۆلەی لە باشووری «مۆسکۆ» لە شاری«تۆلا» ساز کرد کە دیارە هەوەڵین بەرهەمی ئەو کارخانە سەماوەری چایی خواردنەوە بوو. دیارە هەرچی دەیخواردەوە پێی خۆش بوو و لە نێو خەڵک بڵاو بووە بە جۆرێکی وا کە لە ساڵی ١٨٩٦ زایینی نزیک بە ٧٠ کارخانەی سەماوەرسازی چکۆلەی لێ ساز کرا و هەوەڵین سەماوەر یان بە قەولی خەڵکی گشتییە و عادی ئەو کات«حەمام برینجی» واریدی تاران بوو کە ئەوکات «میرزا تەقی خانی ئەمیرکەبیر» کە سەرۆک حکومەتی ئەوکات بوو، لە نووسراو و کارخانەکاندا سەماوەر هاتووە بەڵام خەڵکی قەدیم و نەخوێندەوار بە حەمام برینجی نێو دەبەن و ئەوەشی پێدەڵێن لە ڕووسیە، هێند و لە خوراسان هەر سەماوەرە. ئەوە ئێستا ڕوونی دەکەینەوە سەماوەر و سەروبەرەکەی.



**ڕوونکردنەوە:** سەماوەری ڕەژی ئاوا بووە، دوو جۆریان بووە:

١- سەماوەری تەنەکە ٢- سەماوەری زەرد

سەماوەری تەنەکە هەر یەک جۆر بووە ئەویش دەستی یان کارخانە بەڵام سەماوەری زەرد سێجۆریان بووە:١- میسوار٢- نیگەڵە ٣- زەردی عادی ئەویش تەورێز یان زەنجان بووە. بۆ سەماوەر پایەتەختێکیان ساز کردووە بە ئەندازەی ئەوەی سەماوەری لەسەر دانێن و چادان لەبەریەوە بچێ، ئەبەوەیان دەکوت پایەی سەماوەر یان بنەسەماوەر ئەوە جودا لە سەماوەر بوو، نەججار دروستی دەکرد.

**سەماوەر ئالەوانە پێکهاتبوو:** لەبنەوە پایەیەکی هەبوو تا بن ئاتەشخانەکە پێیان دەکوت پێچکی سەماوەر، ئەو بەینە کونکون بوو پێیان دەکوت «هەواکێشی سەماوەر» یا «باخۆر». لوولەیەکی سەخت و قاییم لە نێوەڕاستی سەماوەردا دەهاتە دەرێ فەنەر یان مەفرەق بوو، ڕەژییان تێ دەکرد ئەوە سەماوەری دەکوڵاند یان وەجۆشی دەهێنا. بەوەیان دەکوت«ئاتەشخانە». ئەو ئاتەشخانەیە بەو زەردانە کە باسمان کرد بە قەڵایی دەوری دەدرا و دەوری دەگیرا هەتا سەرێ بەوەیان دەکوت «عەمباراو». ئاو کە لەوە دەکرا ئاتەشخانەکەی بە نێودا دەهاتە دەرێ. سەماوەر دوو دەسکی پێوە بوو کە زۆرتر داریان تێدەخست تا دەست نەسووتێنێ ئابەوەیان دەکوت: «دەسکی سەماوەر». ئابەوە سەماوەریان پێ ڕادەگوێست و ئێرە و ئەوێیان پێ دەکرد. سەماوەر دوو سەری هەبوو؛ یەکیان سەری ئاوەکە بوو تا تەپوو تۆز نەچێتە نێوی پێیان دەکوت «سەری سەماوەر». ئەوەش سێ نیشانەی پێوە بوو کاتێک ئاویان تێدەکرد لە سەماوەرەکە، ئەو سەرەیان هەڵدەگرت و

ئەوانیش داریان پێوە بوو تا دەست نەسووتێنێ. ئابەوەیان دەکوت «ئاشاق». نیشانەیەکی دیکە بوو کاتێک سەماوەر دەکوڵی ئەویان لادەدا بۆ ئەوەی هەم زۆر نەکوڵێ و هەم هەڵمەکەی بێتە دەرێ، بەوەشیان دەکوت کەڵەباب. دیارە زۆرتریش بە شکڵی کەڵەباب دروست دەکرا. و سەری دووهەمی سەماوەر بە سەر ئاتەشخانە و سەری ئاوەکەدا دەکرا لە ئاتەشخانەکە دەهاتە دەرێ و پاڵی وەسەری ئاوەکە دەدا. بە لوولەی ئاتەشخانەکەوە ڕادەوەستا بەوەشیان دەکوت «دەمکێش». چادان کە چاییان تێدەکرد لە سەر ئەوەیان دادەنا، پارچەیەکی پەشمی یان حەریریان بەسەر چادانەکەدا دەدا بۆ ئەوەی چاییەکە دەم بکێشێ و ڕەنگ بداتەوە و بەوەشیان دەکوت سەر چادان. لەبن سەماوەرکەش لوولەیەکیان تێدەگرت کون بوو بۆ نێو عەمباراوەکە لەسەر ئەویشەوە دەسگیرەیەکیان تێدەخست ئاو بەودا دەهاتە دەرێ و دەگیراوە ئابەوەشیان دەکوت لوولەی سەماوەر و شێرەی سەماوەر و ئەگەر ڕەژییان لە سەماوەر دەخست بۆ ئەوەی خەفە نەبێ و سەماوەر زوو بکوڵێ لوولەیەکی نیو میترییان لە تەنەکە بۆ ساز دەکرد بە سەر ئاتەشخانەکەیاندا دەکرد، زوو دەکوڵی چون ڕەژییەکەی دەگەشاندەوە ئەبەوەیان دەکوت: «دووکەڵکێش». تێلێکیان ساز دەکرد بە قەد پیاڵە قووڵ بوو ڕەژییان تێدەکرد ئاوریان دەدا، هەڵیان دەسووڕاند بە دەوری سەریان، دەگەشاوە و لە سەماوەریان دەکرد. ئەبەو تێلەیان دەکوت «تاوڵەمە».

فەنەرێکی جوانیان دێنا بە ئەندازەی گەزێک دوولایان دەکردەوە لایەکیان بە ئاڵقە قاییم دەکرد و لایەکیشی ئازاد بوو پێیان دەکوت «دەمی مەقاش». سەرەکەی دیکەشی ئازاد بوو ڕەژییان پێ لە سەماوەر دەکرد بۆ ئەوەی دەستڕەش نەبێ و پیس نەبێ پێیان دەکوت «مەقاش یان ماشە». ئەوە بوو بە کورتی ئەو کەرەسە و حاجەتانەی کە سەماوەر ڕێ دەگرێ، پێک دێنێ و لێی دروست کراوە.

منبع: سایت http://samavar-mandegar.com/

# کلتوور و ڕێوڕەسمی ڕابردوو

## هەرەوەز

لە ڕابردوودا بە هۆی ئەوەی کە کاروباری وەرزێڕی، ئاژەڵداری، مەعامله و جووت و گا و خەلە و خەرمان لە دێهاتدا هەر بە دەستی بوو و هیچ کەس بەتەنێ کاری خۆی بۆ نەدەکرا و هەموو وێکڕا کاریان بە یەکتر بوو چونکە ئیوا بوو یەک تەن بوو و یا زۆر دەوڵەمەند بوو. جا بۆ ئەوە دەچوونە یارمەتی یان یاریدەدەری یەکتر بەوەیان دەکوت «هەرەوەز». هەرەوەز زۆرتر ئەلەوانەدا دەکرا دەست بە دروێنە دەکرا هێندێک پیاویان زۆر بوو، زووتر کاری خۆیان تەواو دەکرد ئیتر ڕۆژێک دەحەسانەوە، ڕۆژی دواتر کێ فەقیر و پیاوی کەمبایە دەچوونە یاریدەی ئەوان و تەواویان دەکردن و سەربڕانە و خواردنی ئەویش ئەوجار هەر دووک ماڵ دەچوونە یارمەتی ماڵێکی دیکە تا هەمووی دێیەکە تەواو دەبوون لە دروێنە. ئەوجار بۆ خەلە و خرمان هەر کە دەست بە گێرە دەکرا و خرمان هەڵاویشتنی ماڵێک نەجاتی بایە، دەچوونە ئەو ماڵەی دیکە تا هەمووی خرمانی ئاوەدانی سوور دەکرا و هەڵدەگیرا و گەنم دەهاتەوە ماڵێ. دووبارە کاتی کاکێشان ئەوکات نە ترێلی و تراکتۆر هەبوو نە عەڕابە. کا و گزرە هەر بە یەستر و گوێدرێژ بوو، بۆ تەواوکردنی کاکێشانی یەکتر و قۆریدانان هەر ماڵێک کە ئیخۆی تەواو دەبوو دەچووە ئەوەی دیکە لە ماوەیەکی کەمدا هەمووی

دێیەکە تەواو دەبوو. لە بارەی جووتی پاییزان یان جووتی شکارتە داچاندن ماڵێک لە جووت وەدوا کەوتووە یان گایەکی مردووە وێکڕا دەچوون هەمووی ساحەب جووتی نێودێ تووەکەیان بۆ دادەچاند و جووتەکەیان بۆ دەکرد، یان مەلای ئاوەدانی یا کابرایەکی ڕەشایی پەڵە زەوییەکەیان دابوویە دایچێنێ بە شکارتە، وێکڕا هەرەوەزیان بۆ دەکرد جاری وا بوو بە تۆوی خۆی بۆیان دادەچاند و تەواویان دەکرد. **یان سەربان ماڵین** لە ڕابردوودا بەفر زۆر دەباری ئیوا بوو یەک تەن بوو دەنا کاری دانگە و پاتاڵو ئاودانو بەخێوکردنی حەیوانی زۆر بوو، زوو فریای سەربان ماڵین نەدەکەوتن بەفر دەماوە شەوی بەسەردا دەهاتەوە خەڵکی نێودێ دوای سەربانی خۆیان دەستیان دەدا بێڵ و وەروەرە دەچوون بۆ یاریدەیان، زۆر زوو سەربان و دەرک و بان و حەسار و گۆێسوانەیان بۆ خاوێن دەکردەوە لە بەفر ئەوسەردەم هەستی هاوکاری و خۆشەویستی لە نێو خەڵکدا زۆر بوو، دەوڵەمەند بۆ فەقیر زۆر باش بوو، فەقیریش زۆری ئاوڕی دەوڵەمەند دەداوە دەچووە کۆمەگ و یاریدەی، ئەوکات زۆر ماڵی دەوڵەمەند و ساحەبخێزان بوو ناشتایان چێشتیان لێدەنا **یەکێک لەو چێشتانە ترخێنە** بوو بە تایبەت ئەو ڕۆژانەی کە خەڵک دەچوون سەربانیان دەگەڵ دەماڵین، مەنجەڵێکی گەورەیان ترخێنە بۆ لێدەنان.



## ترخێنه چییه و چۆن ساز دەبێ؟



دێنن گەنمی سەرداری یا هەر گەنمە بەهاروو دەکوڵێنن دواتر لە سەربان لەبەر تاو هەڵی دەخەن ویشکەوە بێ. ئەوجار گیایەک هەیە بە کوردی پێی‌دەڵێن«شێلم، شەلەم». بە فارسی پێی‌دەڵێن:«شلغم».

دەیچێنن شین دەبێ گەڵای شین ئەو شێلمە دەگەڵ گەنمەکە دووبارە دەکوڵێنن تا جوان دەکوڵێو تێکەڵ دەبێ؛ ئیتر دەیکەن بە سەلک و تۆپەڵەی دەکەن و لەبەر تاو هەڵی دەخەن تا ویشک دەبێ، کە ویشک بوو هەڵیدەگرن بۆ زستانێ جا ئەوکاتیش کە لێیان دەنا ئەوانەیان تێدەکرد لە ترخێنە: گوێز، لەتکە هەرمێ، قەیسی ویشک، مێوژە ڕەشکە، گۆشتی قاوڕمە، نیسک، نۆکە سوورە، چەوەندر و چەند شتی دیکەیان دەگەڵ دەخست و لێیان دەنا چێشتێکی بە تام و خۆش و بێزەرەد؛ کابرا قامکی خۆی پێوە دەمژی جا دوای تەواو بوونی سەربان ئیتر نەیان دەهێشت کەس بڕواتەوە دەبوو بچن نان بخۆن، ترخێنەیان بۆ تێدەکردن ئەوە بوو هەرەوەز کە لە وڵاتی مە و نێو کوردەواریدا زۆر هەبوو.

# بۆدراو



«گەنم و دەستار و بۆدراو»

**یەکی دیکە لەو فەرهەنگە قەدیمانە بۆدراو بوو** کاتێک گەنم دەگەیشتێ سوور دەکرا و دەهاتەوە ماڵێ دەهاتن زۆرتر گەنمی سەرداری خاوێنیان دەکردەوە، دایان دەبێشت، جوان‌و پاکیان دەکرد بە سێڵ یا ساج. دەیان کردە برێشکە دەیان برژاند دواتر لە دەستاڕدا وردیان دەکرد یانی بە دەستاڕیان دەکرد. دەستاڕ دوو سەنگی چکۆلە بوو کە سەردەستار و بنەدەستاڕیان پێ دەکوت لە نێوەڕاستەتدا گەروویەکی هەبوو گەنمەکەیان تێ دەکرد دەسکێکی داریان لە سەرەوە وێدەخست بە دەست هەڵیان دەسووڕاند گەنمەکەی ورد دەکرد،

ئـەوکـات زۆرتـر لـە داشکسـتان دروسـت دەکـرا کـە دێیـەکـە لـە دێهـاتی چۆمی جـەغـەتوو. دوای دەسـتاڕ کـردن، دایـان دەبێشـت، درشـتەکـەیان لـێدەنـا بـە چیشـت بـۆ زیافـەتـی کاسـپکار و درووێنـەوان و سـەربڕانـەی درووێنـە بـە نێـوی بـۆدراو – و- ڕۆن کـە دیـارە زۆریـش خـۆش بـوو کەیفیان پێی ساز دەبوو، وردەکەشیان دەکرد بە قاوت.

قاوتیش دەگەڵ دۆشاو دایان دەنـا بـۆ شـەوچـەلـە بـە نێوی قـاوت و دۆشـاو دەنـا دەگـەڵ شـیری حـەیوان تێکـەڵیان دەکـرد و هـەم بنیـادەمـی گـەورە دەیخـوارد و هـەم دەیـانکـردە قوولـەمیچـە بـۆ منـداڵ دەیـانـدانێ دەیـانخوارد، زۆربـاش پێی قەڵـەو دەبـوون و گـەورەش دەبـوون. بـەڵام ئەوکات وا باس دەکرا دەیانگوت قاوت بۆ مەعدە لە هـەموو دەرمانێک چاکترە و بە کەڵکترە.

# دانوو



**«ئامادەیی منداڵەکان بۆ دانوو»**

لـە ڕابـردوودا لـە وڵاتـی ئێـران مـەڕداری زۆری پـەرە پـێ‌دەدرا و چونکـە زۆرینـەی خـەڵک دێ‌نشـین و لـە دێ‌نشـینیدا خێڵاتـی و چـادر و هەوارچییەتی زۆرتر باو بوو جا لەبەر ئەوەی ژیانی کۆمەڵی ئەوکات لە لایـەن مـەڕداریوە دابـین دەکـرا زۆر لـە فکـری مەڕداریـدا بـوون و لـە حەولی ئەوەدا بوون مەڕ و پاتاڵ بە جوانی بەڕێوە بچێ بێ گیروگرفت بێ، دیارە وەک لە نێو پاتـاڵداردا مـەشـهوورە زینـدەمـاڵ لـە بـەڵا نزیکـە ئەویش مەڕ لە هەموو گیانلەبەرێک ناسکترە، زۆرتر تووشی نـەخۆشـی دەبێ. یەکێک لەو نەخۆشیانەی مەڕ دانوو بوو بەو هۆیـەی کـە ئـەوکات دوکتـور و دەرمـان نـەبـوو خـەڵک هـەر لـەسـەر بـاوەڕ و ڕێوشـوێنی ڕابردووەکان کاری دەکرد لە ڕابردووشدا بۆ دانووی مـەڕی ڕەسـمێکی

تایبەتی بوو کە لە هەموو ماڵە دەوڵەمەندێک و لە کاتی زستان نزیک بەزەوی مەڕی بەجێ دەهات دەیان کرد ئەویش ئاوا بوو کاتێک مەڕ یان بزن بەریان داویشت دیارە با ئەوەش بڵێن بەرهاویشتنی حەیوان زەرەدێکی گەورەیە بۆ دەوڵەمەند چونکە مەڕدار ئەو هەموو زەحمەتە بە پاتاڵەوە دەکێشێ و بەو نارەحەتییە تفاقی بۆ دادەخا. شوانی بۆ دەگرێ بۆ دوو حاسڵی ئەسڵی مەڕە ١. بەرەکەی ٢. ڕزقەکەی. بۆ ئەو دوودانەیە و ئەگەر حەیوان بەری هاویشت هەردووکیان لە کیسی سێحەب ماڵ دەچن بێچووەکەی بە مردوویی دەبێ و تازە ویشکیش دەکا و شیریش نادا مەگەر تاقتاق ئەویش بە بانۆک بیخەیە بەری، بانۆکی بکەیەوە بەرخی دیکەی بخەیە بەری و ئەویش هەڵیگرێتەوە و شیری پێداتەوە و ویشک نەکا دوو بەختەکییە.




**«ئاغەڵی مەڕی»**

بە هەرحاڵ کاتێک مەڕ بەری هاویشت و مەعلووم بوو بێچۆکەی زیبکەی بە لووت و دەم وچاوییەوە هەیە دەیان کوت دانوویەتی، دەبێ دانووی بۆ بکەین دانوو کردنیش ئاوا بوو سێحەبماڵ دەهات مەنجەڵێکی گەنم وەسەر دەنا پڕی دەکرد دوو تا سێ حەو جۆشی نۆک دەگەڵ دەکرد، لازمە بزانین مەنجەڵی ئەوکات، مەنجەڵی گەورەی زنجیردار بوو و سێ تا چوار پووتی ئاو دەبرد وەسەر کوچکاور یا سێکوچکەیان دەنا لەبەر دەرکی ئاغەڵی مەڕی هەتا زۆرباش ئەو گەنم و نۆکە دەکوڵی و ئەو کەڕەتە بە نێو دێدا دەگەڕان بە هەموو ماڵێکیان دەکوت دەبێ منداڵەکان بێن بۆ دەرکی ئاغەڵی ئێمە دانوو دەکەین ئیتر منداڵی نێودێ هەموو دەهاتن ورد و درشت جا دەیان هێنا بە کەوچکی ئاوگەردان دانوویان لەو مەنجەڵە گەورە بۆ هەڵدێنجان بۆیان لە سوێنەی چکۆلە یان قابڵەمە دەکرِدن منداڵیش دوو دوو و سێ سێ تێ دەورووکان و دانوویان دەخوارد تا تێریان دەخوارد ئەوکات بە مست لە سوێنەکە و حاجەتەکانی دیکە دەریان دێنا و لەنێو ئاغەڵێوە بە کولاوکە هەڵیان داویشتە دەرێ دەبوو بڕواتە سەربانی بە کولاوکە یان دەلاقەدا منداڵ دەیان کوت: «دانوو هات و دانوو چوو، دەرد و بەڵای ئەو مەڕانە بەو ڕۆچنەدا چوو» یان دەیان کوت:«دانوو دەرچوو، دانوو دەرچوو، دانوو لە مەڕان دەرچوو». ئەوجار منداڵ بڵاوەیان دەکرد و ئەگەر مەنجەڵ دانووی تێدا بوایە هەر منداڵەی جامێکیان دانوو دەدایە بۆ ماڵێ. دەنا ئەو ماڵێکی منداڵیان نەبوو یان نەهاتبوو، ماڵێ جامێکیان بۆ دەبردن خێری دانووان ئیتر زۆر جاری وابوو ئەو مەڕانە چاک

دەبوونەوە و دانووەکەیان دەپەڕاند و نەخۆشێکەیان کە بەرهاویشتن بوو لە نێو لا دەچوو و کابرای سێحەب مەڕ لەو زەرەدە ڕزگاری دەبوو.

**١٨١٣٩٠**

## هەرشتەبڕینەوە



**یەکی دیکە** لەوانە کە لە ڕابردوودا بوون هەرشتە بڕینەوە بوو، هەرشتە خۆراکێکە لە گەنم دروست دەکرێ، خۆراکێکی تەواوە بەتەنێش دەخورێ و دەگەڵ برنجیشی دەکەن، هەرشتە دوو بەشە یەک خاوبڕی پێدەڵێن زۆرتر لە ناوچەی بۆکان و مەهاباد و شنۆ و پیرانشار. ئەویش ئاوایە دێنن گەنمی بەهارو لێدەکرد بە ئارد. ئاردەکە دادەبێژن جوان کەپەکەکەی لێدەکرن ئیتر دەیکەن بە هەویر و دەیشێلن لە سوێنەی گەورە یان لەسەر شتێکی پان، جاری وا بوو بە لاق دەیانشێلا. ژنانیان لێ کۆ دەکردەوە و وەستای بڕینەوەیان بۆ دێنا چونکە هەموو کەس

نەیدەزانی بیبڕێتەوە، ئەو کە بە چەقۆیەکی زۆر تیژ کە پانیان کردبۆوە، ورد وردی دەکرد دەیاندا بەو ژنانە دەسکیان دەکرد یانی درێژیان دەکردەوە دواتر لە حەسار یا سەربان تەنافیان بۆ ڕایەڵ کرد بۆ بە تەنافیاندا دەدا پێیان دەکوت هەڵخستن تا ویشک دەبوو ئیتر لەسەر تەندوور بە سێڵی سووریان دەکردەوە ئەوجار دایان دەبێژت، درشتەکەی بە جودا وردەکەی بە جودا. ئیتر بە جێگای برنج یان بە جودا دەیانخوارد دەگەڵ ڕۆن و دەگەڵ لەپە زۆر خۆش و بە لەززەت بوو پێیان دەگوت چڵاو جاروبار پیوازی زۆر و گۆشتی قاورمەشیان تێدەکرد قابیل بە هەموو مەجلیس و میوانێک بووە.



**«هەرشتە سوور کردنەوە و پنە و تیرۆک»**

**دووهەمیان هەرشتەی نیوەنان بوو** کە ئەویش زۆرتر لە ناوچەی سەقز، خوڕخوڕە، سەرشیو، بانە، مەریوان بانهۆبەتوو بوو. ئەویش ئاوا بوو هەویرەکەیان دەشێلا، کەولی ئاردیان ڕادەخست، پنە، تیرۆکیان

دادەنا ئاردی نێوکەوڵیان دێنا. ئەنگوتکی هەویریان دروست دەکرد ئیتر ئەنگوتکیان پان دەکردەوە لەسەر سێل یا ساج هەر دووک یەکن. دەیان برژاند وەکوو لەواشە، دواتر چەند دانەیان لەسەر یەک دادەنا وەستای خۆی هەبوو بە چەقۆیەکی تیژ دەیان بڕییەوە، ورد دەبووە هەرشتە. ئەوە چونکە نانەکەی لە پێشدا برژابوو دواتر سوور کردنەوەی نەدەویست یەک دەفعە دەبووە هەرشتە. ئەوجار لێیان دەنا بە هەموو جۆرێک بە هەرشتەپلاو، لەپە، هەرشتە نیسک، هەرشتەکشمیش. هەرشتە لەو چێشت و برینجانەی ئێستا زۆر خۆشتر و بە تامتر بوو.

# سەمەنی



**گەنم لە حاڵی چەقەرداندا بۆ سەمەنی**

سەمەنی خۆراکێکی خۆش و بە کەڵکە و تایبەتمەندی خۆراکی و دەرمانی زۆرە وەک دەڵێن بۆ گەدە، بۆ دەمارەکانی لەش، بۆ جەرگ و زگ کارکردن زۆر باشە. لە ڕابردوویەکی زۆر دوور و درێژەوە سەمەنی لە کوردەواریدا دروست کراوە بۆ ناشتایان بۆ میوان لەو دوایانەدا لە نەورۆز لەسەر سفرەی حەوت سین دایدەنێن سەمەنی دوو جۆرە: **یەک** تەڕەسەمەنی پێدەڵێن ئەویش ئاوایە، دێنن گەنمی سەرداری یا بەهارووی جوان لەسەر مەجوعمە، سفرە یا کەوڵ دەیبژێرن، کونجرە، نوسەنەکە، زریزانە. چێو دانوو پووش و پەڵاش و کا و کۆتی بە تەواوی لێدەگرن. دوایە لە ئاوی دەکەن لە تەشت یا سوێنە یان سێڵ، پارچەیەکی تەڕی بە سەردا دەدەن هەتا چەقەرە دەکا

و هەڵدەمسێ نەک شین بێ دێنن لە نێو حاجەتێکدا بە چەند ژنان دەیکوتن و دەیکوشن ئاوەکەی دێتە خوارێ و بەرگی گەنمەکەشی دەکەنە تۆپەڵە ئەو جار دووبارە لە ئاوی دەخەنەوە دووبارە دەیکوتن و دەیکوشن تا هەمووی ئاوەکەی لێ دەگێرێ تا ٣ جار ئەو کارە دەکەن بەڵام ئاوی هەر جارەی بە جودا لە مەنجەڵێک دەکەن دوایە هەمووی مەنجەڵەکان وەسەر تەندوور دەنێن. هەمووی دەوری



**چێشتی سەمەنی**

تەندوورەکە قوڕ دادەن جێگایەک نەبێ کە ئاوردووی پێدا لە تەندوور دەکەن بەو دەلاقەدا کە ماوەتەوە بۆ ئاوردوو تێڕشتن. ئیتر بە خەڵکی نێو دێ دەڵێن هەر کەسێ لە ماڵە خۆیەوە ئارد دێنێ ئیوایە حەوت جۆشێک ئیوایە دوو سێ یانی دوو حەوجۆش دێنن لەوێ دەیبەن چینچین ئەو ئاردەی پێدا دەچێنن تا توند دەبێتەوە و بگا و سوور بێتەۆە ئیتر شەوێ لە کنی دەبن تا بەیانی خەریکی سەیر و سوحبەت و هەڵپەڕین دەبن جاری وایە سەمەنی تەڕە کوڵینەکەی

دەگاتە شەو و ڕۆژێک یا زیاتر. دوای تەواو بوون دێنن بەش بەشی دەکەن ئەوەی ئاردی هێناوە بە ئەندازەی ئاردەکەی خۆی سەمەنی بۆ تێدەکەن ئەوەی فەقیرە ئاردی نەبووە یا لەویٚ نەبووە بەشی بۆ دەنێرن ئەوەی لە مەنجەڵەکەدا دەمێنێتەوە ساحەب ماڵ هەڵیدەگریٚ بۆخۆی. ئەوە تەڕە سەمەنی.

**ویشکە سەمەنی:** ئەۆیش ئاوایە گەنمەکە لە ئاو دەکەن تا چەقەرە دێنن و هەڵدەمسیٚ. دوایە لەسەر سەلە هەڵی دەخەن تا جوان ویشک دەبیٚ ئیتر دێنن بە دەستاری دەکەن تا ورد دەبیٚ وەک ئاردی لیٚ دیٚ دێنن ئاوی کەمێک تێدەکەن یانی دەگەڵی دەکەن و کەمێک لەسەر تەندوور دەیکوڵێنن ئەو جار لە دیزەی دەکەن و لە تەندووری دەخەن کە تەندوورەکە بە ئاور سوور سوور بێتەوە و سەرەتەندووری لەسەر دادەنێن ئی تەندوورەکە یانی دەرخۆنە. بە سەرە تەندوور سەرەکەی دەنێنەوە و دەوری تەندوورەکەشی قوڕ دادەدەن تا هالاو و تینەکەی نەیەتە دەریٚ ئیتر نزیک بە ٢٤ ساعەت لە تەندووردا دەبێت ئەوکات پێیان دەکوت شەو و ڕۆژێک دەبیٚ لە نێو تەندووردا بیٚ ئەوجار دێنن دەری دێنن کە پێیدەڵێن «گەیشتووە» یا «سوور» بۆتەوە. دەڵێن وەک دەندووکی کەوی سوور بۆتەوە خۆش و جوان و بە لەززەتە. وەک لە بەرەوەش باسمان کرد تایبەتمەندی دەرمانی زۆرە بۆ گەدە «مسعدە» و خاوێنکردنەوەی ڕیخۆڵەکان. ئەوەش بەشی سەمەنی و ڕێوڕەسمی ئەو لازمە ئەوە وەبیر بێنمەوە خەڵکی ئەوکات سەمەنییان بە شتێکی

پیـرۆز دەزانـی بۆیـە هـەمـووی خـەڵکی ئـاوەدانـی لـە لێنـانی ئـەودا بەشدارییان دەکرد.

## جێژنه له کوردستاندا

له کۆنەوه لـه وڵاتـی کوردەواریدا تـەواوی ساڵ سێ جێژنـی تێدا بووه یـەکـەم: جێژنـی مـانگی ڕەمـەزان دووهـەم: جێژنـی مـانگی قوربـان سێهەم: جێژنی نەورۆز که جێژنی تازەبوونەوەی ساڵه.

١- **جێژنـــی ڕەمــەزان:** کـه مانگێک بـه ڕۆژوو دەبێ، دەسـتووری خوداوەند بەجێ دێنێ. دەست له هەموو خۆشییەکی زاهیری هەڵدەگرێ چـاو لـه پاداشـی ئـەولا دەبڕێ. لـەبـەره بەیانـەوه هـەمـووی لـەشـت لـه خۆشـی و سـەرخۆشـی و خـواردن و خواردنـەوه دەسـت هەڵـدەگرێ. سەرکەوتن به سـەر زۆردارترین تیکەی لەشـت کـه نـەفسـه بـه دەسـتی دێنی. بـه خۆشـی ئـەو خۆشـییه ئـەو جێژنـه خۆشـه دەگیـرێ کـه جێژنـی ڕەمەزانه. ئەوه دەبێته پێشەنگی چاکەی یەکجاری و گەڕانەوه بۆ لای دانەری هەستی و کڕنۆش بۆ یاسای ئەو دوور کەوتنەوه لـه ڕەوشـتی پەستی و هەڵوێستی خودا نەویستانه.

٢- **جێژنی قوربان:** لـه کاتێکدا کـه حـەزرەتی ئیبراهیم دەستی دا کەرەسەی بوتشکاندن و بوتەکانی لەتوپەت کرد و ڕێگای بۆ دادوەری و یەکتاپەرستی هەموار کرد و خەڵکی له زنجیری کۆیلەتی و بـەردەگی

ڕزگار کرد بە دونیای ڕاگەیاند کە کڕنۆش هەر بۆ خودایە داواش هەر لەوە، لە کاتێکدا کە بڕیاری دا بە پێی ئەمری ڕەبی سەرببڕێ تاقە کوڕەکەی خۆی، چون ڕاستی کرد و بە ڕاستی بوو خوداوەند لێی وەرگرتوو و قەبووڵی کرد وە هیدیەی بۆ نارد بە جێگای حەزرەتی ئیسماعیل لەو کاتەوە جێژنی قوربان گەڕا بە ڕێوڕەسمێک بۆ زیندوو کردنەوەی ڕچەی ڕاستی باپیرەگەورەی خۆمان کە حەزرەتی ئیبراهیمە (د.خ). هەر وەک خودای گەورە بە پێغەمبەری خۆمان دەفەرمێ لە قورئانی پیرۆزدا «فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانحَر» یانی قوربانی بکەن و نوێژەکانیش مەچوێنن بە تایبەت نوێژی جێژنی قوربان و ڕەمەزان.

**٣- جێژنی نەورۆز:** جێژنێکی ئایینی نییە بەڵکوو جێژنێکی نەتەوایەتییە.

# چۆنیەتی خێر کردن لە جێژنەکاندا



بەڵام جێژنی ڕەمەزان و قوربان لە دێهات لە ڕابردوودا ئێستاشی لەگەڵ بێ لە دێهاتی دوور کە لەسەر شوێنی ڕابردووی باب و باپیرانیان ماون. هەروای بەجێ دێنن. ڕۆژێک پێش جێژنی قوربان و جێژنی مەولوود و لە ٢٧ی ڕەمەزان نەفەرێک یا مجێوری مزگەوتێ هاوار دەکا ڕەحمەتی خوداو لێ بێ خێران دەکەین. هەر کەسێ لە دڵی نابێ و حەیوانی هەبێ حەیوان دێنێتەوە و سەری دەبڕێ. ئیدی کەلاکەکەی دێنن بۆ دەرکی مەزگەوت دایدەنێن. هەتا هەمووی کەلاکەکەکانی ئاوەدانی کۆ دەبنەوە. دیارە دەستەیەکیش لەوێ بە کەرەسەی پێویست خۆیان حازر کردووە بۆ ورد کردن و بەش کردن

و دانی گۆشتەکە بە خەڵکی. چەند نەفەر بە تەسبێحماڵەکان دەبژێرن حیسابیان دەکەن تا لەبیریان نەچێ و ماڵیان لێ ون نەبێ جا بە تەرازوو هەموو بە ئەندازەی یەکیان بۆدادەنێن کەس حەقی نییە هیچ لە کەلاکەکەی وەگێڕێ یان منەت بکا بەسەر ئەوەی کە نەیبووە و نەیکردووە. وێکڕا بەشیان دەکەن. یەک نەفەر هاوار دەکا وەرن بەشە گۆشت بەرنەوە هەمووی خەڵک دێن بۆ بەشە گۆشت ئەگەر ئی لاوەشی لێ بێ بەشی دەدەن و تێکڕا دەیبەنەوە، ئەوەی ٢٠ نەفەرە دەگەڵ



**«حەیوانی خێرێ لە جێژنەکاندا»**

ئەوەی ٢ نەفەرە و تازە ماڵی گرتووە بە ئەندازەی یەکیان دەدەنێ. ئیتر ئەو شەوە و چەند شەوی دیکەش گشتی دانیشتووی ئاوەدانی چێشتی گۆشتیان هەیە و لێیانناوە. ژینی وێکڕا تەواو دەبینرێ و هەست پێدەکرێ.

## چۆنیەتی بەڕێوەبردنی جێژن

خەڵک لە مزگەوت کۆ دەبنەوە، دوای بەجێ هێنانی نوێژی جێژن و دوای ئامۆژگاری مامۆستای پێش نوێژ، نوێژی جێژنی ڕەمەزان و قوربان کە مامۆستا دەڵێ نوێژی جێژن سوننەتێکی پێویستە و لە ئایینی ئیسلامدا گرینگییەکی زۆری پێدراوە و پێغەمبەری ئەکرەم(د.خ) دوای کۆچی بۆ مەدینە بەجێی هێناوە و نەشی فەوتاندووە. دوای تەواو بوونی نوێژەکە. ئەوجار خەڵک تێکڕا هەڵدەستن دەستی یەکتر ماچ دەکەن، ڕق و قینی ڕابردوو وەلا دەنێن بە جێگای ئەو خۆشەویستی و سەفا و وەفا ڕۆ دەنێن. پشت لە ڕابردوو دەکەن، بۆ داهاتوویەکی پڕ لە برایەتی و یەکدڵی هەنگاو دەنێن. گەردن ئازادییەکی بە تەواوی دەکەن. ئیتر وێکڕا هەر کەس لە جێگای خۆی ڕۆ دەنیشێتەوە. کەسێک هاوار دەکا، نانی جێژنە بێنن بۆ مزگەوتێ ڕەحمەتی خوداتان لێ بێ. هەر کەس لە ماڵی خۆیەوە ئەوەی پیاوی لەوێ بێ، مجۆعمە دەبا کە پێی‌دەڵێن: سفرەی مزگەوت. چێشتی قەدیم هەریەکەی جۆرێک بوو ئەو کات برینج نەبوو، یا کەم بوو، ئەگەر بشبا برینجی گردە بوو، دەنا چێشتەکان ئەوانە بوون: قەیسی‌وڕۆن- هێلکەوڕۆن- خورماوڕۆن – بڕوێش‌وڕۆن- ماش‌وڕۆن- بۆدراو. تەندووڕپلاوی و چەند شتی دیکە کە ئێستا نەماون. دەیانبرد بۆ مزگەوتێ، جاری واش بوو میوانی لاوە

دەهات. یان یەکێک نانی بۆ نەدەهات یان ئەسڵەن نەیبوو لەگەڵ جەماوەرەکەی دیکە نانی دەخوارد و بێ ئەوەی هەست بەوە بکا کە ئی خۆی نییە. دوای نان خواردن مامۆستا ئەو دۆعایەی دەخوێند: جێژن و لێ پیرۆز بێ و ساغ و سلامەت بن و بەسەر کەند و کۆسپەکاندا زاڵ بن، خوداوەند سەرکەوتنی دین و دونیاتان پێ عەتا کا، یارەبی خودایە فەقیر و دەستتەنگ و هەژار و نەدارمان نەکەی، نەخۆش و سەرئێش و لەش بەبارمان نەکەی لە دونیادا بێئابرومان نەکەی، لە قیامەتێ بێئیمانمان نەکەی، خودایە کۆی بەخشینت بێسنوورە، لە گوناهانمان ببورە، هەموو هیوامان بە تۆیە بێبەشمان نەکەی لەو کۆیە کە ڕەحمەتی تۆیە، خودایە تەڕەقی بە دینی خۆت بدەی ئامین یا ڕەبەلعالەمین. ئیتر بلاوەیان دەکرد. هەر کەس دەچێتەوە ماڵێ ئەگەر کەسانێک هەبن لە ماڵە بابیان جیا بن دەچنەوە ئەوێ چون دایک و باب جێژنی بە گیانی ناکەوێ تا عەولادەکانی نەیەتەوە و نەیانبینێ و ئەگەر دایک و بابیشیان نەمابوو دەچن بۆ سەر قەبران لەوێ سەریان دەدەن چون ڕۆژانی جێژن مردوو چاوەڕوانی کەس و کارەکەی دەکا کە سەری بدەن و دۆعای بۆ بخوێنن و خێریشی بۆ بکەن. ئەوجار کە دەچوونەوە ماڵێ لە بابە گەورە و دایە گەورە دەهالان، جێژنانەیان لێ وەردەگرتن ئەوانیش هەرچی شکیان بردبا لە دراو و شتی دیکە دریغییان نەدەکرد دڵی خاو خێزانیان بەو جێژنانە خۆش دەکرد دەیاندانێ. ئەوجار لەولاشەوە ماڵ و منداڵی مجێور بە مەنجەڵ و قاپ و قابڵەمەوە وەک تای تەورداس چاوەڕێ بوون مزگەوت چۆل بێ نان و

چێشت کۆکەنەوە. دیارە هەمووی سفرە و دەفرەکانیان بەتاڵ دەکرد. سفرەی ئەو کات کەوڵ بوو کە لە پێستی مەڕ خۆشیان دەکرد و سازیان دەکرد. گەورە و جوان جاری واش بوو قەراغەکەیان لە پارچە دەگرت یان هەر لە خۆی ڕیشۆڵیان بۆ ساز دەکرد پێیان دەکوت گوڵینگە. نانیان تێدەخست، نانەکە ڕەق نەدەبوو، و کۆنیش نەدەبوو. قاپی ئەو کات یان چیمکۆ بوون یان فافۆن بەڵام هێندە زل و پان بوون کابان بۆی پڕ نەدەبوو بە قەد بلوّوتی ئێستا.

جا مجێور هەمووی ئەوانەی دەهێنا لە مەنجەڵەکەی هەڵدەڕشتن و تێکەڵی دەکردن منداڵی زۆری وەدووی خۆی دەدا دەیانبردەوە ماڵێ تێیدەهاڵان. خەڵک ئەوەندە قۆڕەدەمار نەبوون زۆری پێ شوکر بوون، وەک ئێستا نەبوو شەو ڕۆژ پڵاو و گۆشتی هەیە، جارێک ناڵێ خودایە لێت بەزیاد بێ. خەڵکی ئێستا وەک کتکی سەر خەزێنە وان بەرخی تێرە شیرن. قاتی و قڕی ڕۆژگاریان نەدیوە بۆیە شوکر نین. بەڵام خەڵکی ئەو زەمان هێندەیان گرانی و نەبوونی چێشتبوو بە هەموو شت هەر ڕازی بوون. کابرای فەقیر خودا خودای بوو کاسپی ئاوەدانی بدەنێ وەک مجێوری- شوانی گاڕان- شوانی مەڕ- شوانی گوێلەگەل. دەچوو خۆی لە کن مەلا و کەیخودا داویشت تا یەکێک لەوانەی بدەنێ و منداڵەکانی لە برسان نەمرن، چون ئەوەی قەرە بوو یا ڕەشایی بوو یان خۆشنشین، مەگەر نۆکەری کردبا دەنا کاسپی نەبوو. ئەویش نۆکەری کاری جورێک کاریگەری بوو بەڵام بە ماوەی هەشت مانگ نۆکەریان پێ دەکوت- ڕەنجبەریان پێ دەکوت- پیاوبەریان پێ دەکوت یان پیاوی

خاڵی. قەرە - ڕەشایی – خۆشنشین، بە کەسانێکیان دەکوت لە دێدا زەوی و زاریان نەبا. ئەوانە بێزەوی بوون. بەڵام جووت بەندە ئەوکات بە کەسانێکیان دەکوت کە کاری کشت و کاڵی دەکرد زەوی و زاری هەبوو. بە کەڵ و گا عەرزی دەکێڵا. ماڵی سێحەب پیاو دوو جووت یا سێ جووتی بۆ دەگەڕا. جووت بریتییە لە دوو کەڵ یان دوو گا کە بە وەسیلەی نیر و ئاموور تێکیان دەخەن و پێکەوە عەرزیان پێ دەکێڵا.

**ڕوون کردنەوە:** کەسێک جووتی هەبا و زەویشی هەبا ئەگەر کانی یان جۆگە ئاوی هەبا، ئەوە پێیان دەکوت جووتبەندەی بەراوکێڵ. دەنا کەسانێک کە هەر دێمیان هەبا لە ئاوی جۆگە و چۆم نۆبە ئاویان نەبا پێیان دەکوت لاکێڵ یان دێمەکارکێڵ ئەوانە کەمتریان دەدا بە مەلا و مجێور. لەبەر ئەو بێکاسپییە مجێور بە چێشتی تێکەڵپێکەڵ زۆر ڕازی بوو بۆیە هەر شتێک تێکەڵپێکەڵ یان لێکهالاو بێ پێی‌دەڵێن وەک چێشتی مجێور وایە، و قەناعەتی بە مجێورییەکەی دەکرد. چونکە چاکتر لەوەی وەگیر نەدەکەوت بۆ بەڕێ چوونی خۆی و منداڵەکانی.

# کولێرەی ٢٧ ڕەمەزان

بە درێژایی مێژوو خەڵکی کورد پابەندی دین و ئایین بوون و ڕێز و حورمەتی تایبەتی بۆ دین و جێگا و ڕێگا پیرۆزەکانی ئایین داناوەو ڕۆناوە و لەو کاتەشەوە کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئاشکرا بووە و بڵاو بۆتەوە شوێن و کات و یاساکانی ئیسلام بە ڕێز و حورمەت بوون بە ئەرکی زاهیر و باتنیان زانیوە بەڕێوەبردنی ئەو ئەرکانە ڕیوایەتکردنی حەدیسی پێغەمبەر و بە خزمەت گەیشتنی جابانی سەحابی کورد و بوونی تایفە و ئیلێکی زۆر بە نێوبانگی بە نێوی ئیختیارەددین لە ناوچەی بانە و پشدەری عێراقن ئەو حەقەمان بۆ دەسەلمێنێ و هەروەها بوون و دەرس کوتنەوە و پێگەیاندنی ئەو هەمووە فەقێ و مەلا چاکەی کورد کە تەنانەت گەیشتوونەتە ناوچە و مەملەکەتەکانی عەرەبی بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکی پیرۆزی ئایین و ڕێوشوێنی جومعە و نوێژی جەماعەت بوونی مامۆستا و مزگەوت لە چکۆلە و دوورترین دێهاتی کوردستان و ژیان و بەڕێ چوونی هەمووی ئەوانە بە ئارەقی ماندووبوون و دەستی بە هێزی کاریگەری و وەرزێڕی خەڵکی دێهات و شاری کوردەواری نیشانەی عەلاقەی دەروونی ئەو خەڵکە بووە بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام. جا هەر بۆیە خەڵک لە کاتی خۆی حەولی داوە ئەوەی لە دەستی هاتبێ بۆ فەریزەکانی دین و دەستگیرۆیەی فەقیر و

هـەژار و کردنـی خێـر و خێـرات دەریغـی نـەکـردووە چـاوی خـۆی نەقووچاندووە جا یەکێک لەوانە چۆنیەتی خێرکردن لە جێژنـەکـان بـووە وەک لە بەرەوە باسمان کرد و کولێرەی ٢٧. دیارە کەسانێک حەیوانیان نەبوو خێری ٢٧ بکەن یان هـەر دووکیـان دەکـردن لـە ڕۆژی ٢٧ مـانگی ڕەمـەزان دەهـاتن یـەک تـەشتی گـەورەیـان هـەویـر دەشـێلا. دیـارە ئـەو هـەویرەیـان بـە شـیر دەشـێلا و بـە ڕۆن دەسـتاویان دەداوە. قـەنـد یـا تاماوی هـەنگونیـان دەگـەڵ تێکـەڵ دەکـرد هـەر کـە هـەویرکـە هەڵدەهـات «دەگەیی» دەهاتن تەندووریان بۆ نان سوور دەکردەوە بـە ئـاوردووی ئەوکـاتیش یـا دار بـوو یـان تـەپاڵـە، گـەمـڕە. کاتێک تـەندووریان داییسـا سوختێک وەکوو لەتی تەپاڵە، لەتەدار بەوەیان دەکوت وردەی تـەندوور ئـەوەشـیان تێدەڕشـت تـا تـەنـدوور جـوان سـوور بێتـەوە کاتێک سـوور دەبووەوە و چاک گەرم دەبوو کابان دەهاتن دەستیان بە کولێرە دەکرد دیارە بۆ کولێرەناسکە ئەوکات وەک ئێستا نەبوو خـەڵک دەسـت و دڵـی ئاواڵە و فرەوان بوو و شتەکەشی مەباح و زۆر بوو دەهـاتن ئـەوانـەیان دەگەڵ دەخەست و لێدەدا وەکوو کاخڵی، کونجی، هێلکە، ڕەشکە و بـە کونی بێژنگ یا داشگیر شوێنشوێنیان دەکرد. ئەگەر کولێرەکردن تەواو بوو دایان دەنان بۆ ماڵان جا هەر کـەسـێ بـۆ جیران و گـەڕەکی خـۆی دەنارد ئیواش بوو بۆ هەمووی ئاوەدانی دەنارد، ماڵێ ٣ دانە، ٥ دانـە، ٧ دانـە تـا ٩ دانـە بـە پێـی خێـزان و موونـات دەیـان کـوت دەبـێ تـاک بـێ چونکە خوداوەند تاکە با خێرەکەشی تاک بێ ئەوەش خێری کولێرە ٢٧ ڕەمەزان یا کولێرە ٢٧ کە ڕێوشوێنێکی کوردەواری بوو.

# سەلا

سەلا بانگەوازێک بو کە ئەوکات دەکرا بۆ هەستانەوەی ڕۆژووانان مانگی پیرۆزی ڕەمەزان ئەوکات وەکوو ئێستا سەعات، بەرق، بڵەندگۆ و موبایل نەبوو خەڵک پێی هەستێتەوە دەهاتن لە دێدا یەک یا دوو نەفەر دەنگخۆشیان هەڵدەبژارد لە شاریشدا لە هەر گەڕەکێ دوو نەفەر دەنگ خۆشیان دیاری دەکرد بە سەربان و کووچەدا بگەڕێن شیعر بخوێنەوە زۆرتر شیعری عیرفانی وەکوو مامۆستا زاری، ئەحمەدی کۆر، شێخ حەسەنی شنۆیی و شاعیرانی دیکە جاری واش بوو ئەو نەفەرانە تەنەکەی پووتیان بە دەستەوە دەگرت و بە دار لێیان دەدا و دەیانکوتا تا خەڵک هەستنەوە و پارشێو بکەن دەنا بە دەفە، دەفەیان لێدەدا، زکریان دەکرد و شیعریان دەخوێندەوە بۆ هەستانەوەی خەڵک زۆر ماڵی واش بوو کەڵەبابیان هەبوو کەڵەباب دوو جار دەیخوێند جارێکیان شەوی زۆر دەمێنی پارشێوی پێدەکرێ جارێکیشیان کە دەخوێنێ ڕۆژە ئیتر دەستیان لە خواردن هەڵدەگرت و دەچوون بۆ مزگەوتێ بۆ نوێژکردن. ئەوەش سەلا و هەستانەوەی ئەوکات بۆ پارشێوی ڕەمەزان.

## خۆشی چۆنیەتی جێژنەکان

جێژنە لە کوردستاندا بۆن و بەرامەیەکی تایبەتی هەبوو دیارە ئەوە بۆ هەموو جێژنەکانە چونکە خەڵک زۆر چاوەڕوانی جێژن بوو بە چەند هۆ. ١- کاسپکار بە هۆی کاری زۆرەوە ئەوکات زۆر ماندوو دەبوو زۆری پێ خۆش بوو ڕۆژێک هەبێ بحەسێتەوە. و هەم دۆست و برادەر ببینێ جاری واش بوو لە ڕۆژانی جێژنەدا دەچوونە دەرەوەی نێو دێ و وەک کوێستان سەرچاکان تا ئێوارێ غەمی خۆیان بە با دەدا و سەیر و سەیاحەت و گۆرانی و هەڵپەرینیان دەکرد. لە ڕۆژانی جێژندا لیباسی جوان و تازەیان لەبەر دەکرد چون ڕۆژانی حەسانەوەیان بوو.

٢- جاری واش بوو خەڵکی نێو دێ لەسەر شتی چکۆڵە نێوانیان تێک دەچوو قسەیان پێکەوە نەدەکرد. لە ڕۆژی جێژندا دەست و دمی یەکتریان ماچ دەکرد دەچوونە ماڵی یەکتر و کەیخودا و مەلا وەپێشی هەموو خەڵکەکە دەکەوتن و لە پێشدا بە دەستەجەمعی دەچوونە سەر قەبران و دۆعای بەخێریان دەکرد و فاتیحایان بۆ مردووەکان دادەدا دوایی هەمووی ماڵەکانی ئاوەدانی دەچوون بۆ جێژنە مەبارەکی، پیرۆزباییان بە یەکتر دەکوت لە بەعزە ماڵێک لایان دەدا، چایی یان

مێوژ و گوێزیان بۆ دادەنان. ئیدی جیگای دڵئێشی و ناخۆشی دەدرا بە برایەتی و پێکەوە بوون و دەگەڵ یەک ئاشت دەبوونەوە.

٣- جاری واش بوو لە جێژنەدا خێر دەکرا لە بەعزە جێگایەک حەیوانیان سەر دەبڕی بۆ خێر و سەدەقە. وەکوو جێژنی قوربان، جێژنی ڕەمەزان، جێژنی مەولوود ئێستاش ئەوە لە شوێنی دووره شار هەر ماوە. خەڵکی نێو دێ فەقیر و دەوڵەمەند هەمووی لەو گۆشتە خێره تێر دەبوو. ئەوە بوو خۆشی و بۆنوبەرانێکی تایبەتی جێژن لە کوردستاندا. ئەو کات فەقیر و دەوڵەمەند زۆریان ئاگا لە یەکتر بوو ئاوڕیان لێک دەداوە و هەرەوەزیان بۆ یەکتر دەکرد.

# بووکەبارانە



لـە وڵاتـی ئیمـە ئێـران چونکـە زۆری شـاخو کوێسـتان و لێـڕەوارو نـزارە بـاران زۆر دەبـارێ بـەتایبـەت لـە کوردسـتاندا کـە کێـوەکـان لـە زەنجیـرەکێوی زاگـرۆس و ئاوهـەوای میانـەو شـێداری هەیـە هـەمیشـە چـاوەڕوانی بـەفـرو بـارانی لـێ دەکـرێ و چونکـە زۆری خـەڵکـەکـەی دێنشینن و کاری وەرزێڕو حەیوانداری دەکـەن و لـەو ڕێگایـەوە ژیـان دابین دەکەن هەر بۆیەش زۆریان نیاز بە بارانە. ئـەگـەر سـاڵێک ویشـکە ساڵی بێت هـەم لـە باری وەرزێر و کـەشـاوەرزییـەوە زۆر لـەدوا دەبن هەم لەباری مەڕداری و هەوارچییەتییـەوە لـەوەڕ نـابێ و ئـاژەڵ بـەخێو ناکرێ و ڕزقی لێ پەیدا نابێ. جاری وایە سەروبەری لەبەین دەچێ جا لـەبـەر ئـەوە خـەڵک لـە کوردسـتانی ئێرانـدا هـەمیشـە چاوەڕوانی ئـەوە بوون، ساڵ تەڕە ساڵ بێ تا هەم کەشاوەرزی دەغڵوودانی باشی بێ و

هەم لەوەڕ و لەوەڕگە و گیاوگژیش زۆر و زەبەند بێ تا لەهەر لایەک تێرو تەسەلو پڕ بن. بەڵام ئەگەر ساڵێک نەبارێ یان کەم باران بێ، خەڵک پەنای بۆ هەموو شتێکی ئەو سەردەمە دەبرد کە باو بوو و باوەڕیشیان پێی بوو ئەوکات وەک ئێستا نەبوو هەواناسی هەبێ و بیڵێ و خەڵک گوێی لێ ڕاگرێ، پێیان وابوو کەس نازانێ کەنگێ دەبارێ و لەکوێ دەبارێ مەگەر خوداوەند نەبێ ئەوە لە دەسەڵاتی ئەو دایە هەر بۆیەش پەنایان بەو شتانە دەبرد کە ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ تاموبۆنیکی دینداری تێدابوو و دەگەڵ دەسەڵاتی خوداوەند دەیگرێتەوە.

**یەکێک لەوانە** کە لە کاتی بێبارانیدا خەڵک پەنای بۆ دەبرد نوێژە بارانە بوو، نوێژە بارانە بە پێی یاساو دەستوری دینی بەڕێوە دەچوو ئێستاش هەروایە دەبێ ئیمام جەماعەت یان ئیمام جومعە دەستوور بدا خەڵک دوو ڕۆژ، بەڕۆژوو بن دواتر حەیوان پاتاڵ تێکەڵ کەن خەڵکیش ژنوپیاو ورد و درشت هەر یەک بەرماڵی خۆی پێ بێ، بە زمانی بەڕۆژوو بۆ لایەک بڕۆن کە بەرەو قیبلە بێ و لەوێ هەموو لە ڕیز و سەفی جواندا ڕادەوەستن نوێژ دەکەن و ئیمام خوتبەو قسەیان بۆ دەکا. وێکڕا دوعا دەکەن دەگرین لەبەر خوداوەند دەپاڕێنەوە داوای بارانی لێ دەکەن خوداوەندیش بە پێی ڕوحمو بەزەیی خۆی کەس لە دەرگای ڕەحمەتی خۆی ناهۆمێد و بێ بەش ناکا.

**دووهەم:**کەرەسەیەک کەخەڵک لە کاتی بێ بارانیدا لە دێهاتا سەیدو پیاوچاک بووە لە وڵاتی کوردەواریدا جەماوەر باوەڕیان زۆر بە دۆعا و پاڕانەوە و پیاوچاک وکەسانێ لە خودا نزیک بوون چ لە دەورانی زرتۆشت و پێش هاتنی دینی ئیسلام و چە لە زەمانی ئیسلامدا ڕێزی

تایبەتیان بۆ مامۆستای ئایینی و سەید و شێخ و کەسایەتێکانی دینی داناوە جا هەر بەو بۆنەوە باوەڕیان وابوو ئەگەر باران نەبارێ یەکێک لەوانە ناغافڵ دەبوو نەیەڵن بزانێ، بیانگرن لە چۆم یان لە حەوزی خەن ئەوە خوداوەند ڕوحم دەکا و باران دەبارێنێ و خەڵک لە تەنگانەی بێ بارانی ڕزگاریان دەبێ.

**سێهەم** لەو کەرەسانەی کە خەڵک بۆ نەجات بوون لە تەنگانەی بێبارانی بەکاریان دەهێنا سەنگێک بوو سپی لە سەر کێل و قەبری پیاوە گەورە و قەدیمییەکان کە لەسەر کێلی لای سەری دادەندراو زۆرتر سپی بوو، پێیان دەکوت کەلاوەی قەبر ئیوا هێندە لە مێژ بوو دەگەڕاوە بۆ دەورانی پێش ئیسلام، برێکیان گەورە و زەلام بوون لەم دواییانەدا نەمان، ون بوون. خەڵک دەچوون ئەو سەنگەیان دێنا لە ئاویان دەهاویشت تا ببارێ دواتر جاری وابوو خێریشیان دەکرد و دۆعاشیان دەکرد بۆ نەجات بوون لە بێبارانی.

چوارم کە سازیان دەکرد کەرەسەیەک بوو بە نێوی بووکەبارانە،کاتێک کە باران نەدەباری منداڵی چکۆلە و گەورە کە هەموو پاکودڵ ئاوێنەن، دۆعا و نەزایان قەبووڵ دەبێ لە ئاوەدانیدا هەموو کۆ دەبوونەوە بووکەبارانەیان دروست دەکرد دیارە منداڵەکان زۆربەیان کچ بوون چکۆلە و نیمچە عازەب و جاری وابوو کچی عازەبیشیان دەگەڵ بوو.

دارێکی درێژیان دێنا دایان دەگرت، دارێکیشیان لابەلا پێوە قایم دەکرد وەک دو دەست ڕادەوستا ئەوانیان بە پەڕۆ و بەن پێکەوە دەبەست تا نەکەوێ و هەڵنەوەشێ ئەو جار دەهاتن بە دەسرەی سوور و سپی دەورو بەری ئەو دارانەیان توند دەکرد و یەکدو دەسماڵی

سووری جوانیان له سەری داره درێژەکه دەهاڵاند وەک سەر و شەدە دیاری دەکرد گێلگێله و ڕیشۆلیشیان بۆ وێ دەخست، لەو لاشەوە داره لابەلایەکه وەک دوو دەستی بووکێ حەریر و پەشمینەیان وێ دەخست دەبووە دەستی بووکێ. جاری وابوو تاس کڵاویشیان لەسەر بووکێ دەکرد ئیتر دەهاتن کراسێکی سووری درێژیان لەبەر بووک دەکرد و نێویان دەنا بووکەبارانه کچێک یان دوو کچ کە لە هەموان گەورەتر و جوانتر بوایه بووکەبارانەکەیان هەڵدەگرت و دەیان برد بۆ نێو دێ دیاره هەمووی منداڵی نێودێیان وەدوو دەکەوت زۆرتر له پێشدا له ماڵه مەلا یان ئاغاوه یان ماڵه مامیرزاوه«موعەللیم بوو» دەستیان پێ دەکرت هەر دەگەیشتنه بەر دەرگای هەر ماڵێک وێکڕا هاواریان دەکرد و دەیان کوت:

**«بووکەبارانه ئاوی دەوێ،**

**ئاوی نێو دەغڵانی دەوێ،**

**هێلکەی بارۆکانی دەوێ،**

**دەرزی گەورەکچانی دەوێ،**

**دوعای پیاوچاکانی دەوێ،**

**بەرمووری بێوەژنانی دەوێ،**

**شەکری دەشارانی دەوێ،**

**مێوژی دەئالانی دەوێ،**

**یاری منداڵانی دەوێ».**

ئیتر ئەو ماڵه له پێشدا جامێکیان ئاوی ڕوون دێنا بە سەر هەمووی منداڵەکان و بووکەبارانەیان هەڵدەپڕژاند. دیاره ئاوی ڕوون نیشانەی ڕووناکاییه و ژیانەوەی حەیات و بووژانەوەی دووبارەیه. دواتر جامێک

یان مستێک گەنمیان دەهێناو ئەویشیان بەسەر منداڵەکان هەڵدەپڕژاند، گەنمیش نیشانەی هەرزانی ڕزق و ڕۆزییە و فرەوانی دڵ و دەروونی فەقیر و دەوڵەمەندە. دواتر دیاریشیان دەدانێ وەکوو هێلکە، نەقوڵ، کشمیش، مێوژ. دوای ئەوانە ئەوجار بووکەبارانە دەچووە ماڵێکی دیکەو دەرگایەکی دیکە ئەوانیش ئاوا ئاویان پێدا هەڵدەپڕژاند، دیارییان دەدانێ لە هێندێک ماڵ دەسماڵ و دەسرەشیان لە سەرو چاوی بووکەبارانە دەهاڵاند بە دیاری دەیاندایە هەتا نێو دێ تەواو دەبوو دواتر دەچوون بۆ سەر قەبران و سەر چۆم یان کانی، ئەو منداڵانە کە پاک و بێگوناه و مەعسووم بوون دۆعایان دەکرد و دەپاڕانەوە لە دەرگای خوداوەند کە باران ببارێنێ و لە ویشکە ساڵی ڕزگاریان بێ. وەک قەدیمییەکان دەگێڕنەوە خوداوەند دۆعای منداڵەکانی وەرگرتووە و بارانیشی باراندووە و خەڵک کەوتۆتە فەرعانە. دیارە هێندێک باوەڕیان وایە بووکەبارانە بەر لە هاتنی ئیسلام لە کوردستاندا بووە بە تایبەت بەڕێز کاک فەتاحی ئەمیری لەو باوەڕەدایە. دیارە قسەکە ش زۆر لە دڵ دەدرێ.

دیارە بووکەبارانە لە نێو فارس و نەتەوەکانی دیکەشدا بووە بە نێوی«عروس باران»یان لە ناوچەی سەبزەوار و دەوروو‌بەر پێیان کوتووە«چاولی چغل» وەک ئەبولغەزل تەبەسی نووسیویەتی عەروسی باران داستانی خۆشەویستییەو ئۆمێد بە خودایە. چەند منداڵی ساواو پاک و مەعسووم کە عیشقی ئەوان لە دڵێکی پاک و بێگەرد هەڵدەقوڵێ و داوا دەکەن بۆ باران جوابیشیان دەدرێتەوە دیارە لە نێو فارسدا زۆرتر کوڕ بووکەبارانە ساز دەکەن و ئەوان هەر دەچنە مزگەوت سەر ئیمامزادە و ماڵەشێخ یا سەید و ئەوانیش دەڵێن بۆ بووکەبارانە:

«چاولی چغل بارو کو، صدمن گنـدم ارزوکـو، گنـدماد زیرزالـه، ازتـو شنیامو ناله، اللّه بته به رحمت، صلوات بر محمد»

ئەوە بوو بووکەبارانە لە ڕابردوو.

**١٠١٣**

# ڕێوڕەسمی ژن هێنان لە کوردستان ئێران



**تابلۆی هونەرمەند: مستەفا شێرزاد**

ژن هێنان لە هەموو وڵاتێکدا بووە و لە نێو هەموو نەتەوەکان بە گوێرەی ئادابو سوننەتی خۆیان بەڕێوەیان بردووە، بەڵام لە نێو نەتەوەی کورد دەبوو لەسەر بنەمای قانوون و یاسای جوانی ئیسلام بێ. دیارە ژن هۆی حەسانەوەی هاوسەریێتی و خوشبەختی و سەربڵیندی ئەو و بنەماڵەکەیەتی ژنە هێدی و هێمنی بە لەش و ڕۆحی مێردەکەی دەبەخشێ. ژن، منداڵ وا بار دێنێ کە ئەستێرەیەکی ڕووناک و ڕووناککەرەوەی گەل و وڵاتەکەی بێ ئەوە کە خوداوەند فەرمووی

ئەمن ئێوەم لە نێر و مێیەک دروست کردووە و ڕزقو ڕۆزی خاوێن بخۆن و لەززەت و خۆشی لە دونیای پڕ لە ناز و نیعمەتی خوداوەند بە پاکی و حەڵالی وەرگرن. ژن خوداوەند عەتای کردووە و دروستی کردووە، زۆر گەورەیە لە قورئان سورەتی گەورەی بە نێوی ژن هاتووە و چەندین ئایەتی تایبەتی ژنانی پێغەمبەر هاتووە لە بارەی چارشێو و ڕەفتار یان ژن. ئەو ڕەحمەت و بەرەکەتە کە هۆی بوونی عەولادە و هۆی ژیانە و مایەی حەسانەوەی پیاوە لە هەموو ماندوویەتی دەروونی و بەدەنی بەو شەرتە ژن بێ، ژان نەبێ و خوان بێ، سندان نەبێ، دەی حەسێنێتەوە. ژن لە ناوچەی ولاتی مەی کوردەواریدا بە چەند جۆر دەهێندرا:

١)**ژن بەژن**: کە ناحەزترین شێوەی ژنهێنان بوو لە دێدا، کوڕێک بە دەوری کچێکدا دەهات دڵیان یەکتری دەگرت و عاشقی یەک دەبوون و بۆ یەک سووتابوون. کوڕە خوشکی بوایە دەبوو بەخاتری ئارەزووی خۆی و پێگەیشتنی بەو کچە زۆری لە خۆشکی بکا، یا بابی وادار کا، بیدەن بە برای ئەو کچە، بێ ئەوەی دڵی بۆی بچێ، خۆشیبوێ، ئاسۆیەکی ڕوون لەبەر چاوی خۆی ببینێ، بە ڕاکێش ڕاکێش دەیان هێنا مارەیان دەکرد. یەکێک دەبوو بە وەکیلی، زێنەب خانم شوو دەکەی بە عەبدوڵڵا، وەکیلەکە لە باتی ئەو دەیکوت بەڵێ بەڵێ دەیکا. ڕازی؟ بەڵێ بەڵێ ڕازییە. دەگوێزرانەوە و کچە یا خۆی دەکوشت یا هەڵدەگیرا یا ناچار بوون پەنا بۆ تەلاق بەرن. کە ئەویش تازە لە دەست برا و بابەکە نانی ئاسوودەیی وەگیانی نەدەکەوت یان

دەبوو هەتا مردن دانیشێ و نابەدڵی ئەو ڕەنجو زەجرە بچێژێ، کاکو براژنیشی چون بە دڵن کەیفی خۆیانی بۆ بکەن، ئەو بەدبەختەش دەبوو هەر خۆی جەرگ بخواتەوە و هەتا مردن ئەو ڕەنج و زەجرە بکێشێ.



**هەڵپەڕکێی کوردی**

**٢ژنهەڵگرتن:** ئەویش ئاوا بوو کچێک و کوڕێک لە ڕێگای مەڕی لە تاڵوار، لە تاوڵێ، لە داوەتێ یا لە ڕێگای ئاو و کانی و سەرئاوێ یەکتریان دیبوو دڵیان چۆبۆ سەر یەک بەڵێنی دەدەن بە یەکتر پێکەوە زەماوەند بکەن زۆر تێبینی دەکەن باب و برای کچە پێنەزانن. کوڕە یەخەی کەیخودا و مەلا دەگرێ چەند جار خوازبێنی کچە دەکا بەڵام بابی نایدا چونکە کوڕە فەقیرە یان زانیویەتی حەزی لێدەکا بابی دەچێتە سەرداریک نایەتە خوارێ دەبێتە قیلی کەوا سپی بە هیچ جۆر ڕازی نابێ و نایدا کوڕە و کچە بڕیارِ دەدەن پێکەوە بڕۆن بەوە دەڵێن کوڕە

ئەو کچەی هەڵگرتووە. ئەگەر زوو بگەنە ماڵە ئاغایەک یا ماڵە مەلایەک یا پیاوێکی دەوڵەمەند و سێحەب عەشیرەت و تایەفە ئەوە باشە دەستیان پێیڕاناگا، دەنا ماڵە بابی کچە وەدوویان دەکەوتن جاری وابوو کچەیان لێدەستاندەوە یان دەیانکوشت یان نیوەمردوویان دەکرت هێندەیان لێدەدان دەنا چووبانە هەر ماڵێک ڕێگایان نەدەدا و لەگەڵیان ئاشت نەدەبوونەوە بابی وەسێتی دەکرت ئەگەر مردیشم دەبێ نەیەتە سەر قەبرەکەم، بەڵام جاروبار دایکی بە دەزیەوە وەڵامی بۆ دەنارد و ئەحواڵی دەپرسی لە هێندێک ناوچەش خوێن و مەسڵەت دیاری کرابوو، ئاغای ئاوەدانی خوێنەکەی بۆ وەردەگرت و بۆی دەنارد ئیتر بابی کچە حەققی نەبوو وستەی بکا و نێوچاوانی تێکنێ و زمانی بگەڕێ. جاری واشبوو ماڵە بابی کچە هەڵگیراوەکە بۆ خوێن بەستن داوای کچیان دەکرت دەبوو ماڵەبابی کوڕە کچیان بدەنێ جا یان هەر بۆخۆیان بۆی بەرن یا بیاندەنێ جا ئەو کچە نابەدڵ بوو کوڕەی نەدیبوو خۆشی نەدەویست بەڵام چونکە بەرخوێن بوو دەبوو هەر بیکا و ڕازی بێ و دانیشێ حەققی گلەیی و ڕۆیشتنی نەبوو ئەوش ژنهەڵگیران.

٣)**گەورە بە چکۆلە**: ئەویش ئاوا بوو کوڕێک و کچێک حەزیان لێک دەکرد یا هەڵی دەگرت یان ئاغا بۆی دەستاند. دەبوو کوێخا و مەلا پێکەوە بێن تا مەسڵەت دەکەن، بە وەش خوێن دەبەسترا، کچێکی چکۆلەیان هەبوو دەگەڵ پووڵێک بیدەن بە ماڵە کچە هەڵگیراوە کە تا کچە گەورە دەبوو نە کوڕەی دیبوو نە ڕازی بوو نە هاوکوف بوون بەڵام لەبەر خوێن دەبوو بیکا و بڕوا چاوی دەرێ چ دەکا و چی لێ دێ.



**«شایی»**

**٤)چکۆلە بە چکۆلە:** منداڵی سەرلانکی کابرا کوڕێکی دەبوو هەر چکۆلە و مەمکەخۆرە بوو لە منداڵییەوە چارەنووسیان بۆ دیاری دەکرد، برادەرێکی هەبوو دەهات دیدەنی دەکرد. ئەوە چییە؟ خودا داویە قوربان نوکەری تۆیە، نێومان ناوە قادر. دەیجا عومری درێژ بێ نێوێکی پیرۆزە، ئەمنیش کچێکم هەیە، شیرەخۆرەیە بە نێوی نازدار، ئەوە پێشکەشم کرد. ئیشەڵڵا ئەگەر خودا عومریان بدا بۆ یەکتر باشن. جارجارێ وابوو هەر لە قالبی قەول و قسەدا دەبوو، جاریواش بووە مارە دەکران، گەورەش دەبوون نە یەکتریان دیبوو نە دڵیان یەکتری دەگرت و نە وەیەک دەکەوتن، بەڵام باب کوتوویەتی و تازە تەواوە، کەس نابێ قسەی لێ بکات کچەو کوڕەش متەقیان لێ نەدەهات

**٥) ژنبەژن:** بە خواستی هەردوک بنەماڵە بوو، بەڵام لە دوو ڕێ جیاواز بوون برازاوا بانگ دەکران، خەنەبەندانی هەر کەس لە دێی

خۆی بۆی دەکرا، باری شایی بار دەکرا، ئەویش یەغدان و دەستەنوێن بوو لە ولاغ دەندرا، هەر کەس بووکی خۆی ساز دەکرد بەربووکی دەگەڵ سوار دەکرد. دایک و دەستەخوشکەکانی هێندێکیان شین لە دوا دەکرد. قەولیان کردبوو هەر دووک بێنە کێلەشین چاوەڕێ یەکتر بن، لە هەوەڵەوە هێندێکیان چەلەخانە و دەمەتەقە دەکرد لەسەر ئەوە کە کێلەشین بۆ زاواکێو نزیکە، بۆ ئێمە دوورە نایەین. بابە قەی ناکات خزمایەتییە، دوو هۆگانیش دوورتر بێ، بەخاتری چاوی ئەوان،کاکە سەعات ۹ بەیانی لەوێ بن باشە.

سەعاتی دیاریکراو یەکیان نەدەگەیشتێ لێیان دەبوو بە کێشە. دەنا دەهاتن بووکی هەر دووک دەبوو دابەزن یەکتر ببینن و دەرزی بگۆڕنەوە و یەکیان درەنگ سوار دەبوو ئەوی زووتر وەڕێ دەکەوت دەستیان دەکرد بە هەرا و گورە، جاریواش بوو هەر لە کاتی بووک گۆڕینەوەدا دەبوو بە شەڕ، برینداری لێ پەیدا دەبوو. بووک دەچوونەوە ماڵەبابان لەسەر قسەی ناحەز بە زاوایەک یان لەسەر ئەوەی ئێمە زۆرتر هاتووین ئێوە کەم هاتوون.

٦) **ژن خواستنی بەتەنێ**: کوڕێک کچی مام وەسۆی دییبوایە لە زەماوەند، لە ڕێ مەڕی، لە ڕێی کانی دڵی گرتبووی، کچەش هەروا بەڵێنی پێدا بوو. بەڵام لازمە ئەوە بڵێن ئەو عیشقانە، عیشقی پاک و ڕاستی بوون لەسەر بناغەی خاوێن و داوێنی پاکی دوور لە خەیانەت بوون. ئەمن کچم بۆ نەفەرێک خواستووە ۷ ساڵ حەزیان لێک کردووە، خەریک بووە بۆ یەک شێت بن، بەڵام سوێندیان خواردووە لە زەماوەند

و هەڵپەرکێدا نەبێ، دەستیان وە دەستی یەکتر نەکەوتووە و دەستنوێژیان لێک نەشکاوە. مام وەسۆ نەی دەدا شیربایی زۆری داوا دەکرد. باری شایی کەلوپەلی دیکە، هەر جۆربا ڕازییان دەکرد بەو شەرتە ٥٠٠ تمەنم شیربایی دەوێ، ئەوەندەم باری شایی دەوێ، پێشکەشی ئاغا و کوێخا دەبێ بۆخوت بیدەی، خەنەبەندانی بۆ دەکەم.

**ڕوونکردنەوە:** خەنەبەندان ئەوەیە بۆ ئەو شەوەی بۆ سبحەینێ بووک دەڕوا دەبێ ماڵە زاوا چەند نەفەر بنێرن بە نێوی برازاوا ئەگەر بووک وەلاوە ڕۆیشتبا بووکیش لە هەموو کچانی نێودێ دەگێڕاوە، خۆیان دەڕازاندەوە هەر یەک بە دیاری خۆیەوە دەچوون هیوا بوو دراوی پێ بوو، سابوون کیسەخەنە، هەر کەس بە پێی دەسەڵاتی خۆی دەچوون دادەنیشتن. گلێنە سوێنەی چکۆڵە یا تەشتی چکۆلەیان پڕ لە خەنە دەگرتەوە هەمووی وێکڕا دەستیان لە خەنە دەدا، دەستی بووکیشیان لێ دەدا شایەری نێودێ یان کوڕ و کاڵی دەنگخۆش دەستیان بە گۆرانی و هەڵپەڕین دەکرد تا شەو زۆر درەنگ دەبوو، بەیانیش هەموو دەهاتن بووکیان ساز دەکرد ئەبەوانە: سیخمە بەدراو، گۆبەرۆک، ژێرچەنە و کرمەک، لاگیرە و گوڵەچاو، مێخەکبەند، بەرموور و قاشی بەر موور، تاسکڵاو، گوڵینگی ئاوریشمی پاشەسەر، دەستەوانەی شیلان، بەرمووری پیرۆزەی شین، بازنە و خرخاڵ، سملۆ و مێخەک، بووکیان بەوانە دەڕازاندەوە جا دوایی تارای سووریان بەسەر دادەدا کورسییان بۆ دا دەنا، سواری ولاغیان دەکرد یەکیش جڵەوی ولاغەکەی دەکێشا) چەند سوارم دەوێ، دوو یەغدانم دەوێ.

بابی کوڕە دەی‌دا دەی کوت بەچاوان. سوار و پیادە دەهاتن برازاوا درێژ دەبوون، سوارە چاوەڕێ بوون بووک سوار بێ. یەکێک لە برازاواکان تەشتێک یان کەوچکێکی لە ماڵە بووکی دزیوە و لەوێ دەری دێنا و نیشانی خەڵکی دەدا ئیتر ئەوە بە عەیبێکی گەورە دادەندرا، ماڵی بووکێ پێیان وابوو ئەوە سووکایەتییە بەوان کراوە.لە دەوری دێ ڕمبازێن دەکرا.

بەربووک ژنێک بوو دەگەڵ بووکیان دەنارد تا دەگەڵی بێت. زۆرتر لە نزیکانی بووک دەبوو و لەو سەریشەوە خەبەری ڕووسووری بووکی بۆ ماڵە بابی بووک بێنێتەوە. سوار و پیادە ڕێ دەکەوتن بۆ لای ماڵە زاوا. شوان مەڕێکی دێنا لەسەر ڕێگا ڕای دەگرت دەیکرد بەقوربانی، تا پووڵێکی بدەنێ. برازاوا دەیان دایە تا دەگەیشتنە دێی ماڵە زاوا، چەند جێگای ئاوا دەبوو مەڕیان دێنا، گایان دێنا سەر ڕێگای بووکی تا پووڵیان دەنێ. نزیک دەبوونەوە لە دێ پۆلێک هەواڵ و ڕفیق زاوایان بەرەو پیری بووکی دێنا، دەبوو دیارییەکی پێشکەش کات. بووک دەگەیشتە نزیک دەرکی ماڵە زاوا، کچان بەرەو پیری دەچوون بۆ سەما کردن، بووک دەگەیشتە بەر دەرکی، کورسییەکیان بۆ دادەنا تا بووک پێی لەسەر دانێ و لە ئەسپەکە بێتە خوارێ، زێڕوەشانیان دەکرد. پووڵ و نەقوڵ و شیرینیان بەسەردا هەڵدەهاویشت زاوا دەپەڕیە سەربانێ، سێو، سەرەقەند، گوڵمێخەک بە دەستیەوە بوو لە بووکی هەڵدەکرت، بەڵام دووری دەهاویشت. بووک دەگەیشتە بەر دەرگا پێی دەچەقاند نەدەڕۆیی، تا خەزووری یان زاوا نەهاتبا و مانگایەکیان پێشکەش

نەکردبا نەدەڕۆیی. دوای هاتنی ئەوان ئیتر دەڕۆیی دادەنیشت بەرە بەرە خەسووی، دش، هێوەرژن و هێوەر و خەزوور و ئەوانە دەچوون بە خێراتنیان دەکرد (مبارەک بادی). ئەوە بوو بە کورتی ڕێوڕەسمی ژن هێنان لە ڕابردوودا.

## بۆ وەبیر هێنانەوە

جێگای ئاماژە پێکردنە لەسەر ئەو حاڵەتانەی کە باسمان کرد. خانەوادە لە ڕابردوودا تەبا و ڕەباتر بوو بە نامووسی و داوێن پاکی و حەیا و فهێت زۆر زیاتر و زۆرتر بوو. هەرێمی خانەوادە زۆر پاک و بێخەیانەت دوور لە هەر بەدئەخلاقی و ناحەزی و دزێوی بوو. ژن تەڵاقدان بۆ هەر دووک لا زۆر شوورەیی بوو و لە نێو کۆمەڵدا دزێو و بێزراو بوو. بۆ ژنێک تەڵاقدرابا خۆی بە عەیبدار دەزانی و ئەو ماڵەش ئەوەیان بە کەسری شان دەزانی. دەرسەدی تەڵاق یا نەبوو یا زۆر کەم بوو. بۆیە دەیان کوت: «نۆجارزاوان بخوازن بەڵام تەڵاقدراوان مەخوازن». ڕاستە بابسالاری بوو بەڵام دڵسۆز بوو عەولادی خۆش دەویست، کچیش شایی بە ژیان بوو، بە ماڵە مێرد بوو، وێڕای پیاو کاری دەکرد ماڵی پێکەوە دەنا ڕێکی دەخست، حورمەتی دایک و باب لە سەرەوەی هەموو شتێ بوو. بریا هەر باب سالاری با بەڵام موبایلسالاری و چەتسالاری نەبا، بریا هەر وەک ڕابردوو ژن و مێرد شەواو شەو یەکتریان دیبا و لەبەر دایک وباب لە ڕوویان نەهاتبا دەگەڵ یەک قسە بکەن، قومار بکەن بەڵام ئەوی ئێستا دەبیندرێ و دەکرێ قەت نەبوایە و نەکرابا و نەبیندرابا، نەبیسترابا بە نێوی ئەوەی

ئێستا باب سالاری نییە بەڵکوو ئازادییە. ئەوەی دەکرێ، دەبیسترێ و دەبیندرێ زۆر دوورە لە فەرهەنگ و ڕێوشوێنی نەتەوەی کورد و تەنانەت مرۆڤایەتی. لە ڕابردوودا ڕێزی تایبەت بۆ دایک و باب دادەندرا، بۆ پیر و پەککەوتوو و بە ساڵدا چووەکان. ئێستا هەر دایک و بابە دەرکراوە لە بنەماڵە هەڵبڕاوە، بێکەس و بێبەش و ناهۆمێد و دەست تەنگ و دڵ تەنگە؛ ئەوەیە دونیای پێشکەوتووی ئەوڕۆ. بەو هیوایە وا نەمێنێ و وا نەبینین و پیر و پەککەوتوو- و- دایک و باب بە هەڵوەدایی نەبینین و نەبن. بەو هیوایە.

# ڕێوڕەسمی سەرەخۆشی لە ڕابردوودا



ژیانی بەشەر وا بووە و هەر واش دەبێ، لەو ڕۆژەوە دونیا داندراوە بەشەر لەسەر کورەی زەوی ڕوندراوە تا ئەو ڕۆژەی دەبێ و دەمێنێ نەسلێک بڕوا و چینێک بێ جودا لە عیلم و زانین و پێشرەفت دونیا و پەیدا بوونی کەرەسەی پێشکەوتن ڕۆژ دەگەڵ ڕۆژ؛ جودا لەوانە بەشەر بۆ بوون و مردن هەر یەکە و تەفاوەتیان نییە لە ئادەمەوە تا خاتەم کەس نەبووە بمێنێ و نەمرێ و لە مەرگ ڕزگار بێ شا بی یان گەدا، زانا بی یا نەزان، جا دیارە دوای مردن هەر نەفەرێک لە بنەماڵەدا خەم و کەسەری زۆرە بۆ خێزان و دەورووبەری، لەوە گەڕێ دونیای ماشین و ئیمکاناتی ڕۆژ قەدری بنیادەمی هێناوەتە خوارێ و ئەو ئینسانە عەزیمەی چکۆلە کردۆتەوە. هەر ڕۆژ پۆلێک دەکوژرێ و عالەمێک کوشتوبڕ دەکرێ. دەنا لە ڕابردوودا کەسێک مردبا یان کوژرابا دونیا دەنگی دەداوە و پێی دەزانی جا بەو بۆنەوە

ئەگەر لە دێهات کەسێک دەمرد دەیانکوت عومری خودای کردووە، ئەمری خودای بەجێ هێناوە، فەوتی کردووە، بە ڕەحمەتی خودا شاد بووە، مردووە، کۆچی دوایی کردووە، چۆتە ماڵی حەق. هەروا کاتێک دەمرد هەمووی نێو دێ کۆ دەبووە. بەر لە مردنی کە نەخۆش دەبوو دەیان نارد لە شوێن مامۆستای ئایینی دەبوو لە پشت سەری یاسین بخوێنێ. دیارە یاسین سوورەتێکی گەورە لە قورئانی پیرۆزە، دوای خوێندنی یاسین وەسییەتی



**«ڕێورەسمی سەرەخۆشی»**

پێ دەکرد، بۆ دوای مەرگی خۆی دواتر شادە وئیمانی پێ دێنا دوای ئەوانە کە تەواو دەبوو، بەردەمیان هەڵدەدا دەیان هێنا هەر لە ماڵە خۆی ئاویان بۆ گەرم دەکرد زۆرتر خەڵکی گەڕەکی ئەو کارەیان دەکرد. دەنا ماڵە مردوو لەبەر گریان هۆشیان نەبوو.کاتێک ئاویان گەرم دەکرد کەسێ تایبەتی هەبوو لە نێو دێ، مردووی دەشوت. ئەویان دێنا دەیشوت، دواتر کەوا و پاتۆلی مردۆکەیان دەدایە بە خێر. ئەو جار

جێگایان بۆ چاک دەکرد جێگاش ئەوە بوو یان لە دیوێکی چۆڵ لە حەساریێ دوو دانە کورسییان لە ڕیزێکەوە دادەنا و دوو باقەش گیایان لەسەر کورسێکان دەخست مردووەکەیان لەسەر دەشوت دەنا دەیان بردە سەر شۆرکە لەوێ مردووەکەیان دەشوت. کاتێک دەیان شوت خەڵاتیان تێوە دەپێچا، خەڵات یان کفن. جاری وا بوو لە نێو دێدا پەیدا نەدەبوو دەچوون بەرماڵی مزگەوتیان دێنا، دەیان کردە خەڵات و دواتر بەرماڵەکەیان بۆ مزگەوتی دەکڕییەوە دەنا جاری وا بوو پیاوی خێرخواز لە پاییزدا تۆپێکی خام دەکڕی بۆ خەڵات تا لە زستاندا خەڵک پەکی نەکەوێ دوای ئەوانە داریان بە گوریس تێک دەخست وەک تابوت، ئەو کات تابووت نەبوو و ئیتر مردووەکەیان لەسەر دادەنا بۆ مزگەوتێ هەمووی پیاوی نێو دێ لە دەوری دەهاڵان، سەماوەریان تێدەخست ئەگەر شەو بایە ئەوەی خوێندەوار و قورئانخوێن بوو، وێکڕا لەسەر مردوو دەستیان دەکرد بە قورئان خوێندن تا بەیانی، بێ ئەوەی کەسێ بڕواتەوە ماڵێ.



ئەگەر دێیەک فەقێی با، هەموو فەقێکان دەگەڵ قورئان خوێنی دیکە قورئانیان دەخوێند. ئەگەر شەوێ برسییان بایە دەچوون نان و پەنیریان دێنا و دادەنیشتن و ئەگەر ڕۆژیش بایە هەر قورئانیان لەسەر مردووەکە دەخوێند تا قەبرەکەی تەواو دەبوو و ئیتر لەسەر دارەمەیتیان دادەنا. دەیان برد بۆ قەبران کاتێک بەرەو قەبران ڕێ دەکەوتن، پێوەندیی بە ناوچە بوو لە هێندێک ناوچەکانی کوردستان بۆ دوای مردن شینگێڕی و کاری دیکەیان دەکرد. دەنا بۆ خەڵکی ئاسایی دەفەیان لێدەدا و سڵاواتیان دەکوت تا دەگەیشتنە سەر قەبران«ئەو جەهەندەمەی هانەهانە تێدا دوو ماری سەرپانە، سەڵام لەوەی بە ئیمانە، بەر نووری محەممەد سڵاوات، بە مردنت دڵمان تەنگە، ژێرمان عەرزە و سەرمان سەنگە، ماڵی حەقمان قەبری تەنگە، بەر نووری محەممەد سڵاوات. لەو ڕۆژەی دونیا داندراوە شا و دەروێش تۆپێک جاوە دونیا بۆ کەسی تاسەر نەماوە بەر نووری محەممەد سڵاوات». کاتێک مردوویان لە قەبر دەخست دەیان کوت: دوو نەفەری لەسەر بەجێ بمێنێ هەرای لێ بکەن تا نەترسێ لە جوابی مەلائیکە کە دێن و پرسیاری لێ دەکەن، ئەوجار دەهاتنەوە دەرکی ماڵە مردوو فاتیحایان دەخوێندەوە و دەچوون بۆ مزگەوتێ و ماڵە مردووشیان دەگەڵ خۆیان دەبردەوە و بە زۆری نانیان دەرخوارد دەدان نەک لە ماڵە مردوو، کاتێک میوانی دێهات دەهاتن ئەویش پێوەندیی بە ڕێوڕەسمی ناوچەکە بوو، لە ناوچەی مەریوان و هەورامان هیچ لە مزگەوت و لە ماڵە مردوو ناخۆن، بۆخۆشیان یارمەتی بە ماڵە مردووەکە دەدەن، لە ناوچەی مهاباد، مەنگوڕان، سەردەشت وەک سەر شایی یارمەتی و کادۆ بۆ ماڵە مردووەکە

دەبەن تا زەرەدیان لێ نەکەوێ. لە ناوچەی هەوشار ئیتر هەر نەفەرێ بێ بۆ پرسە، پووڵ دادەنێ یا شت دەگەڵ خۆی دێنێ و دوو نەفەر نازلخەرج دەبەن بە بێ ماڵە مردووەکە ئەوەی خەرجی دەکەن و ئەوەی دەیهێنن، دەینووسن. لە نێو عەشیرەتدا لە هەمووی ناوچەکان پووڵ و زەخیرەیان دەبرد و دادەنا بۆ یارمەتی و کۆمەک بە ماڵە مردووەکە، زۆریش دەماوە وەک داخڵە هەڵیان دەگرت بۆ مردوویەکی دیکە لە دێهاتیش سفرە بوو، سفرەش ئەوەیە کاتێک مردووەکە تەسلیم بە خاک دەکرا و دەهاتنەوە دەرکی ماڵە مردووەکە ئەوجار سەرەخۆشیان دادەنا، میوانی غەوارە دەهاتن دیارە دەچوونە مزگەوتێ و سفرەیان دەبرد بۆ مزگەوت هەر وەک پیاوان دەهاتن لە دێیانەوە ژنانیش دەهاتن دەبوو سفرە بۆ ئەوانیش بچێ، ئەو کات کەوڵیان ساز دەکرد لە پێستی حەیوان بە نێوی سفرە چونکە مەجووعمە نەبوو ئەڵبەتە لازمە ئەوە بزانین خەڵکی دێهات زۆر شتیان لە پێستی حەیوان ساز دەکرد وەک: **پێستەی پەنیر، هەمبانە، دۆدانە دۆ، شیرمەشک، کەوڵی نانی و زۆر کەرەسەی دیکە** کە لێرەدا لازم نییە، ئەوانە لە پێستەی مەڕ دروست دەکران. جا کە میوان دەهات لە هەر ماڵێک دوو جێگا نان دادەندرا یەکیان بۆ مزگەوتێ بوو، بۆ پیاوان و ئەوەی دیکە بۆ ماڵێ بوو، بۆ ژنان. جاری وا بووە میوان ئەوندە زۆر بووە خەڵکی نێو دێ هەر نانەکەی بردووە دەنا نە دانیشتووە و نە خواردوویەتی چونکە جێگا نەبوو لە ژن و لە پیاو ئیتر نەیان دەهێشت ساحەب مردوو زەرەر بکێشێ بە ڕاستی هاودەردیان دەگەڵ دەکرد لە هەر بارێکەوە. ئەوە بوو بە کورتی ڕێوڕەسمی سەرەخۆشی لە ڕابردوودا لە کوردستان.

# سێ ڕۆژانەی مردوو

ئێمە نە لە ڕوانگەی دین و مەزهەبییەوە و نە لە باری فەرهەنگیی و کلتووریەوە سێ ڕۆژانە و حەوتو و چلە و ساڵگەردمان نەبووە بۆ مردوو بە شێوەی ئەمڕۆ لە کوردەواریدا. بەڵێ دەیانکوت لە ڕابردوودا لە لایەن بنەماڵە دەوڵەمەند و ساحەب عەشیرەتەکانەوە کۆتەڵیان دەڕازاندەوە. یانی وێنەیەکیان ساز دەکردوو- و سواری وڵاغیان دەکردوو- و بە دەوریدا دەگریان، بەڵام ئەویش فەرهەنگی هەمووی خەڵکی کورد نەبوو و لە هەموو ماڵێک و جێگایەک نەکراوە ئەوانە زۆرتر ڕێورەسمی لاوەن بۆ ئێمە هاتووە هێناویانن. چونکە کورد لە قەدیمەوە ڕازی بووە بە قەزا و قەدەری خودا و هێندەش لە مەرگ نەترساوە تا لە بیری نەچێ. دیارە لە ڕابردوودا کورد لە حاڵی حەیاتدا ئاگای لە کەس و کاری خۆی زۆر بووەو بە تایبەت دایک و باب تا ماوە لە خزمەتیدا بووە بەڵام کە مردووە تەحویلی خودای داوە دۆعای بە خێری بۆ کردووە لە خێر و خێرات بێبەشی نەکردووە نەک وەک ئێستا. دۆستێک دەیگێڕاوە دەیکوت ڕێم لەسەر قەبران کەوت دیتم کوڕێک زۆر باشی دەناسم گۆزەیەکی ئاو پێیە لێم پرسی کوتم دۆستی عەزیز ئەو ئاوەت بۆ چییە ئەویش کوتی وەڵڵا چۆن نازانی دەیبەم بۆ سەر قەبری بابم نەمامی پێ ئاو دەدەم ئەمنیش کوڕەم چاک دەناسی

ڕووم تێکردوو و کوتم هەتیوە پیاوی باش ئەتۆ بە زیندوویی لیوانێکت ئاو نەدەدایە بە تەنێ لە ژووردا بەجێت هێشت ئێستا بە مردوویی گۆزە ئاوی بۆ دەبەی؟ بڕۆ لەبەر چاوم عەیب بکە. یان تەمەشا دەکەی دایک یا باب یا هەر دووکیان لەسەر چەند کوڕان لە ژوورێدا بە تەنێ یان کچەکەی لەسەر بۆڵە و پرتەی مێرد بردوونیە کنەخۆی و بە خێویان دەکا ئەگەر مردیشن قوربان ١٠ تا ٢٠ نەفەر لە مزگەوت ڕیز دەبن و ڕادەوەستن یا دەنا ئاغای خۆم ئەوە سێ ڕۆژانە و حەوتە و چلە و ساڵگەردی بۆ دەگرن یا شیعر و کێلی بۆ دەنووسن. خۆشەویستەکەم تا ماوم ئەتۆم دەوێ ئاگات لێم بێ ئەگەر مردم خوداوەند بە ڕوحمە ئاگای لێمە تازە لە ژێر باڵی ڕەحمەتی ئەودام وێڵم ناکا دەرم ناکا، لە بەزەیی خۆی بێبەشم ناکا ئیشاڵڵا. کۆی بەخشینی بێسنوورە. بەڵام ئەو سێ ڕۆژانەی نێو کوردەواری ئەوکات ئاوا بوو. دیارە لەهەر زەمانێک کەس و کار مردن ناخۆشە داخ و کەسەری زۆرە بە تایبەت دایک و باب تازە نایەتەوە، نابێتەوە نایبیننەوە دوای وان عەولاد چ لە ڕێگای دینیەوە و چ لە ڕێگای لۆمە و تانەی خەڵکەوە و چ لە باری ویژدانییەوە پەشیمان و ناڕەحەتە ئەگەر خزمەتی نەکردبن یان دڵی ئێشاندبن چونکە پێی وایە ئەویش عەولادەکەی وا دەبێ و ناش حەسێتەوە لە بەری. دیارە واشە ئەو چون بوو بۆ دایک و بابی خۆی ئەویش وا دەبێ بە چاک و بە خراپ. ئەوکات کەسێک یا ماڵێک مردوویەکیان لێ دەمرد تا ٣ ڕۆژان وەک لە پێشەوە باسمان کردووە هەمووی خەڵکی نێو دێ سفرەیان دەبرد بۆ ماڵێ و بۆ مزگەوت دوای

٣ ڕۆژە پیاوان سەرتاش و چەقۆی گوێزانیان دەگەڵە خۆیان دەبرد مامۆستای ئاوەدانی وەپێشیان دەکەوت و دەچوون سەر و ڕیشیان بۆ دەتاشین کە پێیان دەکوت تەعزیە شکاندن، ئیتر ئەوکات تەلەویزیون و دۆدی و بۆدی نەبوو بە هەڵکەوت دێیەک ئەگەر ئاغای ئاوەدانی ڕادیۆیەکی هەبا دەنا هیچ نەبوو ئەوە پیاوان. ئەو جار ژنان سەری چوار ڕۆژە یا پێنج ڕۆژە ئەگەر دێیەک مەلای لێبا ئەوە چوار پێنج ژنی کەیخودا ژن و سەرسپی دەگەڵ مەلا ژنی ئاوەدانی کیسە خەنە و سابوون یا ئەسپۆنیان هەڵدەگرت و دەچوون بۆ ماڵە مردووەکە دوای دڵخۆشی دانەوە و نەوازشی زۆر ئاویان وەسەر تەندوور یان کوچکەئاور دەنا مەنجەڵێکیان ئاو گەرم دەکرد و بە یەک دوو ژنی جحێڵ و بەکار سەریان دەشوتن ئی ماڵە مردووەکە دوای چەند ڕۆژ یا هەر ئەو ڕۆژە سەریان بۆ لە خەنە دەدان و ئیتر تەعزیەیان دەشکاندن و تەواو دەبوو. ئەوە بوو سێ ڕۆژانەی ئەوکات کە دەگەڵ دین و فەرهەنگی ئێمەی کورد دێتەوە.

# ئاڵ و شەوە

لە ڕابردوودا ژنی زەیستان و منداڵی ساوا گیر و گرفتی زۆری بۆ پەیدا دەبوو جاری وا ژنانێک کە منداڵیان نەبا و نەدەبوو «نەزۆک» لە لایەن مێرد و ماڵەمێردەوە لە فشاردا بوون، چونکە ئەوکات عەولادی زۆر لازم و هۆی پشتگری دایک و باب بوو وەک ئێستا نەبوو بە ماڵێک منداڵکیان پێ بەخێو نەکرێ یان منداڵ ئەوەندە ناجسن بێ چاوی دایک و باب دەرێنێ. یان دونیا وابێ بە حەوت کوڕان دایکێک ڕانەگرن، هەتا منداڵ زۆربایە دڵییان خۆشتر بوو چون کاریان دەکرد نەدەسووڕانەوە و ڕۆژی تمەنێک پەیدا نەکەن شوانی، گاوانی، گا لەوەڕێن، بەرخەوانی، شوانی گوێرەگەل، گێرە، جەنجەڕ، باقەبێن بادان، باقە کێشانەوە، گوێنی هێنان، باقەبێن هێنان، گا دەرکردنەوە لە بەهاردا و چەندین کاری دیکە. جا بۆ ئەوە کە منداڵی بێ و دەچووە سەر شەخس و پیران. وەکوو شێخ گوڵ لە بۆکان، سوڵتان لە ناوچەی مهاباد، قلیج بابا لە گەورکان، شەخسی بەلاوێ لە سەردەشت، هۆمەربلال لە سەقز، پیر یونس لە بانە، چاوەی خولای لە پیرانشار، پیر کەفتە لە مەریوان و قوڕعانەکەی نیگڵ لە سنە، بەشکم خودا عەولادمان داتێ، با بە وەجاغکوێری نەمرین خودا عەولادی دەدانێ نەک شەخس و دۆعا. ژنە زگی پڕ دەبوو وەک ئێستا نەبوو ڕەش لەسەر سپی دا نەنێ

یان لە مێردەکەی توورە بێ بۆ نەت بردم بۆ تاران لەوێ زایمان بکەم، بۆکان و مهاباد کوا جێگای منە. ژنە ئەوکات بە زگی پڕی دەبوو کار بکات تا دەگەیشتە ٩ سەعات و نۆ دەقیقەی خۆی نەدەبوو ڕاوەستێ، بە تایبەت ئەگەر یەک تەن بایە یان خەسووی دەگەڵ لە ماڵێدا با، ئاو ڕاوەستێ نەدەبوو ئەو ڕاوەستێ. کاری دێش زۆر بوو ئەوکات شار شتێک نەبوو هەر دێ و دێهات بوو بۆ ڕزق و ڕۆزی. کاری دێهاتیش ئەوانە بوون کە دەبوو ژنە بیکا دەسکەنە، بژار، مەڕدۆشین، مەشکە ژاندن، تەویلە ماڵین، شیاکە ڕشتن، تەپاڵەی بکاتەوە، نان و هەویر بکا، تەندوور و ئاوری ساز کا، دۆی وەسەر ئاوری بنێ، شیرێژی هەڵێنێتەوە، توورەکە دۆی هەڵاواسێ، دۆدانەی بۆ کاسبکاران پڕ کا، نان و پێخۆری بۆ ئەوان تێباوێ، مانگا بدۆشێ، گوێلکی وەگرێ، پاتاڵی تاقەت کا، چێشتیش بۆ کێوەوانی ساز کا، ئەوانیش وەحاوێنێ و چەندین کاری دیکەی ماڵێ دەبوو بکا. ئەوجار کە ژانی دەهاتێ نە دوکتور و نە قابیلە و نە مامان هەبوو، ژنێکی پیری کۆنەکار ئیوا بوو چەقوو یا تیخەڵەیەکی پێبوو هەموو کاری ماڵێی پێدەکرد، جا نێوکی مناڵیشی پێدەبڕی. بۆیە هەموو گیانی ژنە و مناڵەکە هەر بەڵا و نەخۆشی بوو.

**جا یەکێک لەو نەخۆشیانەی مناڵ شەوە بوو.** ئەویش ئاوا بوو ژنە مناڵی دەبوو و مامان یا دایەشان پێدەکوت دەهات چەقۆیەکی کوولی پێبوو تازە پیوازی پێ چاک کردبوو یان چەند کاری دیکەی ماڵێ، لە نێوکی مناڵەکەی دەنا و دەیبڕی و خراپی دەبڕی. ئەو چڵک و ژەنگ و بۆنەی چەقۆکە دەچووە نێو زگی مناڵ، لێی دەکردە «کوزاز» دەیان

کوت شەوە بردوویەتەوە- جا بۆ عیلاجی ئەوکارە دەهاتن یەک نەفەریان لەبەر درگا دادەنا تا دەنگی لێوە بێ و نەترسێ شەوە و ئاڵ نەیە دەنا دەچوون دۆعایان بۆ دەنووسی دەنا منداڵەکەیان لەسەر بێژنگ دادەنا یا شووژنێکیان بەسەر لانکەوە دادەکرد دەیانکوت شەوە تخونی ئەوانە نابێ لێیان دەکشێتەوە.

(**ڕوونکردنەوە:** شەوە لە ڕوانگەی قەدیمیەکان چ دیمەنێکی هەیە؟ شەوە دیارە هەر ئەفسانە و خەیاڵە. بەڵام ئاوایان بردووەتە دەروون و زێهنی عامە و ناساندوویانە- دەعبایەکە سەر و بەدەنێکی زەلام و ڕەش و بڵیند وەک جانەوەر وایە، بەڵام قسە دەکا هەر کەس بیبینێ زمانی دەبەسترێ، لە تەنگەی نوێژی شێوان یان شەو درەنگانێک ئەگەر ژنی زەیستان کەسی لەلا نەبێ لێی وەژوور دەکەوێ چەپۆکێک بە منداڵەکەدا دەدا زۆرتر بیستراوە هەر زەرەدی بۆ کوڕ بووە، ئیتر کە چەپۆکی پێدادا کوڕە شین و ڕەش دەکاتەوە و دەمرێ، ئەوکات دەیانکوت ئەو ژنە منداڵی بۆ نامێنێ، هەر شەوە دەیباتەوە). ئەوە شەوە.

**ئەوجار یەکی دیکە لەو ئەفسانە دەردە خەیاڵییانە ئاڵ بوو.** با لە بەرەوە ئاڵ بناسین، وایان بردبۆوە مێشکی خەڵکەوە کە ئاڵ ژنێکی سورهول و چاوزەق، درێژ، ئاسمان لە نێو لینگیدا دیارە سەر و گوێڕووت، ددان شاش و درێژ، چەنە پان و لووتزل و نینۆک پان، دەنگگڕ و گوێزل و چاوشین. کاری ئاڵ دزینی جەرگ و دڵی ژنانە، لە کاتی منداڵ بوونیاندا. ئێستاش نێوی ئاڵ و شەوە لە بەشی پارێزگای

خۆراسان هەر ماوە. تا ئەو ساڵانەی دواییش لە کوردوستان هەر باو بوو و باسی دەکرا، ئەوە نییە خەڵکی پاریزگای خۆراسان لە شەو و ڕۆژی جێژنی نەورۆزدا دەڵێن:( آلا به در، بلا بە در، دزد و حیز آزدیها بە در). جا مەبەست لە ئەزدیها هەمان ئاڵە. جا دیارە ئەوە لە هەر کەسێ وەژوور کەوێ هەر دڵی دەتۆقێ. ئەوە لە ژنی زەیستان وەژوور دەکەوت جەرگ و دڵی دەکوشی ژنە دوای ماوەیەک دەمرد دەیانکوت ئاڵ بردوویە. کاتێک ژنانی دێهاتێ درەنگ لە منداڵ دەبووە دۆعایان بۆ دەنووسی- شاڵی سەیدیان بۆ دێنا دەنا دۆخینی پیاوی نوێژ و ڕۆژ و پاک و بێگوناهیان بۆ دێنا تا لێ ببێتەوە. مامان(دایەن) زۆری دەگەڵ خەریک دەبوو، منداڵەکەشی دەبوو لەبەر ئەوەی خوێنڕێزی دەکرد دوکتور و دەرمان نەبوو کەرەسەی لەش ساغی لە وڵاتدا نەبوو ژنە دەمرد دەیانکوت ئاڵ بردوویە. بۆ پێشگیری لەوە، بابۆڵە نانیان بە خوێوە دەدایە، دەنا میوانی یان قۆیماخ بۆ دروست دەکرد کە ڕۆن(ڕۆنی کوردی) پۆنگاوی لەسەر خواردباوە، دەنا شووژنیان لەسەر دەمەی لانکەکەی دەدا دەیانکوت ئاڵ و شەوە لەوانە دەترسێن.

**یەکی دیکەی لە نەخۆشیی ئەوکاتی منداڵ خرکانە بوو**، ئەویش ئاوا بوو دەم و چاوی دەبوو بە زیبکە و کرێژ، سوور هەڵدەگەڕا ئێشی هەبوو ئیوا بوو ئاویشی

لێدەهات. ئەوە دەردێک بوو لە یەکتریان دەگرتەوە «یانی ساری بوو» ئەوەی دایک و بابی بە منداڵی خرکانەی لێهاتبێ منداڵەکەشی لێدەهات و دەبوو حاجەتی منداڵێکی بۆ نەهێنن کە بە منداڵی خرکانەی لێ

هـاتبیّ وەکوو لانکـە، دەسـرازە، سـەرلانکـە، سـەردەمـە، مـەمکـەمژە، بلـوێر، گەڵوازە، گۆشتگرە، باڵیفە، دەبوو ئەوانەی تخون نـەکـەویّ و تێی نـەپێچن دەنا دەیگرتەوە.

**یەکی دیکە لە نەخۆشییەکانی منداڵ لە ڕابردوودا ئاورە بوو:** ئەویش هەموو سەر و دەم و چاوی دەبوو بە برین، قرماغەی دەکرد ئێشی زۆری بوو دایکی زۆری پێوە ماندوو بوو. چونکە خـەوی لیّ نـەدەکـەوت دایکی دەبـوو هــەر دانیشــیّ لــە پــەنــا لانکــەکــەی و ڕایژێنــیّ و بیلاوێنێتــەوە. دەرمانەکەی ئەوە بوو دەهاتن کەشکی دوای پەنیری بەهاری هی حـەیوانی وردە دەگـەڵ ڕەشـایی بنـەمـەنجـەڵ لێکیـان دەدا لـە جێگـای برینـەکـەیان هەڵدەسوو دەیـانکـوت چـاک دەبێتـەوە و ئیـواش بـوو بـە ئـاورە دەمـرد. کەسێک منداڵی بـە ئـاورە مردبایـە دەیـانکـوت ودمـی پێیـە تفـی لـە ئـاورەی هەر منداڵێک بدا چاک دەبێتەوە. جا وابوو یان نا، نازانم.

**یەکی دیکە لەو دەردانەی منداڵ لەمە بوو،** لەمە جۆرێک نەخۆشی بوو بۆ ماوەیـەک منداڵ بیّ سـەر و زمـان دەبـوو کرِ و مـات دەکـەوت چونکـە منداڵ بوو نەیدەزانی بڵیّ کوێم دێشـیّ دوکتوریش نەیـدەزانـی. بـەڵام ژنـی قەدیمی بوون دەیانکوت ئەوە لەمەیەتی. علاجەکەشی ئەوەیـە لـە نـەرمـایی بـەری دەستی و بـەری لاقی منداڵـەکـەیان بـە دەرزی دروومـان تیّدەکوتـا یەک دووجار. ئەوجار دەهاتن نیوەنمکی هـەویریـان لـەسـەر نێوکی دادەنـا، ٢٤ ساعەت و چەوریشیان دەکرد ئیتر چاک دەبووە ئەوەش لەمە.

**یەکی دیکە فیێڵە مانگە بوو** ئەویش ئاوا بوو هەموو سەر و بنی مانگـان ئـەو منداڵـە زگـەشـۆرەی دەگـرت و دەڕشـاوە، عیلاجـەکـەی ئـەوە بـوو

دەچوون لە تالاویَ دەشتی شاماتی مهاباد، لە سیوچ یەکێک لە دێیەکانی بانە کۆلکە دارێکی لیَبوو، ناڵ یا بزماریان لێدەدا لەو کۆلکەدارە، ئیتر دەیانکوت ئەو منداڵەکە چاک دەبیَ.

**یەکی دیکە لە دەردی منداڵی زارێشە بوو.** ئەویش بۆقژەشیان پیَدەکوت زارێشە یا بۆقژە ئەوە بوو زار و زمان و مەلاشووی منداڵ هەمووی بلۆقی دەکرد، زاری مەمکی دایکی بۆ نەدەگیرا، دەگریا ئارا و قارای لەلا نەدەما. عیلاجەکەی ئەوە بوو دەبوو نەفەرێک جامێک بە دەستەوە بگریَ بچیَ لە دەرکی ٧ ماڵ بدا هەر ماڵێی مستێکی ئارد بۆ لە جامەکە کا ئەویش نە قسە بکا و نە دەنگ بکا، هەتا ٧ ماڵەکەی تەواو دەکرد دیارە خەڵکیش ئەوەی دەزانی قسەیان دەگەڵ نەدەکرد ئەو نەفەرە دهاتەوە ئەو ئاردەی دەکرد بە هەویر و دەیکرد بە ٧ کولێرەی چکۆلە بە کۆڵەکەی ماڵێوەی دەدا دواتر کە کولێرە ویشک دەبوو زمانی ئەو منداڵەش چاک دەبوو تەواو دەبوو.

بەلای دیکەی منداڵ لە ڕابردوودا زۆر بوو وەکوو خولێرکە، سوورێژە، مێکوتە، بالۆکە، گەشکە، فێی لێهاتن«سەرع» ترسان.

**خولێرکە یان هاوڵە**: زۆری قوربانی دەدا و منداڵی عەیبدار دەکرد شێخ ئەحمەدی کۆر، مەلا غەفوور حافزی مەهاباد و زۆری دیکە بە هاوڵە یا خولێرکە چاویان کوێر بووە. هاوڵە بەلایەکی گەورە بوو بۆ منداڵ و بۆ گەورەش، پێی کوێر دەبوو، پێی دەمرد، پێی گڕویَ دەبوو، ناحەز دەبوو کە پێیان دەکوت خولێرکاوی یا ڕەنگ هاولای (ئابلە).

**دووهەم مێکوتە بوو:** ئـەویش بـە دەرد و ژان بـوو بـەڵام نـە بـە قـەت خولێرکە گەورە بوو نە بە قەت سورێژە بە ژان بوو.

**سێهەم سوورێژە بوو:** کە زۆرجار بووە بە هۆی مەرگی چەند منداڵ، چون بێهۆشی دەکرد و گەرمی دادێنا و ئێشی لە ڕادەبەدەر بوو کەسێکی سوورێژەی گرتبا دەیانهێنا پەڕۆی سووریان پێدا دەدا تا زووە دەری بنێ، دەنا خورما و شیرینییان دەدایە.

**یەکی دیکە لەو دەردانە کە ئێستاش ماوە بالۆکەیە:** ئەوە گەورەش دەیگرێ کە دەڵێن کەسێک پێی لە بۆق یا جێ‌پێی بۆق بنێ یان شتی پیس بخوا یا دڵی هەڵەنگوێ بالۆکە دەردەکا. بالۆکە ئێشی کەمە بەڵام بڵند دەبێ و جاری وایە سەرەکەی ڕەش هەڵدەگەڕێ ناحەزە، بۆ چارەکەی دەچن دۆعای بۆ دەنووسن پێی‌دەڵێن بڕین. دەنا لە شاخەکانی کوێستان جۆرە دارێکی لێ هەیە پێی‌دەڵێن «تیرو» گەڵاکەی شینە و قەدەکەی سپییە زۆر گەورە نییە بە قەت دارەبن یا شیلان یا بەڵاڵووکە کێویلە دەبێ. دەبێ کەسێک بچێ پلێکی لێ بادا. بەڵام دەبێ ئەو کەسە نە قسە بکا و نە ئاوڕ بداتەوە، بگەڕێتەوە. ئیتر ئەگەر ئەو دارە ویشک بوو ئەو بالۆکەیە هەڵدەوەرێ و چاک دەبێتەوە.

**ترسان:** ئەوەیە دۆعای بۆ دەنووسن، نۆبەتەی بۆ دەبڕن، دەنا سەیدێک یا پیاوچاکێک پیوازێکی بۆ دەجاوێ و لە نێوچاوانی دەساوێ. ئەوە دەردی منداڵی قەدیم بوو بێجگە لەوانە فێی دەگرت، گەشکەی دەگرت. بەڵام ئێستا بە هۆی بوونی دوکتور و دەرمان پێشکەوتن و زانین ئەوانە یا نەماون یا زۆرکەمن، مەگەر لە دێهاتی دووردەست.

## گوێزەبانە



**«ئاریسا لە دایکبووی ١٣٨٩ هەتاوی، مهاباد»**

**ئەوکات خەڵک** زۆری حەول دەدا منداڵی ببێ و بە وەجاغکوێری نەمرێ، چونکە منداڵی ئەوکات هۆی پشتگری دایک و باب بوو کاری بۆ دەکردن، نانی بۆ پەیدا دەکردن لە ماڵێدا دە منداڵت بایە بێکار نەدەبوون بەرغەل، گوێرەگەل، گێرە، جەنجەڕ، گا لەوەڕێن، باقەبەستن، باقەکێشانەوە، باقەبێن بادان، دانگە، وڵاغ ئاودان، سەوەتە داگرتنەوە و تەویلە ماڵین و ئاخوڕ ماڵینەوە، وڵاغ گەسکدان و گوێدرێژ جل کردن،

ڕنەک کردن و جارجار ئەستێر گرتنەوە و بژار و پاراو و زۆری دیکە کاری منداڵ بوو و جا کەسێک کە خێزانی حامیلە دەبوو دڵی خۆش بوو و ئەگەر خێزانی لە منداڵەکە دەبۆوە خەبەریان پێ دەدا، کوڕتان بوو، دیارە هێندێک فەرقی کچ و کوڕی نەدەکرد، بەڵام بە داخەوە هێندێک فەرقیان دەخست لە گوێزەبانە و نێونانیشدا دەگەڵ ئەوەش کچ بۆ دایک و باب زەحمەتکێشتر و بە ڕوحمترە؛ کە خەبەریان دەدا مژدانە یا مزگێنیان دەدا بەو کەسەی خەبەرەکەی داوەتێ، جا لە تمەنێکەوە دەیان دا تا مەڕێک یا زیاتر، چاوەڕێ دەبوون تا حەوتووی بچێ ئیتر کە حەوتوو دەهات، دیارە ئەوە سوونەتێکی دینییە کە حەوتووی دەچوو، دەبوو پاک سەری بتاشن و تووکی سەری هەڵکێشن بە زێڕ و زێڕەکەشی بۆ بکەن بە سەدەقە، ئەو سەرتاشینە بۆ منداڵ زۆر قازانجی بوو، هەمووی تووکی سەری زۆر ڕێک و پێک دەهاتەوە، دووهەم کرێژ و ناحەزی سەریشی لا دەچوو. ئەو حەوتووی ئێستای منداڵ هەر لەو سوونەتەی پێغەمبەرەوە(س) هاتووە کە حەوتووی بۆ دەگرن، ئەگەر حەوتووی دەچوو، دەچوون حەیوانێکی قەڵەوی چاکیان بۆ سەر دەبڕی دەیانکردە خێر بە نێوی **گوێزەبانە**. دیارە با گوێزەبانە بزانین: گوێزەبانە گوێ و زمانە. ئەویش ئاوایە منداڵ کە لە



دایک دەبێ تا سەری حەوتووی دیاری دەدا کە دەست و لاق و قامک و چاو و چەنە هەمووی ئەوانەی ساغە، دەمێنێتەوە گوێ و زمانی کە مەعلووم نابێ ساغن یان نا، ئەویش کە گوێزەبانەی بۆ دەکەن خێر و سەدەقەیە بۆ ئەوەیە گوێ و زمانی ساغ و سلامەت بێ، بۆیە پێی‌دەڵێن گوێزەبانە یانی «گوێ و زمان». جا دێنن خەڵکو مامۆستای ئایینی بانگ دەکەن، منداڵەکە دەکەنە مەلۆتکە، ٧ نێویان بۆ دیاری دەکرد زیاتر دایک و نەنک و باپیر ئەو نێوانەیان هەڵدەبژارد. نێوەکانیان دوای نووسین لەسەر کوتە کاغەز لە کڵاوێک یا جامێکیان دەخست. ئەوکاتیش زۆرتر ئەو نێوانەیان دەکوت لە باری دینییەوە پیرۆز بوو وەکوو محەممەد، عەبدولڕەحمان، عەبدوڵڵا دەیان نارده کن دایکی منداڵەکە کە ئەویش دەستی دەبرد نێوێکی دەردێنا بێ ئەوەی بزانێ چییە کە نێوەکە دەهات یانی ٧ کاغەزی لوولەکراو بوو و ٧ نێوی لێ نووسرابوو دەستی دەبرد نێوێکی دێنا دەرێ ئیتر هەرچی با نێویان دەنا ئەوە. ئەوجار مامۆستای ئایینی یان یەکێکی بانگ و قامەتزان و ڕەوان بێ، منداڵەکەیان دەپێچاوە و دەیان نارده



**«لانکە و دەسرازە و گوڵینگە»**

مەجلیسەکە، بانگیان بە گوێی ڕاستیدا دەدا و قامەتیش بە گوێی چەپیدا، دواتر بە نێوە دیاریکراوەکە بانگی دەکرد و هەموو وێکڕا دەیانکوت: نێودێر بێ و بە دایک و باب گەورە بێ، ببێتە داری بەری. ئیتر بە ڕادەیەکی زۆر کەم لێوی منداڵەکەیان بە شەکر یا خورما یا قەند شیرین دەکرد ئەبەوەیان دەکوت: **«نێونانی منداڵ»**.

# گوێ پڕووسقێنە



**یەکی دیکە** لەو فەرهەنگە گشتییانەی ڕابردوو گوێ پڕووسکێنە یا گوێ پرووسقێنە یان گوێ پڕووکێنە. ئەوەش قومارێک بوو زۆرتر بە منداڵ دەکرا بۆ دڵخۆشی و سەرگەرمی منداڵ چەند نەفەر کۆ دەبوونەوە بانگی منداڵانیان دەکرد وەرن



« هەڵاتنی منداڵەکان بۆ گوێپڕوسقێنە»

گوێ پڕووسقێنە دەکەین، ئەویش ئاوا بوو یەکێک لەو پیاوانە دوو قڕان یا تمەنێکی فڕێ دەدا دەیکوت هەر کەس هەڵیگرێتەوە دەست لە من دا پووڵەکە بۆخۆی. دیارە منداڵ دەکەوتنە سەری هەڵیان دەگرتەوە یەک نەفەر هەڵی دەگرت ئەوەی دیکە دەکەوتنە سەر ئەو منداڵە کە پووڵەکەی پێیە گوێیان دەکێشا هێندەیان گوێ دەکێشا هەمووی سوور دەبووە جا یا تەحەمولی دەکرد و بە هەر جۆر با دەگەیشتە کابرای سێحەبپووڵ و دەستی لێدەدا و پووڵەکە دەبووە ئیخۆی دەیکوت لە خۆم گاتەوە، دەنا جاری وا بوو ئەوەندەیان گوێ دەکێشا لە تاوان پووڵەکەی فڕێ دەدا بۆیە دەڵێن گوێ پرووکێنە یا پرووسقێنە. یانی گوێیان ئەوەندە دەکێشا وەک سوتاو هەڵدەپڕووکا یان گوێیان هەڵ دەپرووسقاند(هەر دووک مەعنا دەدا هەڵپرووسقاندن یا هەڵپرووکاندن) ئەوجار ئەوەی دیکەش هەر وا ئەگەر زوو نەگەیشتبا کابرای سێحەب پووڵ هیلاکیان دەکرد ئەوجار پووڵی دیکەی بۆ داویشتن ئەویش هەر وا دەکەوتنە سەر پووڵەکە هەڵیان دەگرتەوە بە گوێکێشان خۆی دەگەیاندە کابرای پووڵ دەستی لێدەدا ئیتر پووڵەکە دەبووە ئی خۆی.

## لباد یا نمەد سوونەوە



**یەکی دیکە** لەو ئاسار و فەرهەنگە قەدیمانە لباد سوونەوە بوو دیارە لباد نمەدیشیان پێ دەکوت. لباد لە بەرگن کە تووکی کاوڕە یان خوری کاوڕ و بەرخی یەکساڵەیە ساز دەبێ. دێنن لە هاویندا بەرخەکە دەشۆن لە چۆمێکدا کە گۆمی هەبێ دوای چەند ڕۆژ کە ویشک بووە دێنن چەند نەفەر بەنێوی برینگبڕ بەرغەلەکە دەبڕنەوە هەڵی دەگرن تا پاییزێ ئەوجار وەستای لباد دێ کە **پێیدەڵێن هەلاج**. هەلاج دێنن، بەرگنەکە لێک بڵاو دەکا بە کوتک و کەوان بەوە **دەڵێن شی کردنەوە** یان هەلاجی کردن. دوای شی کردنەوە با بە کەوان کردنی بەرگن خەریکی لباد دەبن کە پێی دەڵێن لباد **ڕاخستن**. لباد چەند جۆری هەیە **یەک لاکێشە** کە ئەویش لە ١٦ کیلۆ بەرگن دروست دەبێ هەلاج دێنێ ٢٠ میتری خام بۆ ڕادەخا بەوە دەڵێ کارخانە؛ لەسەر ئەو کارخانەیە بەرگنەکە بڵاو دەکەنەوە بە شتێک کە وەک شەنە وایە و شەش دەنکە

ڕێک و پێکی دەخەن، ئەگەر تەختەکەی سوور بێ گوڵی ڕەش و سپی و سووری تێداوێ بە گوریس توند دەیپێچن دواتر دەست بە شێلانی دەکەن بە ٤ نەفەر، لبادێکی ئاوا ١٢ نەفەری دەوێ تا نۆبە بکەن و زۆر ماندوو نەبن، بە ماوەی ١٠ ساعەت ئەوە تەواو دەبێ کە پێی‌دەڵێن هاتۆتە دەرێ یانی تەواو بووە دووهەم لبادە ئەویش لە ٨ کیلۆ بەرگن دروست دەبوو؛ ئەویش هەر بەو شێوەیە بوو ئەو حاجەتانەی لە بەرگن ساز دەکرێ



ئەوانەن: ١. لباد ٢. کەپەنک یا قاپوت ٣. کوڵەباڵ، قەرەنجی ٤. نەرمەزین، وڵاغی سواری ٥. بەرجەلی یەستر ٦. کڵاوی نمەدی.

**قازانج و سوودەکانی لباد:** ئەوەیە تەرەشوعی نییە، کەسێک بتوانێ لباد لە چۆکی یا جێگایەکی کە دێشێ ڕۆماتیسمی هەیە لێی بنێ چاکی دەکا. ئاو دانادا ئەوە نییە شوان بە شەوی بارانی بەهاری مادام کەپەنکی لەبەردا بێ نە تەڕ دەبێ نە سەرمای دەبێ قومارەکانی کە لە کاتی لباد سوونەوەدا دەیان کرد: ١. جۆرابێن ٢. گورزێن ٣. خووگە ملە ٤. نیوەپیاو ٥. کەوشێن ٦. هەڵپەڕین کە لاکێش تەواو دەبوو لە خۆشیان هەڵدەپەڕین ٧. فەنای بێدەنگ ٨. پشکیلان.

ئەوەش قوماری و شۆخیەکانی دەوری لباد سوونەوە بوون.



**ئەوەش شیعری لبادە ئی مامۆستا ئاچاکە:**

«کەپەنک لە پشت کەپەنک لە پشت
کەپکێکی بە کوتەک کوشت»

ئەوەش کەپەنک و لباد.

# جۆلا



**««جۆلا لە حاڵی جاجم تەنیندا»**

لە ڕابردوودا بە هۆی پاراستنو ڕاگرتنی فەرهەنگ و کلتووری ناوخۆ و نەبوونی پارچە و لیباسی لاوە بە شێوەی ئەمڕۆیی خەڵک زۆرتر بۆ لیباسی بەری پێخەف و بە خۆدادەر و ڕاخەر و ژێرڕاخەر هەر لە کەرەسەی ناوچەیی خۆماڵی کەڵکیان وەرگرتووە بۆ لەبەر کردن و سەفەر، لە ڕانک و چۆغە و بۆ ڕاخستن لە لباد و بەڕە و حەسیری گرێچن بۆ بە خۆدادان لە جاجم و لێفەی جاجم یان لێفەی کورسی کە ئەو کەمێک گەورەتر بوو و بۆ نوێژ کردن لە بەرماڵ کەڵکیان وەر دەگرت دیارە ئەوانەشیان هەر لە خوری و مەرەز و کورک و موو ساز دەکرد گۆرەویی بەن، پۆزلووخ، زەنگاڵ، گۆرەویی یەکشیشە کە ئەویش پۆزەوانەی پێدەڵێن سەر کڵاوە، کراسی بەن یا بڵوز، دەستکێش، جا

پێنج قامکەیان هەبوو و دوو قامکەشیان هەبوو شاڵگەردن یان گەرمە ملە، سوود و کەڵکیان لەوانە وەردەگرت بۆ دروست کردنی زۆرێک لەوانە ئافرەت بوو بۆ بڕێکیش جۆلا بوو. جۆلا چەند شتی لەوانە دروست دەکرد کە پێیان دەکوت:«دەیتەنیَ». ١. بووزوو کە دەبێتە ڕانک و چۆغە ٢. جاجم کە دەیان کرد بە لێفە و لێفە کورسیش و نۆنیشیان تیَدەخست ٣. بەرماڵ کە نوێژیان لەسەر دەکرد و بۆ جوانیش دایاندەنا ٤. پۆپەشیمن ئەویش تەنک بوو بە خۆیاندا دەدا بۆ خەوتنی هاوینان.



**«قوڵەباڵ و بووزوو»**

**یەک** بووزوو لە مەرەز دروست دەبیَ ئەویش بە پشتی بزنە مەرەزەوەیە. دیارە لە خوریش دروستیان دەکرد بەڵام پەسند نەبوو. ڕانک و چۆغە ئەو ڕەنگانەی بوو: ١. سوور گوێز ٢. نەباتی ٣. ڕەش ٤. سپات ٥. شینکی ٦. سپی سادە. ٧. گرژاڵی. کاتێک بزن وەختی بڕینەوەی دەهات دەبیَ ئەوە بڵێن کە بزنەمەرەز زووتر دەبڕدراوە لە

مەڕ و لە بزنەموو. دەهاتن مەرەزەکەیان لێک بڵاو دەکرد بەوەیان دەکوت شیوکردنەوە ئیتر ژنی لێزان دەهاتن بە شانەیان دەکرد شانە تەختەدارێکە نزیکەی ٥٠ دەنکی ئاسنی نووکتیژ تێدایە بە تایبەتی سازی دەکەن مەرەزەکە یا خورییەکە بەوەدا دەدەن پووشوپەڵاش و نووسەنەکە و هەرچی پێوەی بێ وەلای دەخا بەوە دەڵێن **بنشانە**. ئەوەی جوانیشە و خاوێنە پێیدەڵێن **سەرشانە**. دوایی بە شانە کردن دەیکەنە گولۆڵە، دوای گلۆڵە بەوە دەڵێن **هەڵویزن**. دوای ئەوە دەبێ بیدەن بە ژنێکی زۆر وارید لە تەشی ڕستن بیڕێسێ زۆر باریک و ڕێک و پێک، دوای ڕستن دەیکەنە تۆپ بەوەش دەڵێن گولۆڵە. دوای گولۆڵە دێنن داری دوو پەلی بۆ دەچەقێنن، نزیکەی ١٢ داری بۆ دادەنێن تا ٢٥ میتر درێژ بێ لەو سەرە و سەری دارەکان جامێک سرێش دەگرنەوە بووزووەکەی تێهەڵدەکێشن تا بە دەق بێ. ئەبەو کارە **دەڵێن بوزونانەوە**. بۆیە کەسێک کە زۆر دێت و دەچێ پێیدەڵێن ئەوە چیتە کاکە دەڵێی بووزووت ناوەتەوە. دوای تەواو بوونی نانەوە دیارە دەبێ ئەوە بڵێن لەبەینی هەر پێنج سنگ »دار« کە بۆ بووزوونانەوە دەیانکوتاوە شتێکی تێهەڵدەکێشن بۆ ئەوەی لێک نەهاڵێ و تێکەڵ نەبێ بەوە دەڵێن بەستە.



**«کەڵاش و قوڵەباڵ و ڕانکوچۆغەی هەورامان، تۆفیقی ڕەزەوی»**

دواتـر هــەڵی دەکــەن، دوای نانــەوە و ویشــک بوونــەوە لــە قــۆڵی دەهاڵێنن بەوەش دەڵێن **بازنە یان قانگڵە**، دەبێتە تۆپ. ئـەوجـار دەیبـەن بۆ لای جۆڵا جۆلاش گرێی دەدا بەستەگی بە پانی و بەرتەسکیە، ٥٠٠- ٦٠٠ گرێ دەخوا ئەوجار جۆڵا وەسەر کاری دەخا و ئەگـەر لێی بەکار بێ بـە دوو یـا سـێ ڕۆژ تـەواوی دەکـا دیـارە درێـژی بـووزو لـە ٢٠ میترەوە تا ٢٥ میتر هەیە دوای دروست کردنی«تەنینی پێدەڵێن». دێنن لە کۆلی دەدەن کۆلیش ئەوەیە دوو ئاسنی پان و درێژی نزیکـەی یـەک میتر لە ئاوردا زۆر داغ و سوور دەبێتـەوە دێنن دوو تـەختـە داری پان بە ئەندازەی ئاسنەکە یان کارتۆن لەبەین ئاسن و بووزووەکە دەخەن تا بووزووەکە نـەسووتێ ماوەی ٣ سـەعاتێک لـەو کۆلـەدا دەبێ ئـەبـەوە دەڵـێن **«کـۆل»** ئیتـر دەبێتــەوە بـووزوو- و ئامادەیـە بـۆ کـن خــەیات بیدروێ. خەیاتیش دەیدروێ و دەبێتـە **ڕانک و چۆغـە** لـەو کارانـەی کـە جۆڵا دیتەنێ کەرەسـە (حاجـەت) جاجمـە، جاجم لـە خـوری مـەڕی سـاز

دەکرێ مەڕ لە ئاخر مانگی بەهارێ کە دەوڵەمەند پێدەڵێن «باران بڕان» بە برینگ دەیبڕنەوە بەو کابرا دەڵێن **برینگبڕ** بە ئاسنەکەش دەڵێن **برینگ**. کاتێک بڕییانەوە، دیارە خوری مەڕی زۆر شتی دیکەی لێ دروست دەکرێ یەکێک لەوانە جاجمە خوری لە دوای بڕینەوە بە شانەی دەکەن هەڵیدەوێژن دواتر دەیڕێسن دوای ڕستن دوو لای دەکەنەوە، بووزوو دوولا کردنەوەی نییە، دواتر دەیبەن بۆ کن خمگەر «ڕەنگ ڕێژ» ڕەنگی دەکەن ئەوجار دەیبەن بۆ کن جۆلا تا بیکا بە جاجم جۆلاش دێنێ گرێی دەدا. گرێ دان جۆرێک قایم کردن و پێوە بەستنە بۆ دروست کردن. جاجمێک هەزار گرێ دەخوا. بەرماڵێک هەزار و دوو سەد گرێ دەخوا ڕانک و چۆغە ٥٠٠-٦٠٠ گرێ دەخوا یانی گرێی لێدەدەن جاجم لە زۆر قەدیمدا هەشت تەختە بوو دواتر بوو بە چوار تەختە ئێستا دوو تەختەیە.

٣. **یەکێکیتر لەو کەرەسانە بەرماڵە؛** دیارە بەرماڵی زوو دوو تەختە بوو بەڵام ئێستا یەک تەختەیە ئەویش هەر لە خوری مەڕی ساز دەکرێ جاری واش بووە لە مەرەزیش ساز کراوە دیارە بەرماڵی مەرەز زۆر جوان و چاکترە.

٤. یەکێکیتر لەو شتانەی کە جۆلا دەیتەنێ پۆپەشمین بوو؛ پۆپەشمین لە خوری ساز دەکرا زۆر باریک دەڕێسرا زۆر تەنک دروست دەکرا نێونێویش ئاوریشمی تێ هەڵدەکێشرا بۆ جوانی، بەوەیان دەکوت ئاوریشمچنە بەڵام پۆپەشمین بە قەت جاجم گەورە نەبوو دیارە لە بەرماڵیش گەورەتر بوو ئەوانە کر یا کار یا ئەو کەرەسانە بوون کە

جۆلا دەیکردن دیارە هەمووی ئەوانە دەبێ بندرێنەوە کە پێی‌دەڵێن **ڕایەڵ کردن**. جا یان ساحەب ماڵ بە ژنی لێزان ئەو کارە دەکا یان جۆلا بۆخۆی دەیکا.

ئەوجار دێتە سەر کەرەسەکانی جۆلا یان جۆلایی:

١. **لا لەنگەرە**: ئەوەیە لەنگری دەفەکە دەگرێ و هاتوچۆی پێدەکا

٢. **پردەڵە:** ئەویش ئەوەیە بەنی بووزوو یا جاجمەکە بە سەریدا دێتو دەچێ و ڕاست ڕایدەگرێ.

٣. **مۆلەقە**: ئەویش ئەوەیە بووزووەکە یان بەنەکە ڕاست ڕاگرێ نەیەڵێ بهالۆزێ، لازم بە وەبیر هێنانەوە بە هەمووی دەنکی ئەو کارانە یا کەرەسانە دەکوترێ



**«بەرماڵ کە جۆلا دروستی دەکا»**

تاڵ، بەن، هەودا، هەمووی ئەوانەی پێ دەکوترێ؛ مامۆستا نالی سەبارەت بە کەرەسەی جۆلایی لە شیعرێکدا ئاوهەڵدێر ئاوا تەعریف دەکا:

ڕاییڵ و تار و پۆی کولووی بەفرە ئابشار با بایدات و ماسی پیا دێ وەکوو مەکووک

٤. **دەف**: دەفی جۆلا یان ژێردەف ئەویش ئەوەیە کاتێک جۆلا دەیتەنێ جار دەگەڵ جارێ هەوداکە توند و قایم دەکا بەو پێدادانەش دەڵێن پێدادانی **شەپیتە**.

٥. **گوێ دەفە:** ئەویش ئەوەیە دەچێتە بەینی دەف و ژێردەف شەوگوردەکە توند دەکا کە کاری ئەسڵی ئەو دەیکا؛ ڕایدەگرێ لە یەک میزاندا نایەڵێ جاجم خراپ و خوار بێ.

٦. **شەوگورد:** ئەوەیە کە ئەو بەرماڵ، جاجم یا بووزوی لەسەر گرێ دەدەن.

٧. **چولەکە**: ئەوەیە دەفەکەی ڕاگرتووە بە حەواوە چولەکە دوو داری چکۆلەن کە دەفەکە بە بەنێک بەوانەوە هەڵاوەسراوە.

٨. **پێتەتە**: ئەویش ئەوەیە کە لە شەوگوردی قایم دەکەن لە بن لاقی جۆلا بازی پێ دەکا دەم دەکاتەوە تا مەکوکە بەوێدا هاتو چۆ بکا و بە دەست ئەولا و وئەولای پێدەکا.

٩.**مەکوک:** دارێکی چکۆلەیە جوان و لە دەستان خۆشە لە بن ڕیسی جاجمەکەدایە لەبەینی پێتەتەدا هاتوچۆ دەکا.

١٠. **خەرەک**: ئەویش ئەوەیە بەنەکەی لەسەر هەڵدەکا؛ خەرەک چەند لوولەی تایبەتییە لەبەر دەستی جۆلادا جۆلا ئەوبەر و ئەوبەری پێدەکا بۆ چنینی جاجم.

١١. **کاسەلوولە**: ئەویش حاجەتێکی کەمێک قوڵە ئەو لوولانەی کە هەڵی دەکەنەوە یانی بەنی لێ دەهاڵێنن بۆ بەردەستی جۆلا تا کار پەکی نەکەوێ لەو کاسە لوولەیەی دەخەن تا لێی نزیک و لەبەر دەستیدا بێ.

١٢. **بەرەژەنە:** ئەویش دوو تەختەدارن کە یەک میتر درێژن بە قەت چوار قامکیش پانن لەبەین دوو تیکە یا بەرەکەی جاجمی دەخەن کە جۆلا خەریکی تەنینێتی تا ئەو دوو بەرە وێک نەیەتەوە. بەلام بووزوو یان ڕانک و چۆغە ئەوەی نییە.

١٣. **تاپان**: ئەویش ئەوەیە کە لە سەرەوەی جاجمەکەیە جاجم بەسەر ئەودا دێت و دەچێ هەموو کەڕەتێ دێتەوە خوارێ بەردەستی جۆلا تا دووبارە ڕەد دەبێتەوە دەڕواتەوە سەر تاپان.

١٤. **پێداڵ**: ئەویش ئەوەیە بە لاق جۆلا دەیهێنێ و دەیبا جۆلا بازی پێدەکا هاتوچۆی کەرەسەکانی دیکە بەو پێداڵە دەبزوێ.

١٥. **قەرغوو**: ئەویش باریک لە قامیش دروست دەکرێ دەیتەنن بۆ شەوگورد یان دەوێ.

**١٦. پێچاڵ:** پێچاڵیش قولکێکە لە بن لاقی جۆلادا

١٧. **گوردەکەش**: ئەویش لەسەر دارێک هەڵیدەبەستن کە پێدەڵێن ساچین بۆ هێنان و بردنی بەنەکە کۆمەک دەکا و هێزیش دەدا بە تاپان ئەوە بوو جۆلا و ئەو کەرەسانەی جۆلا دەیتەنێ و کارخانە و دەستگای جۆلا. لازم بە وەبیر هێنانەوەیە ئەو نێوانە ئیستلاحی ناوچەی موکریانی مەهاباد - بۆکانن شایەد لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان بە نێوی دیکە نێودێر بن بەلام هەرچی بێ فەرهەنگێکی ڕەسەنی کوردییە.

# جاو

لـه ڕابـردوودا هـەر وەک زۆر کاروبـار و خـواردەمـەنـی کـە خـەڵک بۆخۆی پێکی دێنا، هەرواش لیباس و داپۆشەر و پێخەف و ژێرڕاخەر و ئـەوانـە لـە وڵاتـدا دروسـت دەکـرا و ژنـان و پیـاوان پێکـەوە دروسـتیان دەکـرد وەکـوو: بـووزوو، جـاجم، بـەرمـاڵ، پۆپـەشـمین، مـافوورە، بـەڕە، حەسیر، حەسیری گرێچین، حـەسیری خورمـایی، لباد و زۆری دیکـە. جا مەبەسـتی ئێمـە جاوە ئـەویش وەکوو ئـەو کـەرەسـانەی دیکـە جۆڵا دەیتەنی کە پێی دەڵێن **تـەنـین.** جـاو لـە لۆکـە دروسـت دەکـرێ، لۆکـەش وەکوو گەنمە شانی، هـەرزن، دێمیلـە، داڕووجـان، چـەڵتووک، زرحـات و بێسـتان و تـەڕەکـاری بـەهـاران دایانـدەچاند. بـەڵام دەبوو لـەبـەر ئـاو و ئەستێر بێ. بۆیە پێی دەڵێن لۆکەی کانیاو؛ ئەویش بە دانو تۆو بوو کـە پێیـان دەکوت **دانپـەمـۆ** یـا **تـۆوی پـەمـۆ.** ئـەگـەر زۆریـان ئـاو دابـا زۆر هەڵدەسـتا زووش دەگـەیی، کـاتی گـەیشـتن چـاوەکـەی دەمـی دەکـردەوە بەوەیان دەکوت دەمی کردۆتەوە، **پشکوتووە یا قوڵاغەی** داوە. ناشتایان وێ دەکەوتن ئەوەی سپی هەڵگەڕابا لێیان دەکردەوە بەوەشیان دەکوت **چنین** یا **دەیچنن.** کاتێک زۆر دەبوو وەسـەر یەکیان دەخست ئەوجار لە دەستگایەکیان دەدا بەنێوی چیکەنە ئەوە لێکی بڵاو دەکـرد دانـەکـەی لـە

لۆکەکەی لێک جودا دەکردەوە بەوەشیان دەکوت شیو کردنەوە دەبووە دوو بەش: **تۆوەکەی و لۆکەکە**. ئیتر لۆکەکەیان وەکوو خوری دەڕست، وەکوو بووزوو لەسەر یەکیان هەڵدەکێشا بەوەشیان دەکوت **ڕایەڵ و نانەوە**. دیارە جاو زۆرتر بۆ کراس و دەرپێ دەبوو دەیانبردە کن جۆلا وەکوو جاجم و بووزوو دەیناوە دروستی دەکرد. بەوەشیان دەکوت تەنین؛ دوای تەنین دەیان کردە کراس و دەرپێی پیاوان، کراسی ئاودامێنی منداڵان یا بۆ خەڵاتی مردووشیان بە کار دێنا. لازمە ئەوە بزانین جاو وەکوو جاجم لە کن خمگەر ڕەنگ دەکرا چونکە لیباس نەبوو بۆ سەر شایی و زەماوەند لەبەریان دەکرد. ئەوە نییە دەگێڕنەوە دەڵێن زەماوەند بوو کچی کابرایەکی فەقیر هیچ نابێ لەبەری کا بابی پێیدەڵێ ڕۆڵە جاوم بۆ لە کن جۆلا داناوی زوو بۆت دروست بکا و بچۆ بۆ سەر شایی کچە دەچێ بۆ لای جۆلا هەڵی دەپێچێ کە زوو بۆی دروست کا و شاییەکەی لە کیس نەچێ. ڕوو لە جۆلا دەکا و **دەڵێ: «مامە جۆلا چاوەکەم/ بۆم دروست کە جاوەکەم/ با چاوێک لە یارم کەم»**. یان دەڵێن شێخ ئەحمەدی کۆر جاوی دەبێ دەیبا بۆ کن ڕەنگڕێز لە مەهاباد یان دەڵێن لە تبتی سەر ڕێگای سەقز و بۆکان. بۆوە چەند گەز جاوی دەبێ و دەیبا بۆ ئەوێ ڕەنگی بکا کابرای خمگەر نێوی ئیسحاق دەبێ و فێڵی لێ دەکا لە باتی ئەوەی جاوەکەی بۆ لە خم دا فریوی دەدا بۆی لە ئاو هەڵدەکێشێ و تەڕی دەکا و دەیداتەوە دەستی. شێخ ئەحمەدی کۆر کە بۆن بە جاوەکەوە دەکات بۆنی خمی لێ نایە ئیتر شێخ ئەحمەد تووڕە دەبێ و ڕوو لە ئیسحاق دەکا **و دەڵێ:**

**«چاوت بە چاوی من بێ/ گوێچکەت لێ سەرەوبن بێ/ جێگەو و ماڵت قوژبن بێ/ ڕزقی ماڵت هەرزن بێ/ بۆ دەخۆی دراوی من/ شینی ناکەی چاوی من»**. ئەوە شێوەی دروست کردنی جاو لە ڕابردوودا.

## ڕاو



ڕاو ڕاهێنانی دەست و قۆڵو لەشە بۆ چیا و بەندەن و ماندوو بوون و ڕۆیشتن و وریا بوون و بەڵەدی و نەترسانە لە شاخوداخ و لە چڕ و چیا و لە دڕندە و جانەوەر ڕاهاتن و ڕاهێنانە بۆ بڵیندی و نەوی و نزار و لێڕەوار و هەڵاتن و دواکەوتن بۆ ئامانج. دێنن چڕ و چیا و لێژ و لۆژ و سروشت و کون و کانی و هەڵدێر و لادێر و کەوتن بەسەر تاوێر و چوختی و پوختی و ناسینی پەلەوەر و باڵدار و بێ باڵ وەکوو دەڕندە و باڵندە، دووره چۆم و نێو چۆم. دوور کەوتنەوە لە دونیای پڕ غەم و سەر بە تەم و مات و بێ پیت تێکەڵ دەگەڵ سەحرا و دەریا و دۆڵ و دەڵ و خڕ و گرد و لەند و بەند و چەپڵە و تەقڵە و هات و هۆتە و هانیە و بێنە و هەڵات گرتی و بردی ڕاوچی دەگەڵ ئەو عەیش و نۆشە تێکەڵ دەبێ و لێکدالێ، بۆیە زۆرتر لە نیش و ئێش بە

دووره دونیایەک دوور لە گێرە و کێشە دەکا، ڕاوچی ڕاو بە بەشێک لە ژیانی بەربەرەکانی غیرەت و هەڵوێست دادەنێ ڕاوچی لێزان و پێزان شاخەوانە، مەلەوانە، تفەنگوانە و ڕێڕەوی شەوڕەوانە. هەر بۆیە ڕاوچی نەترسە و نەبەزە و لە بەرابەر هەر ڕووداوێکی ڕۆژگار بە هەلوێست زوو لێ ناچێ و تێک ناچێ. ڕاوچی لە واقەی ڕێوی، پشمەی ورچ، لوورەی گورگ ناترسێ. ڕاوچی ڕەوتی کەوتی دەرپەڕین و ڕاپەڕینی جانەوەر دەناسێ، پێی دڵخۆشە، ڕاوچی خودناسە، کات ناسە،شەوناسە، کات و سات ساڵ و مانگ و ڕۆژی لێ تێکناچێ.



**«کەو لە قەفەسدا»**

ڕاوچی خوڕەی ئەستێر، خرمەی تاوێر، جێگای هەڵدێر باش دەناسێ، ڕاوچی بێخەوی، توندڕەوی، شەوڕەویی بۆ بیستنی دەنگی پەلەوەر بە تایبەت قاسپەی کەو و هەلی شەوێی پێخۆشە. ڕاوچی لەشی ساغە، بەدماغە بۆ هەر ڕووداوێک ناخەجڵێ، گوێ قولاغە.

# ڕاوەکەو

**ڕاو بە چــی دەکـرێ؟** بـە سـواری، بـە پێیـان، بـە تـاپڕ، بـە تـۆڕ، بـە داو،بە دێوجامە، دێوە سەرە، شەوارە، چرا، بە دەستی.

**نێچیری ڕاو چــەنـدن:** ئاسـکی کێوی، بزنـەکێوی، ماسـی، چێرگ، هـەوێـردە، کوڕکوڕ، کـەروێشـک، بانبانـک، چوالـوو، سـەگـڵاوەک، کـۆتر، قاژوو، کەو، زڕەکەو، ئامانجی ئێمە ڕاوی کەوە.

هـەمـوو جانـەوەر و پـەلـەوەرێـک کـە دەسـتکاری خودایـە، جوانـە و دەگەڵ سروشت گەورە بووە و تەبیعەت دەڕەنگێنێ و هـۆی ڕازانـەوەی دیمەن و سەحرا و چۆم و ڕووبارە. ئەگەر ئەوانە نەبن هـەرێمی دەریا یـا ویشـکایی وەک کـاول وایـە و دڵ پێـی ناپشـکوێ. جـا یـەکێـک لـەو باڵندانەی دیمەن دەڕەنگێنێ و خودا جوانیی زۆری بەوی داوە، کەوە.

کەو باڵندەیەکی دەنگ خۆش و ڕەنگ و ڕوو جوانە و خـەت و خـاڵ لە ملە، بۆ کـەس نـامۆ نییـە بـە هـەمـوو جۆر ڕادەگیرێ و پـەروەردە و حیمایەت دەکرێ. باڵندەیەکی بێبۆن و لـە هـەمـوو ناوچـەکانی ئێران و کوردسـتاندا هـەیـە و بـە تایبـەت لـە کوێسـتان و ناوچـە شـاخاویەکانـدا

زۆره. کـەو هـەمـوو دان وگیایـەک دەخـوا بـەڵام وەک دەڵـێن هـەڵز و کوڕادە و نێرکی بیزای پێ لە هەموو دانێک خۆشترە.

**کەو دوو بەشـە:** خاسـەکـەو و زڕەکـەو. کـەوی خاسـە نێرەکـەوی هەیـە، ماکـەو، بـارەکـەو، کـەوی‌شـەڕێ، کوللـەداشـی، کـەوی ماڵی،کـەوی ڕاوێ،کەوی دەستباز. کەو کاتێک ڕاوچی لێی دەدا یان بریندار دەبێ، دەچێ لـە دارەبـەن بنێشـتەتـال هـەڵ دەوەرێنـێ لـە برینـەکـەی دەدا چـاک دەبێتـەوە. کـەو زۆر هێلکـە دەکـا، کاتێک کورک دەبێ خۆ لـە نێرەکـەی دەشارێتەوە جا لەسـەر هێلکە دەکەوێ کـەو کاتێک داوی بۆ دەنێنـەوە، ڕاوچی بیبینێ دەسڵەمێتەوە و دەڵە دەبێ و ناچێتـەوە ئـەو جێگایـە. کـەو ئـەگـەر بزانـێ کـەسـێک دەسـتی لـە هێلانـەکـەی داوە تـەوەلا دەبـێ و ناچێتەوە سەریان و دەڕوا.

**نێرەکەو:** زۆر غرورە، زەلامترە، سەری گەورەیە، زۆرتر بۆ ڕاوە.

**ماکـەو:** چکۆلەیـە و لـە کـاتی مێـرۆژدا ڕاویـش دەکـا هێلکـە دەکـا وکورکیش دەبێ و بەچکەکە بەخێو دەکا.

**کـەوەتـۆڕ:** ئەوەیە لە ڕاوی سیاسووت یان لـە ڕاوی نێرەکـەوی بەهارێ دادەگیرێ، لە قەفەسی دەکـەن ئـەوە تۆڕە. جاری وایـە ڕاویـش دەکا، دەخوێنێ و شـەڕیش دەکا.

**کەوی کوللەداشی:** ئەوەیە کە بە بەچکەیی لەسەر کانی یا لە جێگای دیکە دەگیرێ، بەخێوی دەکەن و گەورە دەبێ و چاوەدێری دەکەن بەوە

دەڵێن کوللەداشی، چون کوللەی دەدەنێ و بە کوللە بەخێوی دەکەن، ئەوە دەبێتە کەوی چاک.

**کەوی شەڕی:** زۆرتر نێرەکەوە و کەمیش ڕاو دەکا، ئەویش بۆ کەو بەزێنە جاری وایە زۆر بە قیمەت بە پووڵ زۆر دەیکڕن. کەوە شەلەی سەرداری بۆکان بە ناو بانگە کە مامۆستا هەژار دەگێڕێتەوە کە کەوێک دەفرۆشن داوای پووڵی زۆری لێ دەکەن. ئیتر سەردار عەزیزخان دەیکڕێ بەو پارە زۆرە و دەڵێ:

| | |
|---|---|
| خان هەڵیپساند سەری | ڕووی کردە دەوروبەری |
| کوتی کێ هاوڕەگەزی | بداتە دەست ناحەزی |
| پاداشی سەربڕینە | نەک وا بە زێڕ کڕینە |

**باڕەکەو:** ئەویش ئەوەیە تازە خاڵ و میلی ڕشتووە یا دایدەنێ، ساڵی بەسەردا نەهاتۆتەوە ئەبەوە دەڵێن باڕەکەو.

**کەوی دەستباز:** ئەوەیە کە دەستەمۆی دەکەن، فێر دەبێ بانەو بان دەگەڵ خاوەنەکەی دەگەڕێ بێ ئەوەی بڕوا یان تەوەلا بێ.

**ڕاوەکەو چۆنە و چەند بەشە:**

داوی ڕاوەکەو سێ جۆرە:



**ڕاوی داو**

١) نوعێکیان داوی بارزانی پێدەڵێن ئەویش ئاوایە سێ لۆ با، دەدرێ و لە کاتی داکوتان لە بنەدا بۆ کەوێ ناکەوێ و قیت ڕادەوەستێ.

٢) ڕاوی نایلۆن یان پڕ پێچ پێدەڵێن کە ئەویش سێ لۆیە، ئەو نایلۆنە تایبەتی داوە.

٣) داو داموسکی سپی مایل بە بۆرە، باریک و قایم، زۆرتر لە کلکی ئەسب پەیدا دەبوو، ولاغە بەرزە کەسێکی شارەزا بای دەدا قڵفەی دەکا داری چکۆلەی بۆ چاک دەکرد، قڵفەکانی پێدا دەکرد بە نێوی «سنک» دەبوو لە داری بەهێ بێ. داوەکەی لێ گرێ دەدا، هەر داوێک بە سنگێکەوە بوو دەیکەنە بەستە کە پێی دەڵێن:«دەسکە داو»هەر دەسکە داوێک ٨٠ تا١٠٠ دانەیە، ڕاوچی جاری وایە ٤یا ٥ دەسکی پێیە و نابێ بهێڵی ڕۆژ بێتەوە ئەو دەسکە داوانە لێدا دایان کوتێ جا دەبێ زوو کەو لە بنەی دابنێ و خۆشی حەشارگە ساز بکا.

**قەفەس:** ئەویش چەند جۆرە

١) بیلالی ئەوەیە سەرەکەی بە تەختە دێننەوە



**«قەفەسی کەوی»**

٢) قەفەسی ئاسایی ئەویش دوو جۆرە، قـەفـەسـی جـووت قـەفـەس. قەفەسی جووت قەفەس ئەوەیە دوو کەوی تێدەکەن جا یا نێرە و مێیە یا ئیدیکەیە. وەک کەوتۆڕەکە تازە دەیگرن.

٣) قەفەسی دیکەشمان هەیە، کە قەفەسی بە دەرگای پێدەڵێن یانی دەرگاکە لە تەنیشتەوەیە.

٤) قەفەسـی گەورەشـمان هەیە کە چەنـد کەوی تێـدەکەن کە پێـی دەڵێن ماشە.

٥) دیارە قەفەس لە دوو بەش پێکدێ، یەک کەوانەکەیەتی کە ئەو لە داری بییە لە ئاوی دەخەن نەرم دەبێ خواری دەکەنەوە کە پێیدەڵێن داهێنـان، دەبێتـە کـەوانـە ئـەو تـەختەیـە کـون دەکـەن، شـوولی تێهەڵدەکێشن، شـووڵ کە داری قـەفـەسـی پێیدەڵێن، شـووڵ ئـەلـەوانـە دەبێ: لە داری سنجوو، شیلان، بەلاَلوک، گزیچار.

## ڕوون کردنەوە:

١) ڕاوی پۆل بوار ئەوەیە کە لە هەوەڵی بەهاردا دەبێ کە کەو دانەدانە دێتەوە.

٢) ڕاوی سیاسووت ئەوەیە گیا گەورە دەبێ، هێشتا دەیمێنێ بۆ مێرۆژ.

٣) ڕاوی مێرۆژ ئەوەیە ماکەو کورک دەبێ

٤) ڕاوی کۆتەڕاو ئاخر مانگی پاییزە کە کەو دانەدانە دەمێنێ و نارۆنەوە یان لە کاتی ڕۆینەوە دان بۆ ناوچەی گەرمێن.

## بنەی ڕاوێ:

ڕاوچی چ لە زستاندا و لە هەوەڵی بەهار دەبێ شەوی بمێنێ داوان هەڵگرێ کەو و قەفەسی لە کۆڵدا و چرافانووسیشی هەڵگرێ و بڕوا بۆ بنە جێگای دیاری دەکا. چەند بەرد بە یەکەوە دەنێ، کەوی بە قەفەسەوە لە نێو دادەنێ،گیای بەسەر دادەدا. ئەوە بنەی کەوە لە دووری ویش حاشارگەیەک ساز دەکا. بۆخۆی هێندێک گیا وگژ بە خۆیدا دەدا تا کەو نەیبینن و نەڕۆنەوە، ئەوەش حاشارگەیە بەڵام نابێ بکۆخێ یا بجولێ، دەنا کەوەکان دەڕۆن نایەنەوە سەر بنە، بەوە دەڵێن داوەڵ. ڕاوچی ئەگەر کەوی بۆ پێوە بوو زۆری پێخۆشە جا یان قەفەسی زیادی پێیە تێی دەخا. دەنا هەردووک لاقی لە دۆخینەکەی دەبەستێ و بە نێوگەڵیدا بەری دەداتەوە بەوەش دەڵێن کەوی گونێڵ.

## ڕاوەتفەنگ:



**ڕاوەتفەنگ**

ئەوەیە کەو لە بنەی دادەنێ،کەوی کێوی دێ بۆی سەرکەوێ، ڕاوچی بە تفەنگ لێی دەدا و دەیکوژێ جاری وایە دوو یا سێ کەو دێن و دەکوژرێن. تفەنگی قەدیم ساچمەزەن بوو بە باڕووت دادەگیرا،٣٠تا٤٠ تەرەقە یان ئاسنی خڕی چکۆلەی، تێدەخست ئەوەش ڕاوە تفەنگ بوو. کەوی وایە لە تەقەی تفەنگ دەترسێ، ناخوێنێ بەوە دەڵێن لە فڕە چووە.

**ڕاوی دێو جامە**:دێوجامە پارچەیەکە سازی دەکەن لە ڕەنگی عەرزی، پەڵە پەڵەیە، ڕاوچی بە سەری خۆیدا دەدا جێگای چاوی کونە و زۆرتر بۆ ڕاوی تفەنگ جێگای لوولەی تفەنگەکەش کونە، کەو لێی دەهاڵێن چونکە ڕەنگی گیا و گژی کێویە، لە ناکاو خۆیان پێدا دەدا دەیان گرن یان تەقەیان لێ دەکا و دەیان کوژێ ئەوەش دێوجامە.

## ڕاوی تۆڕ:



**«کەو و بەچکەکەو»**

دوای ئـەوەی کـەو بـەچکـەی هـەڵێنا وەدووی خۆیـان دەدا جێگـای وەبیر هێنانەوەیە کە کەو، زڕەکەو و هەوێردە هەر بەچکەیان لـە هێلکـە هاتـە دەرێ چاویـان پشـکووت ئیتـر لـە هێلانـەدا نامێننـەوە، وەدووی خۆیان دەدەن. کاتێک کەو بەچکەی وەدووی خۆی دا زۆرتر دەیان باتە سـەر کانیئـاو و مێرگـان، ڕاوچـی دەچێت دانـەخۆرەیـان دەکـا و کـا و کوتـەڵ و کوێزریـان بۆ ڕۆ دەکـا تـا بێن چینـەی لـێ بکـەن، لـە بن ئـەو کوێزەر و شتە تۆڕێک دروست دەکا و پانی دەکاتەوە یان پزووی هەیـە یان دوو تەختـەدارە وێک دێتـەوە، ڕاوچـی کونێـک سـاز دەکا خۆی لـێ حەشار دەدا ئەگەر کەوەکان هـاتن پزووەکـەی دەکێشـێ، تۆڕەکـە وێک دەکەوێ ئەوەی لەوێ بێ کەو پێوە دەبێ ئەوەش ڕاوی تۆر.

**ڕاوی دێــوه ســـەره:** کـەو لــەســـەر چیمــەنێک،کانییــەک بنەیــەک دانەخۆره دەکرێ هەموو ڕۆژێ دێن بۆ دان و ئاو چونکه فێربوون. ئیتر ڕاوچی که زانی کـەو دانـەخـۆره بـووه، لیباسـێک لـەبـەر دەکا لـه ڕەنگی عەرزەکەیه و گوێ و چاوی هەر لەو لیباسه بۆ دروست دەکا وەکو دێو ودرنج دەچێ ئەو جار کەو ڕەوی لەبەر ناکا لێیان دەچێته پێش،جا یـان بـه تفـەنـگ لێیـان دەدا یـان خۆیـان بـه سـەردا دەدا. ئـەوەش ڕاوی دێـوه سـەره.

**کاتەکانی ڕاو ئەوانەن:** سیاسووت، پۆلپێچ کـەو بـوار، کۆتـەڕاو، مێرۆژ یان ڕاوی ماکەو، ڕاوی دەستی، ڕاوی سیاسووت. کاتێک زستان تەواو دەبێ کەو بـەرەو کوێسـتان دەگەڕێنـەوه و ڕاوی نێرەکـەو خـۆش دەبێ. ڕاوچی کەو و قەفەس و داو و فانووس ساز دەکات و جێگا بنـه دەبینێتــەوه شــەوگــار کــورت و خــەو خــۆش دەبــێ. کــەویــش لــه گیـای بەهاری تێره و دەنگی دەلێره دێت و بنەی زوو پێوه دەبێ بـەوه دەڵێن سیاسووت.

**ڕاوی پۆل پێچ:** کاتێک کەو بێچووی هەڵ فڕاند بـه پۆل دەگـەڕێ. دەڕۆن بۆ سـەر کـانی و ئـاوا دانـەخـۆره دەبـن لـەوێ ڕاوچـی یـا بـه داو، دێوجامه، تۆڕ دەیانگرێ بەوه دەڵێن ڕاوی پۆلپێچ.

**ڕاوی کەو بـوار:** لـه زسـتاندا کـەو کـەم دەمێنێتـەوه لێره و دەڕوا، ئەو دانەدانەیەش له نزار و پەسار و له پـەنـا بـەرد و لـه نێـو هــەردوو و ئـەوەدا خـۆ حــەشـار دەدا، ڕاوچـی دەچـێ بنـەی بـۆ دادەنـێ، داوی بـۆ

دەنێتەوە ئەویش دڵی خۆش دەبێ کە کەوی دیکە هاتۆتەوە لە باڵ دەدا، دەچێ پێوە دەبێ. ئەبەوە دەڵێن کەو بوار. چۆن بە بوار دێتە سەر بنە بە ترس و ئەندیشەوە. یان تازە دانەدانە دێتەوە.

**کۆتە ڕاو:**



لە ئاخر و ئۆخری پاییزدا کە کەو دانەدانە لەبن بەرد و ڕەوەز و چڕ و چیادا خۆ مات دەکا و دەمێنێ و نارِوا، ڕاوچی بە هەلی دەزانێ دەڕوا بنەی بۆ دادەنێ، ئەو پێوە دەبێ. جا بەوە دەڵێن کۆتەڕاو.

**ڕاوی مێرۆژ یا ماکەو:**




ڕاوی مێروژ بە ماکەو دەکرێ کاتێک ماکەو تەواو هێلانەی کرد و هێلکەی تەواوی کرد و دەورانی کورک بوونی نزیک بوو، دیارە لە نێو ڕاوچیان و مەڵبەندی کوێستان کاتی مێرۆژ ئەوەیە کە گێوژ گوڵ بکا جا چ گێوژی زەرد، چ گێوژی سوور. بەڵام لە ناوچەکانی دەشتایی و گەرمێنی ئەوەیە کە مێژورد گوڵ بکا، دیارە مێژورد گیایەکی جوان و نەرمە و بە پۆل شین دەبێ گوڵی سپی و بەنەوشی هەیە بۆ پاتاڵ خۆشە کە دەیدروون پێی دەڵێن کۆدە، چونکە ماکەو خۆ لە نێرەکەی دەشارێتەوە و لەسەر هێلکە دەکەوێ. ئیتر نێرەکەو بە جارێک سەری لێ دەشێوێ، جا ڕاوچی کەوی ماکەوی بۆ دەبا لە بنەی دادەنێ هەر کەو خوێندی نێرەکەو دەگاتە سەری چاوی عەرزی نابینێ لەخۆشیان پێوە دەبێ. ئەبەوە دەڵێن مێرۆژ. بۆیەش پێیدەڵێن مێرۆژ زۆرتر ڕاوی ماکەو بە ڕۆژە بە تایبەت کە سێبەر داهات.




**ڕاوی دەستی:** جاری وایە کەو کورک دەبێ لە دەوروبەری جوجکە هەلێنانیدا زۆرکز دەبێ عادەتی وایە سەری لەبەر خۆی دەنێ جاری وایە خەریکە پێی لێ بنێ جا دەزانێ و هەڵدەفڕێ جا لەو کاتانەدا دەیگرن. بەڵام گوناحە و هەموو کەس ئەو کارە ناکا، یان زستان کە بەفر دەبارێ بە تایبەت نوای هەوەڵ کە بارەن نەبێ و بەفر بەسەر نەبێ نەی بەستبێ دەنا کەو تێناکەوێ بە قنە دەڕوا و کەس بەو بەفرە نایگاتێ. جا ئەگەر ئاوا بوو ڕاوچی دەچن بۆ ڕاو ئەوکات کەو پۆل دەبن، ڕاوچی دەبنە دوو دەستە هەر دەستەی لە بەرێک دەبن، لە بەری شاخێک، ئەگەر کەویان هەستاند ئیتر بە پۆل دەڕۆن بۆ ئەو شاخەی ئەوبەر، ئەو دەستە ڕاوچییەی دیکە چاوەڕێن، کەویش عادەتی وایە ئەگەر یەکباڵ فڕی تازە هەڵناستێتەوە، سەری لە بەفر دەچەقێنێ، ڕاوچی دەچێ دەیگرێ. بۆیە بۆ وێنە دەگێڕنەوە دەڵێن: «وەکوو کەو

وای، سەرت لە بەفر ناوە بۆخۆت کەس نابینی پێت وایە کەسیش تۆ نابینێ.» ئەوەش ڕاوی دەستی.

## ڕاوی چۆڵەپێچ:



**«نێرەکەو و ماکەو لە حاڵی چۆڵەپێچدا»**

ئەوەیە کە کاتێک ماکەو و نێرەکەو لە کاتی جووتگیری کە نێرەکەو بە دەوریدا دێ تا چوار پێنج دەور، دەقرتێنێ و کورکەی دێ هۆشی لێ دەبڕێ، جا ڕاوچی فورسەتی لێدێنێ و نێرەکەو دەگرێ. دیارە چۆڵەپێچ بۆ ڕاوە کەرویێشکیش بەکار دێنن و بۆ قایم کردنی دەرگا چەپەر و شەغرە چۆڵەپێچ بەکار دێ. ئەوە بوو بە کورتی باسی ڕاوەکەو.

# ڕاوی شەوارە




**«کۆتر»**

ڕاوی شـەوارە دوو بـەش بـوو یـەک لـە شـەوی تاریـک و بـارانی پاییزدا بەهاران کە باران دەبارێ و باڵندە هەمووی گیانی تەڕ دەبوو توانای فڕین و ڕۆیشتنی نەبوو دەهاتن بە گیشە و تایەوە دەنشتن دەنا دەچوونە نێو تایەوە، منداڵیش خۆیان مات دەدا و بە پۆل دەیانگرتن یان دەچوونە نێو تایەوە خۆیان دەشاردەوە تا تاریک دەبوو ئیتر باڵندەکان دەهاتن هەڵدەنیشتن، منداڵ لێیان وەخۆ دەکەوتن پڕیان دەدانێ و دەیانگرتن. بەشی دووهەم نێو پۆلەدار و قورغ بوو وەکوو بووزانی ئاختەتەر، شێخ سەفی ئاڵیکەند، شێخبابای بانە، پیرخدری سەقز، سێچاکانی ساردەکۆستان. کاتێک باران و بەفر و شڵێوە

دەبـاری باڵنـدە تـەڕ دەبـوو زۆریـش بێهێـز دەبـوو ئیتـر جحیـڵ کـە تاریکـەشـەو بـا لـە دێیانـەوە دەڕۆیشـتن بـە چراگـازەوە، فـانووس یـا لـەنتـەری، یان دەچـوون لـەوێ ئاوریـان دەکردەوە ئـەو باڵندانـە وەکوو قاژوو- و کۆترەگایانە، کۆترە باریکە، کۆترە شینە، لەبەر ڕووناکای چرا چاویان نەیدەدی، مات دەبوون لەسەر لک و پەلی داری ئەوانیش بە دار هەڵدەگەڕان، ئیوا بوو دارەوان بوو دەیانگرتن و کۆیان دەکردنەوە، دەنا جاری وابوو ئەوەندە تەڕ و بێهێز دەبوون دارەکەیان ڕادەوەشاند، ئـەو کـۆتر و قاژووانـە دەکـەوتنـە خـوارێ نـەیان دەتـوانی هـەڵفڕن، دەیانگرتن و کۆیان دەکردنەوە و دەیانبردنەوە بۆ ماڵێ هـەرکـەس بـو دێی خۆی دیارە ئەوانە گۆشتیان هەیە و گۆشتیشیان خۆشـە، ئـەوەش ڕاوی شـەوارە.

جـاری وا بـووە بـۆ ڕاوی کـەروێشـکیش دەچـوون بـە چـراوە، کەروێشـک بـە ڕۆژ دەخـەوت مـات دەبـوو، بـە شـەو هەڵدەسـتا دەگـەڕا. دەچووە نێو وێنجە، شینایی، شیناوەرد، بێستانەدێم ئـەوانیش دەچوون بە چراگاز کەروێشکیان دەدیتەوە و چرای تێدەگرت ئیتر لە جێی خۆی نەدەڕۆیشت دەچوون دەیانگرت.



**«دەڵەک»**

**یەکی دیکە ڕاوی تەڵە بوو،** تەڵە چکۆلە و گەورەی بوو، بۆ نموونە تەڵەی ورچ، گورگ، ڕێوی، چەقەڵ، گەورەتر بوو لە تەڵەی دەڵەک، فسۆس، چاڵەکە «چوالوو»، ڕزق یا لە ئی سەگڵاوک«سەگی کێوی»، «سمۆر» هەموو فەرقیان هەبوو. تەڵە ئاسنێک بوو تایبەتی وەکوو فەنەر، ئاسنگەر دروستی دەکرد بە شێوەی دائیرە«بازنە» بەڵام دوو بەش بوو لە نێوەڕاستەکەی ئاسنێکی ناسکی پێوە بوو، ددانەی هەبوو قولاپێکیان لەو ددانە گیر دەکرد ئەگەر جانەوەرەکە هاتبا نەی‌دەدی چون لەبن گڵیان دەخست لاقی لێدەدا، قولاپەکە دەترازا و هەر دووک لای تەڵەکە هەڵدەستاوە توند لاق و دەستی، جاری وا بوو دەمی جانەوەرەکەی دەگرت، ئیتر لە جێی خۆی نەی‌دەهێشت بڕوا، تەکان بخوا، جا دەیان‌کوت پێوە بووە. جا بۆ پێوەبوونی ئەوانە خۆراکیان بۆ دادەنا ئەوەی گۆشتخۆر با گۆشتیان بۆ دادەنا تا بیخوا و پێوە بێ، دەنا ئەوەی دانی خواردبا یا گیا و گژ، وەکوو کەروێشک و ئەوانە

ئەوەیان بۆ دادەنا، پێوە دەبوو. ئەوەش ڕاو بە تەڵە کە ئێستاش ماوە. لازمە ئەوە بزانین گورگ، ورچ، ڕێوی،



**«تەڵە»**

کەروێشک، دەڵەک، فسۆس، ڕزق«مشککەروێشک»، چاڵەکە، چوالوو لە ویشکاییدا دەژین. بەڵام سەگلاوک، سەگی کێوی، سمۆر، جاروبار چەقەڵیش لە نێو ئاودا دەژین و حەیوانی نێو ئاوین.

**سەرچاوەکان:** گوتەی ڕاوچێکان و کتێبی کەوباز

## ڕاوی کەروێشک



دیارە کەروێشک جانەوەرێکی توند و تۆڵە و لەساڵدا بۆ بێستان و وێنجە و جاری وایە بۆ خەلە و خرمانیش زەرەدی هەیە. لە زووەوە لە وڵاتی کوردەواری خەڵک بۆ سەیر و سەیاحەت و بۆ گۆشتەکەشی چوون بۆ ڕاوی کەروێشک. چون چێشتێک کە بە گۆشتی کەروێشک لێ دەندرێ بە نێوی «سەنگەسیر» زۆر مەشهوور و بە ناوبانگە و تام و لەززەتێکی تایبەتی هەیە.

**ڕاوی کەروێشک چەند بەشە: یەکیان** ڕاوی شەوارەیە، لە پێشەوە لەگەڵ ڕاوی شەوارە باسمان کرد. **دوو** ڕاوی کەروێشک بە تەڵەی قوڵکەیە یان تەپکەیە ئەویش ئاوایە ڕاوچی دێنێ چوارچێوەیەک بە ئەندازەی دوو بست یان «٣٠ سانتی میتر» و دوو بست و قولانج درێژە «٤٠ سانتی میتر» ساز دەکا. دوو تەختە بە ئەندازەی نیوەی ئەو بە لاولاوە لە چوار چێوە پێکەوە دەدەن قەدیم کە لاولاوە نەبوو بە قایشی چەرم یان بنەکەوش«لاستیک» هەر تەختەیەی بە جیرێک یان

«کێش» لە لای خۆی بە چوارچێوەکەوە قایم دەکا بە جۆرێک جیرەکە نایەڵێ تەختەکە بکەوێ، هەڵیدەستێنێتەوە وەکوو فەنەر وێکی دەخاتەوە. قوڵکەیەک هەڵدەقەنن کە تەختەکە لەسەری گیر بێ و قایمی دەکەن دەبێ قوڵایی قوڵکەکە نیو میتر قوڵ بێ دێنن وەک پەنجەرەی دوو تایی کە بە دیوی ژوورێدا بکرێتەوە و بە ژوورێدا بکەوێتە نێو قوڵکە چاڵەکەوە و دەست بەجێش تەختەکان هەستنەوە و دەرگای چاڵەکە بگرێتەوە جا دێنن



چێشتە کەروێشک دادەنێن تا دمەچێشتە بێ و بچێ و تێکەوێ. زۆرتر کەروێشک وێنجە و تەڕەکاری پێ خۆشە. هەر کە چووە سەر تەختەکە تازە تێی دەکەوێ و نایەتەوە دەرێ و دەمێنێتەوە، چونکە تەختەکان هەستاونەوە دەرگای قوڵکەکەیان گرتۆتەوە جاری وایە دوو – سێی تێدەکەوێ ڕاوچی دەچێ دەریان دێنێ ئەوەش ڕاوی کەروێشک بە تەپکە یا قوڵکە.

**سێ. ئەوجار ڕاوی کەروێشک بە داو:** ئەویش ئاوایە کاتێک خرمان سوور دەبێ و گەنم لە کایە دێتە دەرێ. کەروێشک دەچێتە جێی خرمان بۆ گەنم خواردن. جا ڕاوچی دێنێ داوی کەوانی بۆ دەنێتەوە لە دەوری

خرمانەکە نێونێو یانی بەینبەین چەند قوتوویەکی خاڵی تەنەکەی چکۆڵە وەکوو قوتووی ڕوبی تەماتە کوون دەکا بە داوەکانەوەی دەکەن و هەڵدەواسرێ، کەروێشک دێ بۆ گەنم خواردن پێوە دەبێ، هەڵدەبەزێ و هەڵدێ دەتوانێ سنگی داوەکان هەڵقەنێ یان بیان پسێنێ بەڵام هەر تەقە و ڕەقەی تەنەکەکانی هات لە ترسان خۆ مات دەکا لە جێی خۆی نابزوێ و جووڵە ناکا تا ڕاوچی دەچێ و دەیگرێ و لێی دەکاتەوە. ئەوەش ڕاوی کەروێشک بە داو.

**چوار** ڕاوی کەروێشک بە نێوی **ڕەشەڕاو** یانی لە هەمووی ساڵدا بە پێیان یا بە سواری یا بە بێ شوێنهەڵگرتن ڕاوچی دەچێ بۆ ڕاوێ. ئەگەر بە تفەنگ بێ ئەوە هەر هەستا لێی دەدا و دەیکوژێ و هەڵی دەگرێتەوە دەنا بە تاجی بێ هەر هەڵی ئەستاند لە لانێ تاجی تێبەر دەدا، تاجی دەیهێنێ و دەیبا ئەگەر بۆی بگیرێ دەیگرێ جا تاجی وایە تەعلیم دراوە نایخوا و برینداریشی ناکا لە بن خۆی دەنێ تا ڕاوچی دەگاتێ بەڵام تاجی وا هەیە شپرزەی دەکا و برینداری دەکا، ئەوە ڕاوی کەروێشک لە ڕەشانگدا یانی بێبەفر جا چ پیادە بێ یا بە سواری.

**پێنج**. ڕاوی کەروێشک لە بەفردا یا لە زستاندا- جا چ بە سواری بێ یان پیادە ئەویش ئاوایە:

**١.** ڕاوچی بە پێیان دەڕوا و دەگەڕێ ئەگەر بەفر باریبێ و کەروێشک تێکەوێ و نەیبەستبێ دەنا ئەگەر بەستبێی ئەوە کەروێشک تێناکەوێ تاجی نایگاتێ دەڵێن بەفر بە سەرە بە کەڵکی ڕاوێ نایە چون کەروێشک یا کەو یا دەعبای کێوی ئەگەر بەفر بە سەر بوو تێناکەوێ. ئەوە شوێنی هەڵدەگرن هەرچەند هەزارەی دەکا دیارە هەزارە بەوە دەڵێن زۆر لە نێو بەفردا دێت و دەچێ تا شوێنەونکەی بکا بەوە دەڵێن

هەزارە یا دەڵێن کەروێشک **خوزەی** کردووە. دیارە ئەوە ئیستلاحی لای سەقز و بانە و گەورکان و بەشی ئالانە، بەڵام لە ناوچەکانی بۆکان و چۆمی مەجیدخانی مەهاباد و شارویرانی شنۆ پێیان دەکوت هەزار و دوو لایی ئەویش کاتێک ئەوەندە دێت و دەچێ هەموو کەس شوێنی بۆ هەڵناگیرێ بەڵام کەسانی تایبەتی هەبوون دەیان دیتەوە. ڕابردووەکان دەیانکوت یان لەبن پنچک و گرالکدا دەکەوێ یان لە نێو بەفردا بەڵام جێگای هالاوی لووتی کون دەبێ بەفرکە دەتوێتەوە ئیتر هەڵی دەستێنن و تاجی تێبەر دەدەن دیارە ئاواش دەتوانن بیگرن یان بیکوژن بەڵام تێبەردان و ئەوبەرەو بەرەکەی خۆشە کاتێک کەروێشک دەبیننەوە بەوە دەڵێن لان یان لە لان دایە، کاتێک دەوری دەدەن پێیدەڵێن تەماڵە. تەماڵە کاتێک هەڵی دەستێنن تاژی یا تاجی ڕێی دەکەوێ بەوەش دەڵێن تێبەردان.

**٢. ڕاوی لە بەفردا بە سواری:** ئەویش ئاوا بوو ئەوە زۆرتر لە زەمانی ئاغایاندا یان لەو زەمانەدا کە باوی ئەسب سواری بوو. خەڵک شایی بە خۆ بووە ولاغی سواری چاکی هەبوو. لە زستاندا پاڵتۆی ماهوت، چەکمەی عەرزە ڕۆم یا ئەستەمبوڵی لەبەر دەکرد زین و لغاوی ئینگلیسی لە وڵاغی دەکرد ئەگەر خۆی وەسەر خوانی زینی دەهاویشت ڕکێف و ئاوزەنگی لێدەدا گوێی لە پڕمە و کەحێل دەبوو پێی وابوو دونیا ئەوەندەیە هەر هیئەوە ئیتر ئەوکات شەڕی تمەن و خانووبەرەو مەقام و پووڵ پەیدا کردن و مۆد و چاولێکەری نەبوو بەڵکو هەڵوێستی زۆرتر ئەسب سواری و سیاحەت و کەواو پاتۆڵ و مووشەرعێن و شەڕەشیعر و میوانداری بە چێشتی سوننەتی و جۆرابێن و شۆخی و خۆشی و شەوچەلەی ئالان و ئەوانە بوو. دونیایەک پڕ لە سەفا و

خۆشـەویسـتی و هاوکـاری و داوێنپـاکی، چـاکی، دڵڕوونـاکی، پێکـەوە دانیشتن و هەستان و دوور لە چاونەزێری و خەیانەت و ناپاکی بوون. جا ڕاویش یەکێک لەو خۆشیانە بوو. کاتێک بە ئەسب ساز دەبوون بۆ ڕاوی، جاری وابوو زۆر بوون ئەوەی لە سەرەوە بوو پێیان دەکوت **سەرڕاو**. ئەوەی لە خوارەوە بوو پێیان دەکوت **بەرڕاو**. دەهاتن بەنێکیان دەهۆنییەوە٤ تا ٥ میتر درێژ بوو لە بەنی ڕەنگاوڕەنگ یان لە ئاوریشمیان ساز دەکرد سەرێکیان دەکردە گوڵینگ لە قۆڵیان (باسکیان) دەبەست سەرەکەی دیکەشیان لە قەڵاتەی ملی تاجی دەکرد(قەڵاتە ئاڵقەیەکە بە تایبەتی سازی دەکەن لە ملی تاجی دەکەن ئەگەر تاجی ڕاوی کردبایە و بکوژ بایە قەڵاتەی زێویان بۆ ساز دەکرد). زۆرتر سەرڕاو و بەرڕاو تاجیان پێ بوو بەو بەنەیان دەکوت **«ڕستە»** بەو ڕستەیە وەدووی خۆیان دەدا کاتێک کەروێشک هەڵدەستاو دەردەپەڕی تاجیان بەڕەڵڵا دەکرد و تێیان دەقوولاند و تێیان بەر دەدا. کاتێک کەروێشکیان دەدیتەوە لە لاندا نەیدەوێرا هەڵێ؛ هەر کەسێ بیدیبایەوە خەڵاتیان دەکرد. ئیتر دەوریان دەدا چەپڵەیان لەسەر لێدەدا بە دەنگ هاواریان دەکرد ئەو هەمووە سوارە لێی کۆ دەبوونەوە دەیانکوت تەماڵە، تەماڵە؛ ئیتر هەڵیان دەستاند تێیان بەر دەدا و دەیان کوشت ئەوەش ڕاوی کەروێشک بە هەموو بەشەکانیەوە.

# ڕاوەتاژی




ڕاوەتاژی مامۆستا هێمن کە لە سروەی ژمارە ٦٠ نووسراوە دەیخەمە بەر دەستی خوێنەرانی بەڕێز تا یادێک لە زانایی ئەو بەڕێزە بێ و پێزێکیش بێ بۆ ئەو مەبەستە. کەروێشک گواندارێکە کە نینۆکی هەیە، گیا خۆرە، کلکی زۆر قوڵەیە، تووکی نەرمە، درێژایی لە بەرزایی پترە، پێشووی لە پاشووی کورتترن، بە باز و قونە دەڕوا، گوێی زۆر درێژن، سەری لە چاو لەشی زۆر گەورەیە، چاوی زەق و لە ڕوون و نانووقێن زیاتر بە چاوان دەبیندرێتەوە، دەڵێن زووی زۆرە، لە جێگای سارد و گەرمدا هەیە لە بژوێنترین کوێستانی کوردستاندا و گەرمترین و کراڕترین بێروونی عەرەبستاندا دەژی، بە بێچووی دەڵێن بەچ و کە پەڕەوازە بوو و توانی توند ڕابکا «سەپسێنی» پێ دەگوترێ، یانی سەگ دەپسێنێ و بۆی ناگیرێ. بە ڕواڵەت یەکجار بەستەزمان و بێدەسەڵات و ترسەنۆکە لەبەر هیچ

گیانداری چوارپێ و باڵندەی بچووکی ڕاوێ دەس ناکاتەوە، کەچی دوژمنی وەرزێڕ و ڕەزەوان و بێستانچییە. تا دەستی لەسەر دابنێی بەزەڕ و بەدفەرە، بە ڕۆژ لە لاندا خۆی مەڵاس دەدا و بە شەو دەگەڕێ و دەلەوەڕێ، هیچ ناپارێزێ بۆ باغ، بێستان، شیناوەرد و ڕەپستە تەنانەت خۆیان و خەرمان وەک بەڵا وایە بۆیە وەرزێر و تەڵە و خوردە و داو دەیگرن. گۆشتی دەخورێ، دەڵێن تەمەنی بەوەڕا دیارە کە هەر ساڵە کونێکی لە بن کلک دەبێ.



نیزیکەی سی، چل ساڵ لەوەی پێش کەم ساحێب ملک و ئاغا و مەزنی کورد هەبوو، ڕمموودەی ڕاوە کەروێشک نەبێ، دیارە ئەم کارەش بەستە بە دەست ڕۆین و نەڕۆینەوە بوو، ئاغای دەوڵەمەند ڕستەیان لە ئاوریشمی ڕەنگا و ڕەنگ دەهۆنییەوە و گوڵینگی سیمپێچی جوانیان وێدەخست سەری گوڵینگداریان لە باسکی ڕاستە یا ڕاست و چەپ لەشان دەکرد. قەڵادەیان لە قایشی باش دروست دەکرد و بە ئاورێشم دەچنی، زەنگۆڵەی زەرد، زێو تەنانت زێڕیان لێ دەدروو، سەری دیکەی ڕستەیان لە ئاڵقەی

قەڵادە هەڵدەکێشا. ئاغا دێ بە خۆی و باب نۆکەر و ڕەعیەت سوارەوە دەچووە ڕاو، لەو جێگایەی زانیبایان کەروێشکگرە ڕاویان دادەبەشی و سوار سەفیان دەبەست، لە کێو یا بانوو سوارێک بە تاژی‌یەکی کارامەوە سەر ڕاوی دەگرت، سەر ڕاو دەبوو لە پێش سواراندا بێ و چاوی لە لای خوارێ بێ تا ئەگەر کەروێشکیان لە داوێنێ تێبەر دا وریا بێ و بزانێ ڕوو لە کام لا دەکا، ئەو دەبوو ڕاستەو ڕاست لە پێشدا بێ، ئەگەر تاژی خوارەوە نەیانکوشت و بە ماندوویی گەیشتە سەر ڕاو ئەو تاژییەکەی خۆی بەر داتێ، دەبوو تاژی سەربەرەژێژ بەر نەدا و ڕاوەستێ تا کەروێشک کەمێکی لێ ڕەت دەبێ، بەر ڕاو سوارێک بوو کە باشترین و چێترین تاژی پێ‌بێ و کەمێک لە دوای سوارانەوە بێ تا ئەگەر کەروێشک پاش ڕاو بکا، تاژی خۆی تێبەر دا، سوارەکانی دیکە کە نێوانیان پێنج، شەش گەز پتر نەبوو، چ تاژییان پێ‌با یا نەبا دەبوو لە ڕێکی یەک بڕۆن و هەر کەسە لە لای سەرووی خۆی ورد بڕوانێ و هەوڵ بدا هیچ بن پنچک و بەردێک نەبوێرێ، تا سەف و نێوانی سواران کەمتر بایە، کەروێشک چاکتر دەبیندراوە یا زووتر هەڵدەهات، لانی تازە و کوێرە و لانی شەوێ دێنێ نیشانەی ئەوە بوو، کەروێشک هەر لەو دەور و بەرەیە، جا دەبوو بە فیتوو یەکتر حاڵی بکەن، سەف ڕاستتر و سوار خوردتر بن، ورد بڕوانن و نەیبوێرن، کەم وایە کەروێشک لەبەر سەفی ڕاست و ڕێک و پێک و سواری ئارام بوێرێ ڕابکا، خۆی لە لاندا مەڵاس دەدا و لە عەرزی دەخا. ڕاوکەری لێزان بە تەماڵ دەیبینێتەوە.

ئەو سەردەمی داب بوو ئەگەر نۆکەرێک یا ڕەعیەت سوارێک تەماڵی دیبارە دەیگوت: «نۆکەری ئاغای خۆم و ڕاوکەرانم پێ‌دەڵێن هۆی تەماڵە» عادەت وابوو ئاغا و خزمەکانی تەماڵانە بدەن و بەو ڕاوکەرە و خەڵاتی بکەن، سوار لە دەورەی تەماڵ کۆ دەبوونەوە، پایزە، ئازیزە، گوڵێ گوڵێ، حەیران و گەلۆیان لەسەر دەگوت و جاروبار دەهۆڵ و زوڕنا و سێ تەپڵێشیان لەسەر لێ دەدا، ئەگەر بۆ خاتری سەیر نەبا بە هاسانی بە دەستی دەگیرا، بەڵام ئاغای گەورە بۆ سەیر دەچوونە ڕاو نەک بۆ ڕاوە گۆشت، جا بۆیە ئەسپیان وەسەر دەپەڕاند کە هەڵێ و تاژی تێبەر دەدا، ئیوا بوو چێ و دمگەرم بوو گوریسێکی نەدەبرد و لە سەفی سواران دەرنەدەکرد و هەڵیدەگرت و ئیوا بوو خێرا و پەل و دمسارد بوو، چەند جاری دەگێڕاوە، لێی دەدا، تێی ڕۆ دەهات تا هەر خۆی یا تاژییەکانی دیکە دەگەینە نۆرە و هەڵیان دەگرت، تاژی ڕەسەن کە کەروێشکی هەڵدەگرت نەیدەشەمزاند یا بە دمیەوە دەگرت یا چەمۆڵەی لەسەر دادەدا، سوارێک دادەبەزی و سەری دەبڕی و وەبن ساموڕتەی دەخست. ئەگەر تاژی خوێڕی بایە نەیدەشکاندەوە و خوارەی پێ نەدەکرد و کەروێشک ڕزگار دەبوو، ئەگەر باشتر ڕاستی دەکرد و دەیگەیاندە سەر ڕاو یا لە کونی دەکرد. کەروێشک هەمیشە بۆ لێقەومان کونێک ڕەچاو دەکا، بەڵام تا زۆری بۆ نەیە ناچێتە کونەوە سەرڕاوی شارەزا لای کونێ‌یان لێ دەگرت وا دەبوو لە زارکی کوندا دادەنیشتن و ئەویش خۆی لە باوەش داویشتن ئەگەر چوو لە کونیشەوە بە پێچەک و چۆڵەپێچ دەریان‌دەهێنا، لە هێندێک مەڵبەند بە تەماڵ دەڵێن دیاردی.

خۆشترین کاتی ڕاوەکەروێشک پاش بارانە. چونکە لانی تازە و کوێرە لە دوورەوە دیارە وا دەبێ کەروێشک لەو کاتەدا کۆنە لان دەکاتەوە کە ئەویش دۆزینەوەی بۆ ڕاوکەری شارەزا هاسانە، جگە لەوە بەر پێی تاژی کە ڕووت و بڵە نەرم دەبێتەوە و ترسی کاڵە دڕانی نامێنێ، بەرپێی کەروێشک کوڵکنە و قوڕ دەگرێ و باش ناتوانێ ڕابکا و پێی دەڵێن کەلاشە کردن، ئەو سەردەمە زۆری پێناچێ و وەختی نینۆکشکێن دێ، کەوشکەبەند پەیدا بوو و کەروێشک لانی بەرەژێری کردەوە و ڕەپستە و باغی پاوانی داوە بەرپەلامار هێند قەڵەو دەبێ کە دەڵێن گورچیلەی لە بەزیدا ون بووە. ئەمجار بەسەر زەوی بەسترا و ڕەقدا وا هەڵدێ هەر ویزەی لەبەر پێیدێ، تاژییەکی لە کاتی نینۆکشکێن و سیخوار لە پشتدا بگاتێ نایابە. کە نوا بەفری هەوەڵ کەوت و بارنی نەکرد باسی سەری کەروێشکە، چونکە شوێنی دەگەڕێ و بە پێشووی کورتەوە هەر دەرناچێ، ئەو گیاندارە بە ڕواڵەت گێل و گێژە کە زانی شوێنی دەگەڕێ زۆر فێڵەزان دەبێ، شوێنی جووتەیە، پاشووی بە جووت وەپێش پێشووی دەخا، ڕاوکەر کە تووشی ڕاستەشوێن هات، دەزانێ کەروێشک یا چۆتە شەو گەڕ یا گەڕاوەتەوە و بە پەلە دەیگێڕێ تا دەگاتە دوولایی، دوولایی ئەوەیە کەڕوێشک بەسەر شوێنی خۆیدا دەگەڕێتەوە، لە جێگایەک بازێکی بڵێند داوێ و لەسەر کەڵەکێک یا لە قەدی ڕەوەزێک دەکەوێ، دەبێ ڕاوکەر بە قەراغ دوولاییدا بڕوا و نەیشێلێ تا بزانێ کەروێشک لە کۆی بازی داوە و وریا بێ پاش ڕاو نەکا و بازرە نەبێ، هەزارە هەر وەک دوولایی وایە، بەڵام کەروێشک چەندین جار بە شوێنی خۆیدا هات و چۆ دەکا، وا دەبێ هەر لەنێو هەزارەدا دەکەوێ

وادەبێ دیسـان بـازێکی دوور داوێ و لـەهـەر جێگایـەک کـەوت مـات دەبـێ شـوێنگێڕی بـاش لـە فیـڵ و هـەزارە و دوولایـی کـەروێشـک دەگـا و دەیدۆزێتەوە.

کوتـە ئـەوەیـە کـە کـەروێشـک پـاش هـەزارە و دوولایـی بـەقـەد جـێ جێخوونێک بە دەورە دەگەڕێ و ئەوەندەی پێدا دێ و دەچێ کە کەس سـەر دەری لە شوێنی ناکا، ڕاوکەری شوێنگێڕ دەبێ زۆر بە سـەرنجـەوە دەورەی کوتە بدا کە نەڕۆیبوو، ئەوە دیارە لەنێو کوتەدایە ئـەودەم دەبێ وەنێو کوتـە بکەوێ، تا یا بیدۆزێتەوە یا ناچاری بکا هەڵێ. کە بـەفر زۆر بـوو و بـەفر بـە سەریش نەبوو کەروێشک ڕنوو بـەفر دەکۆڵێ و دەچێتـە نێو بـەفرەوە بـەوە دەڵێن خوزە، کەروێشک لە خوزەدا بەوە دیارە کە جێی هـەناسـە هەڵکێشانی زەرد دەبێ و دیارە، لێرەدا فیڵێک دەکا بە بن بەفردا ڕەهەندێک دەکۆڵێ و لـە چەند جێگا خوزە دیاری دەدا بۆ ئەوەی ئەو فیڵـەشـی لـێ ببڕن، یـەکێک بـە تاژییـەوە لـە نێوەڕاسـت ڕادەوەسـتێ و ئـەوانـی دیکـە خـوزەکـان دەشـێلن، کەروێشکی خوزە زیاتر ناوێرێ ڕابکا و بە دەستی دەگیرێ لـە پێشـدا گـوتم کەروێشک تا زۆری بۆ نەیە ناچێتە نێو کون کە چووە نێو کـون و دیـار بـوو و دەستی نەگەیشتێ، دارێکی نـەرم و درێژ دێنن سـەری لـەلـە دەکـەن و لـە تـووکی کـەروێشـکی بـا دەدەن و بـەم دارە دەڵـێن پێچـەک ئـەگـەر بـەوەش نەهاتـە دەر ئـەمجـار تەڵـەی لـێ دادەنێنـەوە و دەیگرن، لـە مـانگی ڕەشـەمـەدا ڕاوەکـەروێشـک دوایـی دێ، هـەم لاواز دەبـێ و بـۆ خـواردن نـابێ هـەم بـا دەگرێ، بـە ناوبـانگترین چێشـتێکی لـە گۆشـتی کـەروێشـکی دروسـت دەکـەن سـەنگە سیرە، لە کابانان بپرسن چۆن ساز دەکرێ!!!

# ڕاوە ڕێوی بە تاژی

کام منداڵی کوردە ناوی ڕێوی نەبیستبێ، سەدان ئەفسانە لەسەر ڕێوی لە فۆلکلۆری کوردیدا هەیە، خۆ لە پەندی پێشینیانیشدا ئەوەندە باسی ڕێوی کراوە هەر مەپرسە وەک:

ڕێوی خۆی لە کونەوە نەدەچوو، قانگەلاشی بە کلکیەوە دەبردە ژوور، ڕێوی دەمی نەدەگەیشتە ترێ دەیگوت ترشە، وەک ڕێوی کێچی دەکەولّی کەوتووە، وەک ڕێوی خۆی لە ئاوی خوڕ نادا، ڕاوی ڕێوی بۆ کەوڵیە و سەیری لە ڕاوە ڕێوی خۆشترە، وەک ڕێوی سیرمەخۆرە...

ڕێوی بە ڕاستی جانەوەرێکی فێڵاوی و مەکربازە، نەوسن و بەزەڕە، هەموو شت دەخوا میوە و گۆشت و شتی وا، دوژمنی کەروێشک و مشک و باڵندە بە تایبەتی باڵندەی پێڕۆیە ئەوەندەی کەروێشک بۆ باغەوان و وەرزێڕ خراپە ئەویش ئەوەندە بۆ ئەوانەی باڵندەی کەوی و ماڵی ڕادەگرن جێگای مەترسییە، تووشی ڕەوە قەلەموونێک بێ تاقی لێ دەبڕێ، مریشک و جووجک هەر ناهێڵێ، لە کێویش هەمیشە لە کەو سوێسکە و زڕەکەو و هەوێردە لە کەمیندا، تەنیا کاری چاکی خواردنی مشکی کێوی و بەچە کەروێشکە، بەلام ئینسان فێڵی لەویش دەبڕێ، بە ڕاستی ڕاوە ڕێوی سەیری خۆشە، ڕێوی لە کوردستاندا زۆرە، وەک دەڵێن ڕاوی بۆ کەوڵییە، دەنا گۆشتی

ئەگەرچی دەیخۆن زۆر دزێو و ناشیرینە، دەڵێن وەک گۆشتی ژووشک بۆ باداری دەرمانە.

بە ڕاستی هەقیانە ئەو کەسانەی دەڵێن سەیری لە ڕاوە ڕێوی خۆشترە، ڕاوە ڕێوی زیاتر بە پیادە دەکرێ، ڕێویش وەک کێوی کە ترسا هەمیشە تیرەگی کوو دەگرێ و بۆ کێوێکی دیکە دەپەڕێتەوە. دیارە ئەو لە کێو و شاخی زۆر ئەستەمدا تاژی لە هەموو جێگایەک تەنانەت لە دەشتی نەرمانیش هەیە، دوو دەستە کێومال کێوێک دەتەقێنن و هەرا و هوریایەکی زۆر دەکەن تا ڕێوی بترسێ، ڕاوکەرێک لە حاشارگەدا بەرەگەی لێ دەگرێ تا کێومالەکان ڕێوی وا دەتەقێنن بەسەر بەرەگەدا بکەوێ، ئەودەم بەرەگەگر تاژی تێبەر دەدا، تاژی زۆر کارامە و ئازا نەبێ ناوێرێ بە ڕێوی کە بێباز و بردە لەبەر تاژی دەرناچێ، بەڵام دەستی دەگەڵ دەکاتەوە، گازی لێ دەگرێ، بە نینۆک دەیڕنێ، تاژی کارامە هەوڵ دەدا لە پشت ئەستۆی ڕۆ بێ و ڕایوەشێنێ تا لە کاری دەخا یا لە قەفەزەی پشتی ڕۆدێ و هەڵیدەگرێ تا بڕستی لێ دەبڕێ. بۆ ڕاوەڕێوی پێویست ناکا تاژی خێرا بێ، ئەسڵەن تاژی رەشکوژ و چێ لە ڕێوی بەرنادەن تاژی ڕێویکوژ ئازا و قایم بێ باشترە نەک تیژ و گورج، دوڕە یا دووڕەگ بۆ ڕاوە ڕێوی باشترەو دووڕەگ وەک لە ناوەکەیەوە دیارە جسنە سەگێکە لە جووت بوونی سەگ و تاژی پەیدا بووبێ، جا فەرق ناکا گوڵ سەگ بێ یا تاژی، هەرچەند ئەگەر گۆڵ تاژی بێ دووڕەگ جوانترە، دووڕەگ لە باسکە سەگ ڕووتەتر و بەرزەلینگترە و لە پاش تاژی لە هەموو جسنە

سەگێک توندتر ڕادەکا، ئەی زۆر خێرایان لێ هەڵدەکەوێ کە بۆ ڕاوەکێوی و کەروێشک تەنانەت گورگیش بەکار دێ، تۆرەمەی دووڕەگ و تاژی، پێی دەگوترێ قەدەم.

ڕێویەکی پیری بەگەڕ     وەدەر کەوت بۆ لەوەڕ
ڕۆی بۆ دەوری گوندێک     خۆی گەیاندە سەر دوندێک
دیتی مراوی و مامر     لە بەرجگی بەربوو ئاگر
هاتوونە دەر بۆ لەوەڕ     زۆرن وەک مێگەلی مەڕ
زاری پڕپڕ بوو لە ئاو     فرمێسکی ڕژا لە چاو
چۆن دەستێکم بیانگاتێ     نەزانێ پوورەفاتێ
بە ماتەمات هاتە خوار     گەیشتە پۆلێ چنار
خۆی مات کرد وەک مردوو     هاتن جووچک سێ و دوو
لەپڕ لێیان دەرپەڕی     زگی سێ دانەی دڕی
تێری خوارد تەڕەکەباب     خۆی گۆشتکڕ و هەم قەساب

# ڕاوە ماسی



لە ڕابردوودا لەبەر ئەوەی چۆمەکان لە چوار وەرزی ساڵدا ئاویان تێدا بوو شتێکی سروشتییە هەر جێگایەک ئاوی لێ بێ ماسیی لێ هەیە دیارە گۆشتی ماسیش شتێکی بەلەززەت و خۆشە و ڕاوەماسیش سەیر و سەیاحەتێکی تایبەتی هەیە هەر بەو بۆنەوە خەڵک دەچوون بۆ چۆمەکان بۆ ماسیگرتن دیارە لە هەموو ناوچەکانی کوردستان چۆمی لێ هەبوو.

**ڕاوە ماسی چەند بەشە:**

**١- ڕاوی مەساسە:** ئەویش ئاوا بوو دارێکی درێژیان ساز دەکرد نزیکەی سێ تا چوار میتر سەرێکی ئاسنێکی پانیان وێدەخست، ئیتر کەسانێکی تایبەتی کە هەنگێوە بوون دەچوون بۆ چۆمەکان بەڵام دەبوو ئاوەکە ڕوون بێ دەچوون لە سەروە و لە بەرەوە بەردی تێباوین

بەوەیان دەکوت «تەقاندن» ئیتر کابرای مەساسە بە دەست لێی دەدان بەوەیان دەکوت ئەنگاوتن دەیکوشتن وەسەر ئاو دەکەوتن.

٢- **ڕاوی قوڵاغە:** ئەویش لە زستاندا بوو، کاتێک چۆم دەیبەست ماسی لەبن سەندەگیا یان کونێک کۆ دەبوونەوە بەوەیان دەکوت قوڵاغەیان داوە. ڕاوچی دەچوو سەهۆڵەکەی دەشکاند و بە دەستی لەو کونەی دەری دێنان جاری وا بوو لە کونێک یا سندەگیایەک نزیکەی دووسەد تا سێ‌سەد ماسی تێدا بووە و لێی گیراوە.

٣- **ڕاوی قولاپ:** ئەویش بەستەگی بە گەورەیی و چکۆلەیی هەیە، تێلێکی نووکتیژی قولاپدارە، ئەو ڕاوە بە سێ‌بەش دەکرێ: **یەک. ڕاوی چێشتە:** قولاپەکە هەویر یان خۆراکی دیکەی بۆ پێوە دەکەین قولاپەکە دەهاوییە نێو چۆم ماسییەکە دەم بۆ خۆراکەکە دەبا و لە گەرووی دەگیرێ و پێوە دەبێ و ڕاوچی دەیهێنێتە دەرێ.

**دوو. ڕاوی زەربەتی:** ئەویش ئەوەیە ماسیەکە دەبینێ قولاپەکەی دەهاوێ بۆ ئەوەی پێوە بێ، پێوە دەبێ و دەیهێنێتە دەرێ؛ جاری وایە بۆ دیتنەوەی مردووش کە لە چۆمەکاندا دەخنکێن ئەو قولاپە بە کار دێنن ئەو قولاپە سێ نووکی هەیە. **سێ. ڕاوی ڕیز قولاپ:** چەند قولاپ پێکەوە ڕیز دەکەی دەیانهاوییە نێو چۆمی ماسی دەمیان بۆ دەبا و پێوە دەبێ.

**قولاپ سێ جۆری هەیە:** ١- قولاپی سێ‌پەڕە کە سێ‌نووکە ٢- قولاپی دوو پەڕە کە دوو نووکی هەیە. ٣- قولاپی تەک نووک.



**تۆڕ و ماسی**

**٤- ڕاوی ماسی بە تۆڕ:** تۆڕ لە سیمێکی باریک نەخی یا پەلاستیکی ساز دەکەن، دیارە وەستای تایبەتی هەیە دەیچنن ئەویش سێ جۆریان هەیە: **یەک. تۆڕ دەستی:** ئەیش ئاوایە تۆڕەوان دەیهاوێتە نێو چۆم لەوێدا دەبێ وای بهاوێ بڵاو بێتەوە قەراغی تۆڕەکە ئاسنی قورقوشمی خڕی پێوەیە زوو دەنیشێتە سەرعەرز لە نێو ئاوەکەدا ئەو ماسییەکی وەبەری بێ لە نێو خۆی دەگرێ و لەگەڵ خۆی دەیهێنێتە دەرێ لەوێ ڕاوچی کۆی دەکاتەوە و هەڵی دەگرێ چونکە تۆڕی دەستی سەربەستی بن ئاواڵەیە. **دوو. تۆڕی لاگیرە:** ئەویش ئاوایە تۆڕێکی درێژ ١٠ یا ٢٠ میتر ئیتر وەک تۆڕی دەستی بە شێوەی بازنە یان سەربەست و بنبڵاو نییە بەڵکوو درێژ و پانە بە دوو نەفەر هەر یەک لایەکی دەگرن بە نێو چۆمیدا ڕایدەکێشن ئیتر ئەو ماسییەکی وەبەری بێ پێوە دەبێ و دەگەڵە خۆی دەیهێنێتە دەرێ ئەبەوە دەڵێن تۆڕی لاگیرە. **سێ. تۆڕی نانەوە:** دیارە تۆڕی داویشی پێ دەڵێن ئەویش زۆر

درێـژ و زەلامــە و زۆرتـر بـۆ ئـاوی زۆر و نێـو سـەد و دەریـا دەبـێ، ڕاوچی بە شەوێ دەچێ بە دوور و درێژی بڵاوی دەکا لـە ئاوێدا بـەوە دەڵـێن نانـەوە. هێنـدێک لـەو تۆپـە پـەلاسـتیکانەی پێوە هەڵـدەواسـن بـۆ ئەوەی ون نـەبێ وەبن ئـاویش نـەکـەوێ بـەیانی یان بە لۆتکە یان بـە قایقی مـاتۆڕی دەچـن دەری دێننـەوە ئـەوەی پێوەی بێ لێی دەکـەنـەوە ئەوەش تۆڕی نانەوە؛ جێگای وەبیر هێنانەوەیە ئەوە ئەندازەی گەورە و چکۆلەیی دەلاقەکانیان فەرقی هەیە لە یەک و نیو هەتا سەرێ هەیانە.

**٥- ڕاوی ماسی بە سەوەتە یا بە ماشە نانەوە:** ئەویش دوو بەشـە: **یەک** کابرای ڕاوچی زۆرتر لای ئێواران یان نیوەڕۆیان سەوەتەیەک یان ساقۆڕێک کە ئەو لە سەوەتە گەورەترە بە دەستەوە دەگرێ دەچێتە ئەو جێگایـەکـی لـە چۆمیـدا تـەنگـاو و خـوڕێن بـێ وەبـەری دەگـرێ ئـەو ماسـیەکـی هـات دەچێتـە نێـو سـەوەتـەکـەوە، بـەڵام دەبـێ یـەک نـەفـەر لـەبـەرەوە بـەردی تـێ بـاوێ کـە پێـی دەڵـێن تـەقانـدن ئـەو کابرایـە کـە سەوەتەکەی هەر بە دەستەوەیە و دەیگێڕێ لە نێو ئاو و گۆم و خوڕێن و تەنگاودا یا لەبەر هەڵدێردا «تاڤگە»، جـا ئـەو ماسییەکـی وەبـەری بێ دەچێتە نێو سەوەتەکە ئەوە بەشێکە لـە ڕاوی سـەوەتـە **ڕوونکردنـەوە: سەوەتە چییە:** سەوەتە لە شوڵی لاوێن یا بنتای داربی چۆمی دروست دەبێ؛ دەیبڕن و دەیکەنە باقە و بەستە بۆ ئەوەی چاک دابێ و نەرم بێ لـە ئـاوی دەخـەن وەسـتای تایبـەتـی خـۆی هەیـە دەیتـەنـێ پێـی دەڵـێن سـەوەتـەچنین دیـارە لـەو شـوڵە ئـەو شتانەی هـەمـوو لـێ سـاز دەکـەن سەوەتە، ساقۆر، سەلە، قەرتاڵە، زەنبیلە، تەیمان، غەڵەفی مێشـەنگووین،

چەپەر، بەڵام بەستگی بە باریک و ئەستووری شووڵەکەیە. **دوو** ڕاوی ماسی بە سەوەتە ماشەنانەوەیە، ئەویش ئاوایە لە جێگای خوڕێن و تەنگەبەری چۆمی دەهات ئەوبەرەو بەری چۆمەکەی بە بەرد هەڵدەچنن بە درێژایی چوار پێنج میتر جار دەگەڵ جار دیوارەکە لێک نزیک دەکەنەوە بە شکڵ و وێنەی سێگۆشە(موسەللەس) بەڵام لای باریکایی دەکەوێتە خوارەوە لەو جێگایەی کە سەری هەر دووک دیوارەکە وێک دەکەوێتەوە بەردێکی پان و درێژ لەبەر ئاوهەڵدێرەکە دادەنێن ئاوەکە دێتە خوارێ قەڵپەزەی دەکا بەسەر ئەو بەردەدا لەبەر ئەو قەڵپەزەوە سەوەتەیەک دادەنێن ماسی لە هەر لایەکی چۆمەکەوە بێ دەچێتە نێو سەوەتەکەوە چ لەسەرەوە بێ کە دیواری بۆ کراوە چ لە بەرەوە بێ چونکە پەسارە لەوێ مات دەبێ ئیتر نایەتەوە دەرێ ئەبەوە دەڵێن ماشەنانەوە یا ڕاوی ماسی بە ماشە دیارە ماشەنانەوە زۆرتر شەوانە دەبێ لە کاتی ماڵنووستندا دەینێنەوە تا مەلا بانگدانی بەیانی کە سۆفی دەچن بۆ نوێژ ئەوجار دەچێ دەری دێنێتەوە جاری وایە سەوەتە پڕ دەبێ لە ماسی.

**٦- ڕاوی ماسی بە ژەهر یا بە ژار:** گیایەک هەیە زۆرتر لە گوێچۆم و قەراغجۆگە دەڕوێ لە نێو قامیشەڵان و بیشەڵاندایە، لاسکەکەی بە ئەندازەی میترێک یا زیاتر درێژە گەڵاکەی وەک گەڵا بی دەچێ گوڵی زەردی هەیە نێوی گیایەکە ژارەماسیە زۆرتر لە وڵاتی کوێستان و گوێ چۆمەکان دەبێ شایەد نێوی دیکەشی هەبێ لە ناوچەکانی دیکە ڕاوچی دەچێ باوەشێک لەو گیایە دێنێ لە پەنا گۆمێکی

چۆمی کە پێیوایە ماسی تێدایە دەیکوتێ ئیتر لە چۆمەکە یان گۆمەکەی دەکا کە تێیان کرد ماسیەکە گێژ دەبێ ئەگەر گێژ بوو وەسەر ئاو دەکەوێ ئیتر بێ ئەوەی شوێنێک لەسەر گۆشتەکەی دابنێ یان وردەکەی بکووژێ چون دوای ماوەیەک وردەکە دێتەوە سەرەخۆ ئەوەش ڕاوی ماسی بە گیا یا ژەهر.

٧- **ڕاوی ماسی بە دەستی:** لە زستاندا ڕاوچی دەچووە چۆمەوە دەستەوانەی بەنی یەک شیشەی ئەستووری لە دەست دەکرد هەر دەستی دەبرد ماسی گیری دەکرد بە دەستیەوە دەیهێنا دەرێ، جاری وابوو زۆری دەگرت هەر بەدەستی ئەوەش ڕاوی ماسی بە دەستی.

٨- ڕاوی دیکەش هەیە کە زۆر خراپ و ناحەزە بە دینامیت و بەرق و کلۆر، ئەوە زۆرتر کە دەکرێ وەک جینایەت وایە چونکە دەبێتە نەسلکوژی، تۆو و ڕەسەنەکەی دەفەوتێ زۆری چۆمەکان ماسییان زۆر بوو بەوە فەوتان چونکە دوورەشارە و چاودێری ئیدارەی شکاربانی بە سەرەوە نەبوو بەڵام ئێستا زۆر وریان و پێیان ڕادەگەن نایەڵن کەس ڕاوی بەو شێوەیە بکا.

# بنەڕەتی مەتەل یا ئامۆژگاری

## سوڵتان مەحموود و هەیاس



لە ڕابردوودا زۆر بەیت و حکایەت هەبوون کە وێژەوانان و دەنگخۆشانی کوردەواری کۆڕ و کۆمەڵیان پێ گەرم دادێنا و دەڕازاندەوە لە دیوەخان، مزگەوتان، ماڵان، جاری وابوو دێبەدێ دەیانبردن تا پێیان بڵێنگوێیان بۆ ڕاگرن یا لێیان فێر بن؛ جا ئیوا بوو پێوەندیی بە کورد و نەسلی کوردەوەش نەبووە وەکوو بەیتی عەبدولڕەحمان، یوسف و زولەیخا، غەزواتنامە یان شێخی عارەبان. هەرچەند بەڕێز کاک سەلاح ئاشتی پێیوایە شێخی عارەبان کورد بووە یان وەکوو حکایەتی سوڵتان مەحموود و هەیاسی خاس، ئەمیر ئەرسەلانی ڕۆمی، ڕەسوەغوول، ڕۆستەم و سوهراب، شێرۆیە، برزوویە و چەندین بەیت و حکایەتی دیکە کە هێندێکیان لە کورد نەبوون و ئی کورد نەبوون، بەڵام چونکە وەرگەڕابوونەوە سەر زمانی کوردی زۆر

لە کۆڕی کوردەواریدا دەکوترا و دەبیسترا وەک فەرهەنگێکی کوردی لێهاتبوو دیارە ئێستاش شاعیران و دڵسۆزانی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی لێیان وەردەگرتن کۆیان دەکردنەوە دەیان نووسینەوە وەکوو بنەڕەتی مەتەڵ چاویان لێدەکەن و دەیان لێنەوە بۆ ئەوەی ون نەبێ و نەفەوتێ و بمێنێ جا ئێمە چەند مەبەستێک دەنووسین و باسی دەکەین کە هەم لەوانەن کوتراون با لەبەین نەچن و هەم کەمێک ئامۆژگاریی بۆ ژیانی مرۆڤ تێدایە تا پەند و ڕەوشتی لێ وەربگرین ئیشاڵڵا.

یەکێک لەوانە ژیانی پێکەوەی سوڵتان مەحموود و هەیاسی خاسە. لە پێشدا لازمە ئێمە ئەو دوانە بناسین و جێگا و شوێنیان بزانین. پێش هەموو شتێک ئەوە بزانین هەیاس نێوی دروستەکەی ئەیازە، هێندێک دەڵێن ئەیاز هەمان نەفەری ڕەشی حەبەشەیە و هێندێکی دیکە دەڵێن هەیاس هەمان هەباسە زۆر نزیکە کورد بووبێ بۆیە زۆرتر نەقڵ و نەزیلەکانی هەمیشە لەسەر زمانی کوردەکانەوە بووە. هێندێک دەڵێن لە نەتەوەکانی دیکە بووە. بەڵام بۆ هیچ لەوانە دەلیلی مێژوویی و نەقڵیمان لە دەستدا نییە ئەوەی دیارە بۆ تامو بۆن خۆشکردنی حکایەتەکان و گەرمکردن و کۆ بوونەوەکان شاخو باڵیان لێناون و بۆیان ساز کردوون. بۆ نموونە دەگێڕنەوە لە حکایەتێکدا سوڵتان مەحموود و هەیاسی خاس لە شاری بەغدایەدا دەگەڕان ئەسڵەن ڕەنگە ئەوانە بەغدایان هەر نەدیبێ، چونکە غەزنەین جا غەزنە لە کۆیە و بەغدا لە کۆیە!. بەڵام دیارە داستانەکان بووە و کوتراوە و گەڕاوەتەوە و زۆرتر

له نێو کوردەواریدا خەڵک گوێی بۆ ڕاگرتووە، دەنا لە نێو نەتەوەکانی دیکەش حەتمەن بووە و هەیە. با سوڵتان مەحموود باش بناسین.

ئەبولقاسم مەحموود بنی سەبوکتەگین لە ساڵی ٣٨٩-٤٢١ ه.ق ناسراو بە سوڵتان مەحموود غەزنەوی پادشای سەر زنجیرەی غەزنەویان بووە. دەڵێن بوونی سوڵتان مەحموود بە پادشا ئاوا بووە. ڕۆژێک لە ماڵێ هیچیان نابێ بیخۆن‌و سازی کەن زۆر برسی دەبن. سەبۆکتەگین دەڵێ: دەچم بۆ ڕاوی بزانم شتێک پەیدا ناکەم بۆ منداڵەکانی بێنمەوە تا لە برسان نەمرن. دەڕوا بۆ ڕاو و زۆر لە کێو و بەندەن دەگەڕێ و هیچ پەیدا ناکا تا خەریک دەبێ ناهۆمێد دەبێ، بەرەو ماڵ بگەڕێتەوە لە پڕ تووشی ئاسکێک دەبێ و بێچوویەکی بەدووە دەبێ ئەویش هەلینگیان دەداتێ بە سواری، دایکەکەی هەڵدێ بەڵام بیچووەکە لەبەر سنگی ئەسپەکە دەرناچێ، سەبوکتەگین دەیگرێ تا بیهێنێتەوە ماڵێ بۆ منداڵەکانی سەر بڕێ. هەرئەوە کە دەیگرێ و دەیهەوێ بیهێنێتەوە دایکەکەی وەدووی دەکەوێ هەر تەمەشای سەبۆکتەگین دەکا و تەمەشای بەچکەکەی دەکا سەر لە حەوا دەکا و نووزەی لێوە دێ و ئاوی بە چاویدا دێتە خوارێ ئاخر تا نزیک دەبێتەوە لە شار و هەر بەو حاڵە بەدوویدا دەڕوا بە زمان‌حاڵ لەبەری دەپاڕێتەوە بێچووەکەی بۆ ئازاد کا لە پەنا ماڵان دەڵێ وەڵڵاهی منداڵەکانی من لە برسان بمرن چاکترە تا ئەو بێڕوحمییە بکەم بێچووی ئەو بێ‌زمانە سەر بڕم. لەوێ بێچووەکەی بۆ ئازاد دەکا و بەڕەڵای دەکا ئیتر ئاسکە خێرا بەچکەکەی لە باوش دەگرێ تێرتێر دەی‌لێسێتەوە دواتر سەر لە حەوا دەکا دەنووزێنێ بە مەزەندە دەپاڕێتەوە و دوعا دەکا بۆ سەبۆکتەگین. سەبۆکتەگین بە دەستی خاڵی دێتەوە. منداڵ لە برسان

بـەرەوپیـری دەچـن بـەڵام هیچـی پـێ نـابێ لـەو مشـت و مـڕەدا دەبـن کابرایەکی غەریبە دێ دەڵێ هـانێ نـان‌و گۆشـتم بۆ هێناون خـودا ئـەوە دەگەیـەنـێ شـەوێ دەیـدا بـە خانـەوادە. کـە شـەو دەخـەوێ لـە خـەودا پێی‌دەڵێن سەبوکتەگین بە هۆی ئەوەی ئەتۆ بەزەییت بەو ئاسکەدا هات و ڕوحمت پێ کرد و بێچووەکەیت بۆ بەڕەڵا کرد و ئازادت کرد خودا تۆش لە تەنگانە ڕزگار دەکا و لە بنەماڵەی ئێوە پادشا پەیدا دەکا لە فەقیر و دەستتەنگی نەجات‌و دەبێ جا دەڵێن هۆی ئەوەی کە بنەماڵەی غەزنەوی بوون بە پادشا ئەو کارە چاکەو بە ڕوحم‌و دڵی سەبوکتەگین بوو کە بـەزەیی بـە ئاسکە و بێچـووەکەیـدا هـات. بۆیـە پێغـەمبـەر(س) دەفـەرموێ کـەسێک ڕوحمـی هـەبێ خـوداش ڕوحمـی پێدەکا. سـوڵتان مـەحمـوود گـەورەتـرین ناسـراوی بنـەماڵـەی غـەزنـەویـان بـووە دیـارە پیاوێکی ڕەشید و زانا و فەرمانڕەوایەکی بە دەسـەڵات سـەردارێکی نـەتـرس‌و نـەبـەز بـووە و هـەوەڵـین نـەفـەرێک بـوو کـە لـەژێـر وڵاتـی بەردەستی خۆی نێوی سوڵتانی بۆخۆی هەڵبژارد لە نێوی خەلیفە لایدا، مەرکەزی فەرمانڕەوایی ئـەو شـاری غـەزنـە بـووە مـەرکـەز ئیمپراتـۆری ژێر دەسەڵاتی وی- وڵاتی ئەفغانستان- بەشێکی زۆر لـە ئێرانـی ئـەوڕۆ و بەشێک لە هیند و بەشێکیش لە پاکستانی ئەمڕۆیی بووە.

# گیسکی هەیاس



هەیاس دوو ژنی دەبێ یەکیان خزمی دەبێ یەکیش بێگانە و هەم ماوەیەکی زۆر دەبێ خزمەتی سوڵتان دەکا دەڵێ بزانم ئەگەر گوناحێکم کرد چاوپۆشیم لێدەکا یان نا. پادشا بەرانێکی دەبێ و دەچێ بەرانەکەی پادشا دەدزێ دەیبا لە جێگایەک دەیشارێتەوە دێنێ لەسەر وێنەی ئەو بەرانە بەرانێک سەر دەبڕێ و لەکن ژنەکانی بڵاوی دەکاتەوە، ئەوە بەرانی پادشایە دزیومە و سەری دەبڕم دوای ماوەیەک عەمدەن دەگەڵ ژنەکانی بە شەڕ دێ ئەوەی کە خزمێتی زۆریش بۆی خراب دەبێ بەڵام دەنگ ناکا. ئەوەی دیکە لێی دەپەڕێتە سەربانی هاوار دەکا ئەوە تۆ دەتەوێ وەک بەرانەکەی پادشا سەرمان بڕی و کەس نەزانێ. قسە بڵاو دەبێتەوە بە گوێی سوڵتان مەحموود دەگا.

«نیش دوست از نیش عقرب بدتر است

پس بزن عقرب که دردش کمتر است»

بانگی هەیاس دەکا دەلێ ئەوە ئاشکرا بوو کە تۆ بەرانەکەت دزیوم دەبێ بڕۆی لە ملکمدا نەبی دەرت دەکەم. ئەویش دەڵێ: پادشا ئەوە تاقیم کردییەوە ها بەرانی خۆت هەر ماوە بۆی دەباتەوە و دەڕوا دەڵێ قەرار بێ نەیەمەوە تا بۆخۆت نەیەی بە شوێنمدا. زۆر دەڕوا تا دەچێتە جێگایەک دەبێتە ئاشەوان جا چونکە فێری دەست و فەرمان ببوو لەوێش وابوو. بە یەکی دەکوت تێکە، وەسەری کە، بیماڵەوە، وردە، درشتە، نۆبەت نییە، ئاشی بە تاڵە، کاکە بڕۆ ئاش میزتی، ڕۆژانە ئەوە کاری بوو. پادشا زۆری بیر کردەوە لە حەولدا بوو چۆنی ببینێتەوە بانگی حەسەن مەیمەندی کرد و تەکبیری پێ کرد ئەویش کوتی پادشا زۆر دوور نەڕۆیشتووە هەر لەو نزیکانەیە، بێنە هەرچی ڕەعیەتی دەورووبەرە ماڵە گیسکێکی بەسەردا بڕە بۆت بەخێو کەن بە ماوەی ٦ مانگ بەڵام فەرمان بدە قەڵەو بێ، هەر جەریمەی دەکەم کز بێ، هەر جەریمەی دەکەم؛ دەبێ لە قەوامی خۆی بمێنێ پادشا ئەو کارە دەکا دروست گیسکێکیش وەبەر ساحەبی ئەو ئاشە دەکەوێ کە هەیاس ئاشەوانیەتی، بەو دەستوورەی گیسکی بۆ دادەنێن. نابێ لە ماوەی ئەو ٦ مانگەدا نە زیاد بکا و نە کەم، کابرا زۆر نارەحەت دەبێ و بە غەمباری دێتە کن هەیاس نەقڵەکەی بۆ دەگێڕێتەوە ئەویش دەڵێ خەم مەخۆ بچۆ بێچووە گورگێکم بۆ پەیدا کە. دەچێ بێچووە گورگێکی بۆ دێنێ، لە شەممەوە تا پێنجشەممە زۆر جوان بەخێوی دەکا ڕۆژی پێنجشەممە و جومعە ڕۆژێ جارێک بێچووە گورگەی نیشانی گیسکە دەدا ئیتر دەیهێنێتەوە میزانی خۆی تا ٦ مانگ نە زیاد دەکا و نە کەم.

دوای ٦ مانگ دەچن گیسک کۆوە دەکەن یان کەمیان کردووە یان زیاد، ئەو گیسکە نەبێ نە کەمی کردووە نە زیاد، ئیتر ئەبەوە هەیاس دەبیننەوە. پاشا دەچێ دەیهێنێتەوە، هەیاس بۆی مەعلووم دەبێ کە خزم چاکترە لە بێگانە بۆیە قەدیمی کوتوویانە: «حەوت ساڵ بکەی بێگانە پەرستی، ئاخری هەر دێنێ شکەستی». بەڵام خزم گۆشتیشت بخوا، ئێسکت ناشکێنێ یانی دڵی هەر بۆت دەسووتێ. ئیتر هێنای ژنە تازەکەی کە بێگانە بوو تەڵاقی دا و ژنە کۆنەکەی کە خزمی خۆی بوو بە حورمەتێکی زۆرەوە هێشتییەوە. ئەوەیە نەقڵەکەی گیسکەکەی هەیاسی خاس.

## هەیاس و کابرا پیرە

جارێک هەیاس و سولْتان لێیان دەبێ بە کێشە. پادشا لە هەیاس توورە دەبێ و دەڵێ بڕۆ نەیەوە بە ئێرەدا هەتا بەرماڵم بۆ نەهێنی لە خوری نەبڕاوە و کفتەشم بۆ نەهێنی لە گۆشتی نەکوتراوە. هەیاس زۆر نارەحەت دەبێ و لە داخان سەری خۆی هەڵدەگرێ و دەڕوا لە ڕێ تووشی پیاوێکی پیر دەبێ و دەڵێ مامە بۆ کوێ دەچی ئەویش جوابی دەداتەوە دەڵێ دەچمە ئەو دێیەی ئەودیوی ئەو کێوە. دەڕۆن پێکەوە دەگەنە بن هەورازی. هەیاس دەڵێ مامە وەرە با پلەکان یان نەردیوان دروست کەین لەو سەرەو ژوورە، پیرە لێی تورە دەبێ و دەڵێ بڕۆ مالت نەشێوێ بۆ نەزانی، پلەکان لەو هەمووە چون دروست دەکرێ. هەیاس بێدەنگ دەبێ تا دەگاتە ڕەپستەیەک کابرا پیرە دەلێ ئەو ڕەپستەیە جوانە. هەیاس دەلێ: بەڵێ ئەگەر شینخۆر نەکرابێ. کابرا پیرە هێندێکی دیکە پیش دەخواتەوە ئەوجار دەگەنە چۆمێک هەیاس دەڵێ مامە وەرە پرد دروست کەین. دیسان کابرا پیرە لێی تورە دەبێ و دەڵێ: بڕۆ بۆخۆشت نازانی دەڵێی چی ئەوجار دەگەنە دێی ماڵە کابرا پیرە، کابرا لە هەیاس دەپرسێ میوانی کێی؟ هەیاس دەڵێ: تۆ نا مزگەوت. دەچێ بۆ مزگەوت و کابرا دەچێتەوە ماڵێ. کچێکی عازەبو عاقڵی دەبێ. بابی دەڵێ لەگەڵ کابرایەکی زۆر ناحاڵی بووم بە ڕەفیق،

کەس نەیدەزانی دەڵێ چی. کچەش لە بابی دەپرسێ بابە چی کوت؟ بابیشی لە نووکەوە بۆی گێڕاوە کچەش کوتی بابە خۆ ئەو کابرایە زۆر عاقڵە، دەبێ بچی دەعوەتی کەی ئەوە کە لە هەورازی کوتوویە وەرە با نەردیوان دروست کەین یانی وەرە نەقڵێک، نەزیلەیەک بگێڕینەوە تا وا دەکەین سەر دەکەوین و تەواو دەبین لە هەورازی و زۆریش ماندوو نابین. ئەوەش کە کوتوویە ئەو ڕەپستەیە ئەگەر شینخۆر نەکرابێ. زۆر جووتبەندە عادەتی وایە بەر لەوەی گەنم بگاتێ دێنێ شینەکەی سوود و سەلەم دەکا، پێشفرۆشی دەکا. ئەگەر وەختی خەلەو خرمان هات قەرزدار دێن هەمووی لە جەواڵی دەکەن دەیبەنەوە بۆخۆیان ئەبەوە دەڵێن شینخۆر، چون بە شینی فرۆشتوویە بۆخۆی هیچی بۆ نەماوە، بەشی نانو تۆوی خۆی بۆ نەماوەتەوە. ئەوەش کە لەسەر چۆمی کوتوویە وەرە پردی دروست بکەین جا خۆ بابە ئەوەش قسەیەکی باش بووە، مەنزووری ئەوە بووە ئەتۆ پیری ناتوانی لە چۆمی دەی؛ وەرە ئەمن لە کۆڵت دەکەم ئەوەش پردە. دەی بابە چیدی دەکوت. چووزانم قسەی ئەوەندە هەڵیتو پڵیتی دەکوت لە هەورازی ماندوو بووم کوتم سیغارێکی تێدەکەم نەیهێشت دەیکوت ئێرە بە کەڵک نایە نابێ لە هەورازی بکێشی تووتنێ. کچەش کوتی خۆ بابە ئەوەش زۆر قسەی چاک بووە. ئەوە نییە قەدیمیەکان کوتوویانە پیاوی عاقڵ ٣ کار مەکە زەرەر دەکەی. یەک قەت لە هەورازی مەڵێ کوتنێ، دوو قەت بە بایە مەکێشن تووتنێ سێ قەتماڵیشت نەچێتە کن ماڵەبابی ژنێ. چون ئەگەر لە هەوراز گۆرانیت کوت بۆت نایە پشوت سوار دەبێ. دوو

ئەگەر بە با سیگارت کێشا دووکەڵەکەی بە سەر و چاوی خۆت و هاوڕێکانتدا دەچێ. سێ ئەگەرماڵیشت چووە کن ماڵە بابی ژنێ، ژنە ئی تۆ نییە، ئی دایکو خوشکو ئەوانەیە. دەی بابە چیدی کوت؟ کوتی وەڵڵا ئەگەر هاتینە نێودێ کوتم میوانی کێی ئەویش کوتی تۆ نا مزگەوت، چوو بۆ مزگەوت. کچە کوتی بابە حەقی بووە ئەوەندە ڕەفیقی تۆ بووە خوڵقت نەکردووە، ئەویش کوتوویە ماڵە ئێوە نا مزگەوت. ها بابە نان و پێخۆری بۆ بەرەو بڵێ بۆ سبحەینێ نیوەڕۆیە میوانی خۆمان بی. ئەوە ٣٠ نان دەگەڵ ١٢ هێلکەی کوڵاوت بۆ دادەنێم، بۆی بەرە بەڵام هەرچی کوتی بیگێڕەوە. کابرا پیرە ڕۆیی بۆ مزگەوتی هەر لە ماڵە خۆیان ڕەد بوو زۆری برسی بوو هێنای ٣ نان و دوو هێلکەی کردە بابۆڵە و خواردی، چوو بۆ هەیاسی دانا و کوتی بۆ سبحەینێ نیوەڕۆیە میوانی ئێمەی. ئەویش کوتی باشە بەڵام کە تەمەشای نان و هێلکەکانی کرد هەیاس کوتی وەڵڵا نە ساڵ ١٠ مانگە و نە مانگیش ٢٧ ڕۆژە. هاتەوە بۆ کچەکەی گێڕاوە کوتی ئاوای کوتووە. کچەش کوتی بابە ئەوە ٣ نانو و دوو هێلکەت لێ خواردووە. کابرا پیرە کوتی: ئەرێوەڵڵا. بۆ سبحەینێ هەیاس هات و کچە زۆری حورمەت لێ گرت. دوایە کوتی تۆ کێی و لە چی دەگەڕێی؟ دوایە نەقڵی خۆی بۆ گێڕاوە و کوتی پادشا حوکمی لێ کردووم بەرماڵم دەوێ لە خوری نەبڕاوە و کفتەشم دەوێ لە گۆشتی نەکوتراوە. کچە کوتی جا ئەوە ئاسانە، بڕۆ لە بازار بەرانێکی قەڵەوم بۆ بکڕە و بیهێنەوە. چوو بەرانێکی گەورەی هێناوە بە دەستی و شانەی سەری خوری لە

بـەرانـەکـە دادەڕنـێ و بـەشـی بـەرمـاڵی بـۆ سـاز کـرد و هـەر دووک گونەکانیشی دەرێنا و بۆی کردە کفتەی نێو تاوە، هەرکی دا دەستی بە هەیاسـی کـوت هـا ئـەوە بـەرمـاڵ لـە خـوری نـەبڕاوە. ئـەوەش کفتـە لـە گۆشتی نەکوتراوە. ئـەویش بۆ پادشـای هێنـاوە پادشـا کوتی خـودا بـە قوربانی ئەو کەسەت کا کە ئەو عەقڵەی فێر کردووی. ئـەوەش هـەیاس و کابرا پیرە.

## هێلکە هەمووی هەر تامێکە



جارێـک هـەیاس دڵـی بـە ژنـی هاوکـارێکی خۆیـەوە دەبـێ کـە زۆر جوان و لایقە، لە هەلێک دەگەڕێ کە مێردەکەی لە ماڵ نەبێ و بچێ بە هەڵکـەوت. ڕۆژێـک پادشـا دەینێـرێ بـۆ سـەفـەر. هەیاسـیش هـەلـی بـۆ هەڵدەکەوێ دەچێ بۆ ماڵە هاوکارەکەی ژنە بەرەو پیری دێ، جێگای بۆ ڕادەخا ڕێزێکی زۆری لێ دەگرێ و نەهاری بۆ ساز دەکا پێنج هێلکـەی بۆ دەکـوڵێنێ ڕەنگیـان دەکـا. سـوور، زەرد، شـین، کـەسـک، سـپی بـۆی

دادەنیٚ زۆر بە پوختی هەیاس تەمەشایان دەکا و دەڵیٚ: ئەوە هەموو هەر هێلکەن؟ ژنەش دەڵیٚ: بەڵیٚ هەمووی هێلکەن. دەڵیٚ دەیجا باشە ئاخر هەر تامێک نین فەرقیان چییە بۆ ڕەنگت کردوون؟. دەڵیٚ: ئاخر خۆ ژنیش هەمووی هەر تامێکە، ئەدی تۆ بۆ وەدووی نامووسی خەڵکی دەکەوی لە حاڵێکدا بۆخۆت ژنت هەیە. ئیتر هەیاس دەڵیٚ تۆبە تازە شەرتە وەدووی نامووسی کەس نەکەوم، ئەتۆش خوشکمی ئەو قسەی تۆ بووە ئاڵقە لە گوێمی دەکەم. ئەوەش هێلکە هەمووی هەر تامێکە.

## ئارامی دوو منداڵ

جارێک هەیاسو سوڵتان مەحموود بە نێو شاریدا دەگەڕێن چاویان بە دوو منداڵ دەکەویٚ دەستیان لە ملی یەکتر کردووە یەکتر ماچ دەکەن نێوانیان زۆر خۆشە. سوڵتان دەڵیٚ: هەیاس ئەوانە نێوانیان خۆشە خۆزگەم بە خۆیان کا. هەیاس دەڵیٚ: پادشا هیچیان لەبەیندا نییە بۆیە. ئێستا بزانە چۆنیان بە شەڕ دەدەم. دوو قرانیان بۆ داویٚ دەڵیٚ گویٚپروسقێنەیە هەر کەس هەڵی گرتەوە بۆخۆی. هەر دووک بۆی هەڵدێن ئەو دەڵیٚ بۆ من، ئەو دەڵیٚ بۆ من دەست لە قژی یەکتر دەنێن خەریک دەبیٚ لەسەر ئەو دوو قرانە گوێی یەکتر هەڵقەنن. ئەوجار هەیاس دەڵیٚ: پادشا نەمکوت هیچیان لەبەیندا نییە بۆیە ئاوا ئارامن،

بزانە براش ئەگەر تەماع و ماڵی دونیا هاتە گۆڕێ، نێوانیان تێکدەچێ و وەک یەک نامێنن. ئەوەش ئارامی دوو منداڵ.

## ئەمن پیاوێ تۆم

جارێک سولْتان مەحموود دەستوور دەدا بە ئاشپەزەکەی کە هێلکەو باینجانی بۆ لێنێ. ئاشپەز بۆی لێدەنێ و زۆری پێخۆش دەبێ و پێیدا هەڵدەڵێ و تەعریفی دەکا و دەڵێ زۆر خۆش بوو. کابرای ئاشپەزیش هەر تەعریف دەکا و دەڵێ خۆش بوو. ڕۆژی دواتر هەر داوای ئەو چێشتە دەکاتەوە، بەڵام ئەو ڕۆژە سولْتان زۆری پێ ناخۆش دەبێ زۆری زەم دەکا، کابراش زەمی دەکا. سولْتان لە ئاشپەزەکە تووڕە دەبێ و دەڵێ تۆ دوێنێ هێلکە و باینجانت بۆ لێنابووم ئەمن زۆرم تاریف کرد و پێیدا هەڵکوت ئەتۆش زۆرت تاریف کرد بەڵام ئەمڕۆ ئەمن زۆرم زەم کرد ئەتۆش هەر زۆرت زەم کرد ئەوە هۆی چییە؟ کابرای ئاشپەز وە جواب دێ و دەڵێ: پادشا ئەمن پیاوی تۆم خۆ پیاوی هێلکە و باینجان نیم تۆ چ بڵێی ئەمنیش ئەوە دەڵێم.

## خۆت هەر خۆتی لە بیرت نەچێ

دەڵـێن جارێـک شــەیتان و شــۆفار چوونــە بنهــەنگــەڵی ســوڵتان مەحموود دەکەڵیشەیان وەشاند کە هەیاس بە تۆ خەیانە. هەموو ڕۆژێ دەچێ لە غەزنە و عەنباری پادشا شتی بە وەزن سوکوو بە قیمەتگران دەدزێ و دەیباتەوە خەزێنەی خۆی. دڵیش گوشتە، سوڵتان دڵی لێی پیس بوو ئـەمری کرد بردیانـە گرتوخانـە لـە پاشـان بۆخۆی و چـەند وەزیر چوون دەرکی عەنباری هەیاسیان ئاواڵـە کرد جگە لـە دەستێک لیباسی شوانی نەبێ هیچی لێ نەبوو، هەموو سەرسام بوون و سەریان سووڕما. سوڵتان ڕووی لـە دەست و پێوەندان کرد و کوتی کێ بـەو سووڕە لێی دەزانی؟ کوتیان نەخێر. ناردی لە دووی هەیاس کوتی هەتا پادشا نەیە لە دووم، نایەمەوە. سوڵتان چوو هێنایە دەرێ کوتی هەیاس هەموو شتێکم بۆ ڕوون بۆوە، پێم بڵێ ئەو جل و بەرگە شوانییە چییە؟. کوتی پادشا ئەگەر لە بیرت بێ وەختێک هاتمە خزمەتت ئەو بەرگانەم لەبەردا بوو بۆیە لەو جێگایەن ڕۆژێ جارێک دەچم و سەری لێدەدەم هەتاکوو ڕیشە و ڕەگەز و ڕەسەنی خۆم لـەبیر نـەچێتـەوە بـا وەزیـر و کۆک و پۆشتە و خاوەنی تالار و قەڵا و باڵەخانە بم. ئـەمن دەبێ هـەر خۆ بەو شوانە بزانم کە بووم. **ئەوە نییە قەدیمی کوتوویانە ڕەحمەت لە قەبریان دەڵێ قەل لاسای کۆتری کردەوە ڕەوتی خۆشی لەبیر چۆوە.**

# بەرەکەتی خودا دەگەڵ دڵە

جارێک سوڵتان مەحموود و هەیاس دەچن بۆ ڕاوێ، زۆر دەڕۆن ماندوو دەبن لە دوورەوە چاویان بە بەروو بێستانێکی جوان دەکەوێ دەڵێن با بچین وچانێک بدەین تاوێک وەحەسێین و دەمێکیش تەڕ کەین و کاڵەک و شووتی بخۆین. دەچن بۆ کن بێستان و بانگی کابرای بێستانچی دەکەن؛ ئەویش حورمەتی زۆریان لێ دەگرێ و شووتی و کاڵەکی چاکیان بۆ قاش دەکا و بۆ دێنێ زۆریان پێ خۆش و بە کەیف دەبێ، دوایە کە دەڕۆن. پادشا دەڵێ: هەیاس ئەو زەمینە و زەوییە زۆر چاکو بە پیتە بۆیە ئەو کاڵەکو شووتییە ئاوا خۆشن، ئەوە حەیف نییە ئی ئەو کابرا پیرە بێ وا چاکە لێی بستێنم ئەو زەوییە بۆ کاڵەک و شووتی بۆ من چاکە. دەڕۆن ڕاوەکەیان تەواو دەکەن، دێنەوە کە پێی بڵێن بڕۆ لێرە، لێتدەستێنین. دادەنیشن، دیسان داوای کاڵەک و شووتی دەکەن ئەویش بۆیان دێنێ بەڵام وەک دوێنێ خۆش نابن پێیان سەیر دەبێ پادشا دەڵێ مامە ئەوە تامی کاڵەک و شووتییەکەت گۆڕاوە. کابراش زۆر عاقڵ دەبێ دەڵێ: قوربان دڵی تۆ گۆڕاوە دەنا کاڵەک و شووتی من نەگۆڕاوە. تۆ دەبێ دڵت نەگۆڕی ئیتر پادشا ئەوجار بە ملکی دەیداتێ و قەباڵەکەی بۆ دەنووسێ ئەوەیە بەرەکەت دەگەڵ دڵە.

# کابرای جۆلا

جارێک شەوێک سوڵتان مەحموود و هەیاس بە شاریدا دەگەڕان لە دوور نوورێکیان دیت کە چوونە پێشێ دیتیان پەنجەرەیەکی چکۆلەیە کابرایەکی جۆلا بەو شەوە درەنگە جۆلایی دەکا هەر ویرەی دێ و گۆرانی دەڵێ. سوڵتان کوتی: هەیاس ئەو کابرایە بۆ بەو شەوە خەوی نایەو هەر دەنگی دێ. هەیاس جوابی داوە کوتی: قوربان دڵی خۆشە. پادشا کوتی: جا بە چی ئاخر ئەوە شوغڵ و پیشەکەیەتی ئەوەش خانوماڵەکەیەتی. هەیاس کوتی: قوربان ژنەکەی ژنی چاکە بۆیە دڵی خۆشە. پادشا کوتی: با بچین تاقی کەینەوە چوونە بەر دەرکی تەقولبابیان کرد هاتن دەرگایان لێ هەڵگرتن ئەگەر چوونە ژوورێ جۆلا ژنێکی لە پەنا دانیشتبوو لە جوانیدا کەموێنە بوو و لە عەقڵ و حورمەتیشدا نموونە بوو بەینێک دانیشتن. دواتر جۆلا کوتی: عافرەت میوە بێنە. هەستا چوو شووتی هێنا. جۆلا کوتی: ئەوە خراپە بچۆ یەکی دیکە بێنە ژنە چوو یەکی دیکەی هێنا. دیسان جۆلا کوتی: ئەوەش بە کەڵک نایە بچۆ یەکی دیکە بێنە چوو یەکی دیکەی هێنا و داینا بێ ئەوەی تورە بێ ژنە هەر دەیکوت بەڵێ. دوایی سوڵتان‌و هەیاس هەستان و ڕۆیشتن. هەیاس کوتی: پادشا دیتت ئەو ژنە چەندە بەسەبر و بە حورمەت بوو دەگەڵ مێردەکەی سێ جاری ئەو شووتییە پێدا ناردەوە هەر یەک شووتیش بوو، بێ ئەوەی توورە بێ یا مێردەکەی بشکێنێ بڵێ هەر ئەو شووتییەمان هەیە یان بڵێ بۆ هێندەم دێنی و دەبەی. جا ئەوە جۆلا ئەو ژنەی هەیە بۆیە هەر ویرەی دێ و خەوی نایە.

# کابرای سێ ژن

جارێک کابرایەک بۆ شکایەت لە ژنەکانی هاتە کن سولّتان بۆ ئەوەی دادی بپرسێ. کابرا سێ ژنی هەبوو. کوتی قوربان سێ ژنم هەیە، بە قسەم ناکەن بۆم خراپن پادشا ئەمری کرد بە هەیاس بچۆ ئەو ژنانەی بۆ تەنبێ کە. هەیاس چوو هەر سێکی بانگ کردن لێی پرسین ئێوە عەیبو چییە وا مێردەکەتان شکایەتی لێ کردوون؟. یەکیان کوتی: قوربان ئەمن حیز بووم بەلاّم تۆبە بڕیار بێ تازە نەچمەوە سەر ئەو ڕێگایە و خەیانەت بە مێردەکەم نەکەم. دووهەم کوتی: قوربان ئەمن دز بووم شتم لە مالّێ دەدزی، بەلاّم تۆبە لێمان گەڕێ با ئابڕوومان زیاتر نەچێ شەرت بێ نەچینەوە سەر ئەو ڕەفتارە. سێهەم کوتی: قوربان ئەمن بێحەیا و زماندار بووم. هەیاس کوتی: تۆ عیلاجت نایە؛ بە کابرای مێردی کوت ئەو دوانە تازە لە ئاوی شەوی پاکتر دەبن، ئاگات لێیان بێ و دەگەلّیان بژی و بە چاویاندا مەدەوە؛ بەلاّم ئەو زماندارە چارەی نییە تەلاّقی دە بە کەلّک نایە.

## پاشەرۆک

پێویستە ئەوە بزانین چ بە پێی نووسراوەکان و چ بە وتەی ڕابردووەکان و گێڕانەوەی سینە بە سینەی کوردەواری ڕابردوویەکی جوان و هەستی هاوکاری و پڕ لە داب و نەریتی بە کەڵک و مێژووداری هەبووە و هەیە و ساحەبی فەرهەنگێکی دەوڵەمەند و بایەخدارە. چونکە وڵاتێکی پڕ پیتە، پڕە لە خواردەمەنی خۆوڵاتی و گیا و سەوزی ناوچەیی و خۆڕست و کوێستانی دەوڵەمەند و زەوی و زاری بە بەهرە و کاروباری ئاژەڵداری و وەرزیڕی هەر بە شێوەی کۆمەڵ و کۆمەک دەکرا و جێبەجێ دەبوو. زۆرجار خەڵک بە هۆی یەکدڵی و خۆشەویستی کارەکانیان پێکەوە کردووە و بەڕێوە بردووە وەک لە پێشەوە زۆری لەوانە نووسراوە. جا لەبەر ئەوەی لێرەدا جێگای نووسینی بە دووروودرێژی زۆر مەتڵەب و مەبەستی دیکە نییە کە ماون و ماوە نادا و ناگونجێ. ئەوە بە سەر سەری ئیشارە دەکەم بە هێندێک لەوان کە بە ڕاستی فەرهەنگ و کلتوری کۆنی کوردەوارین ئیشاڵڵا لە داهاتوودا ئەگەر مەرگ مۆڵەت بدا و عومر ڕێ بدا دەیان نووسم تا بەرەی داهاتوو حیسابی تەنبەڵی و کەمکاریمان لەسەر نەکەن چونکە چ لە باری شۆخی و جەفەنگ و سەیر و سەیاحەتەوە و چ لە باری بەشی ئابووری و وەرزێڕی و گیا و سەوزی و میوەجاتەوە

ناوچەی کوردستان بێنیاز و سەربەخۆیە و لە ڕوانگەی کاروباری پێکەوە بوون و بەشی کۆمەڵایەتییەوە کورد فەرهەنگ و کلتوری تەواو بێ کەم وکەسری هەبووە و هەیە. دیارە لە پێشەوە بە پێی زانین و توانین و دوای گەڕان و سووڕانی چەند ساڵ و ماندوویی ئێرە و ئەوێیەکی زۆر بۆ ناوچەکانی کوردستان لەم لا و لەو لا و لە پیرەپیاوان و بە ساڵدا چووەکان و لە کۆنە نووسراوەکان بە دووروودرێژی بە پێی زانین بیبینمەوە و بیبیستمەوە و بینووسمەوە. و ئەوەش چونکە جێگا نەماوە و بوار نییە بە کورتی و سادە و بە ئیشارەیەک دەیخەمە خزمەت سەروەران و خوێنەرانی عەزیز و بەڕێز، بەڵام لە داهاتوودا و ئەوانە و چەند کار و کەرەسە و شتی دیکە لە کاری کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی کوردەواری و داب و نەریتی و ڕێوڕەسمی وڵات ئی منداڵان و پیاوان دەنووسم ئیشاڵڵا. بە هیوای ڕوحمی خوداوەند و دۆعای بەخێری بەڕێزان.

**پاشەرۆک چییە:** زۆرجار خاوەنباغ و بێستان و گەنم و دەغڵ و دان و دانەوێڵە کە هاوین یا پایز تەواو دەبوون بە یەکێک لە ماڵە خزم و جیران و فەقیرێکی نێودێ دەڵێن بچۆ کرو کاش و چنگ و چۆنێک بکە دەگەڵ منداڵەکانت لەو جێ پەرێز و باغ و خرمانەی ئێمە بەشکم شتێک پەیدا بکەی زۆرە بۆ منداڵەکانت. ئەوانیش دەگەڵ موونات و ورکە و ڕەش و ڕووت و سەر و پێچکە و برسی و توونی خۆی دەچێ لەو جێگایانە خرمان و سەرکۆتەڵ و کوێزر و بنکە، یان نێوباغ و بندار و سەر لقوپۆی و جێمشتاغ و نێوچارداغ و پنگەڵ و ئەو جێگایانەی

که پاشەرۆکی لێ بەجێ مابێ، وێ دەکەون بەشی خۆیان دەبیننەوە و هەڵدەگرنەوە و کۆ دەکەنەوە و دەیهێننەوە. لە لکوپۆپ و پەل لە گوێز و ڕەز و میوەجات جاری وایە زۆریان وەگیر دەکەوێ و پێدەبڕێ ئەبەوە دەڵێن پاشەرۆک یا کوڕوکاش. یان جاری وابوو ئەگەر بێرەدۆشی دەوڵەمەند حەیوانی زۆر دەبوو چەند سەرێکی بۆ ماڵێکی فەقیر کە بزنیان کەم بوو، چەند بزنی بەجێ دەهێشت. پێیدەکوت ئەو چەند سەرە بزنە یا مەڕە پاشدۆکە یانی بۆخۆتانی بدۆشە ئەبەوەش دەڵێن پاشدۆک.




١. **هەگبە**: هەگبە حاجەت و کەرەسەیەک بوو بۆ هەڵگرتنی شتومەک و پووڵ و پارە و نەغدینە دروست دەکرا لە پاش تەرکی زینی وڵاغی سواری دەبەسترا و قایم دەکرا لە ڕابردوودا کەسانێک کە ئەهلی ساتوسەودا و خاوەنی پووڵ و پارە و زێڕ و جەواهیرات نەغدینە و پووڵی سپی بوون لە هەگبە، یەغدان، سەندووق پووڵ، مجری ئەستەنبووڵی یا ئیسفەهانیاندا هەڵدەگرت و کەسانێک کە دەچوون بۆ سەفەری دوور و درێژ وەکوو سەرۆک عەشیرەت، سەرۆک هۆز،

سەرداری عێل، گەورەی ماڵە دەوڵەمەندان هەگبەیان دەگەڵە خۆ دەبرد تا ئەوەی کەس دەستی پێ ڕاناگا و زەفەری پێ نەبا. دیارە ئێمە بۆ پاشتەرکی وڵاغی سواری، ئەوانەمان هەبوو، هەگبە، پاشکۆ، خورجێن. ئەوانە لە مووی بزنەموو لە خوری مەڕی، هەڵکەوتووە لە مەرەز و لە کورکی موو ساز کراوە، تەونگەر دەیتەنی. ئەوە وەکوو ڕیسی دیکە سێتا بوو دەکرا بە ماشەر بە «کولوو» بە گوڵۆڵە، هەڵدەوێزندرا و ڕەنگ دەکرا لە کن خمگەر «ڕەنگڕێژ» دەبردرا بۆ کن تەونگەر دەکرا بە کر و هەگبە. جاری وابوو سادە دەکرا، جاری واش بوو وەکوو مافوورە دەیانتەنی. ڕیشۆڵە و گوڵینگ و زارکبەندی قفڵیان هەر لە خۆیان بۆ دروست دەکرد و دوو زارکی هەبوو لە دوو لاوە بە دیوی کولۆمتی ماین یا ئەسپدا دەهاتە خوارێ بە گوڵینگ و ڕیشۆڵە بەنێکی ڕەنگاو ڕەنگی جوان کە هەر لە خۆی بوو بۆی ساز دەکرا لە پاشتەرکی وڵاغی لە بن قەڵپووزی زینی بە قووشقوونی ڕەقەی زینەوە دەیان بەستەوە تا دەگەیشتە مەنزڵ. جا دیارە هەگبە و خورجێن زۆر کەرەسە و پێویستی دیکەی تێدەخراو و پێی هەڵدەگیرا. وەکوو نان و پێخۆری سوارەکە یا جۆ و ئالکی وڵاغەکە و چەک و تەقەمەنی. یان سوار کە لە شاری دەگەڕاوە ئەو پارچە و کوتاڵانەی دەهێناوە و تێیداویشت وەکوو: حەریر، قوتنی، مورسایی، شەبەق، قەنەوز، تاق، قەمەردۆن، دیگەناڵ، دەنا ساچمە و تەرەقە، باڕووت، جگەرە و قوتوو و توتن و پووش و ئەستێو بەردی ڕاوچی تێدەخرا واش بوو هەگبە هەڵگری نامە و شیعر و نووسراوە و ژیان و مێژووی پیاوەگەورەکان

بوو چون هاتوچۆ هەر بە وڵاغی سواری بوو لە هەر حاڵدا هەگبە کوڕی تەنگانە، برای ڕۆژی لێقەومان، خەنجەری بەرپشتێن بوو. فریای خاوەنەکەی دەکەوت دەستی دەگرت و وەک خوانی پێشخانەی وا بوو لە بەردەمی حازر بوو. جا بۆیەش ئەو کتێبە نێوی نراوە بە هەگبەی بنار چونکە لە هەموو ڕەنگ و دەنگ و چیمەن و خرتە و پرتە، قسە و کەلتوور و کەلەپوور، فەرهەنگ و نێو و نێوبانگ، هەوا و هیوایەکی تێدا کوتراوە و نووسراوە بە نێوی «هەگبەی بنار».



**٢. خورجین:** زۆرتر بەو حاجەتەیان دەکوت کە لە کن تەونگەر بە دوو تایی ساز دەکرا، ئەویش زۆر جاران وەک مافووره دروستیان دەکرد هەر تەونگەر لایەکی ئاڵقەی ئاسنی وێ دەخست لایەکەی دیکەشی بەنێکی ڕەنگا و ڕەنگی وێ دەخست. ئەگەر خورجێن نەبردرابا بۆ سەفەر زۆرتر ئەویش شتی قیمەتی، پوولی سپی و نەغدینەیان

تێداویشت بەو بەنە و ئاڵقەیە سەراوسەر گرێیان دەدا، دەیانهێنا لە پشت دیزە و گۆزەی هەرزاڵیان دەهاویشت و هەڵیاندەگرت ئەگەر بەر و پشتی مافووره(فەڕش) بایە، مشک نەیدەبڕی یان درەنگی زەفەر پێدەبرد. ئەوەش خورجێن.



**تێڕ**



**٣.پاشکۆ:** دیارە پاشکۆ هەر ئەوە بوو کە لە پاشتەرکی وڵاغیدا دەبوو، زۆرجار پاشکۆ پاشتەرک دەبوونە یەک چونکە جاری وابوو سواری وڵاغ و یەکسم نەفەرێکی دیکەیان دەگەڵ بوو یان نەفەرێکیان دەبرد یان کوڕێک کچێکی هەڵدەگرت دەیانکوت هاویشتیە پاشتەرکی خۆی ڕفاندی و بردی. یان ئەرێ سوار ئەو شتەت بۆ هەڵدەگیرێ لە

پاشتەرکی خۆت؟ بەڵێ دەیهاویێمە پاشکۆی خۆم. دەیهێنا بە دوو بەن قایمی دەکرد ئەوەش پاشتەرک. ئێمە بۆ سەڵتە و کێوەوان ئەوانەشمان بوو: تووچێن، کۆڵەپشت، بەرکۆش.تووچێن لە زۆر جێگا بە توربێن دەڵێن چونکە تۆویان پێدەچاند و لە هێندێک جێگا بە تێڕیش دەڵێن تووچێن، جاری واش بوو توو بە چارەکە، بەرهەڵبێنە و پارچەی دیکەشیان دەچاند. توو، تۆوی گەنم و جۆ و دانەوێڵەیە کە بۆ کشت و کاڵ دەیچێنن. بەرکۆش لە پارچە و لە مووش دروست دەکرا. گیاهەڵقەن و کێوەوان دەیانبرد بۆ کێوی وەکوو توورەکە دروستیان دەکرد دوو لکی درێژیان هەر لە خۆی بۆ ساز دەکرد لە پشتی نەفەرەکە بە یەکەوە گرێیان دەدا و زارەکەی ئازاد و ئاواڵەیە؛ گیاهەڵقەن هەر گیایەکی هێنابای گنگر، گێلاخە، قازیاخە و ڕێواس و کارگ و کوڕادە و گیاسالمە هەرچی با تێیدەکرد ئەگەر پڕ دەبوو خاڵی دەکرد لە کۆڵەپشتەکەی دەهاویشت هەتا ئەویش پڕ دەبوو جا ئیتر ئەگەر ولاغ و تێڕی پێبا لەوی دەهاویشت و بەرەو ماڵ دەگەڕاوە دەنا ئەو کۆڵەپشتەی بە کۆڵدا دەدا و دەهاتەوە بۆ ماڵێ، ئەوەش بەرکۆش بەڵام کۆڵەپشت ئەوە بوو کە ئەو گیا و کەرەسەی تێدەخست و دەیهێناوە بۆ ماڵێ. کۆڵەپشت دەگەڵ کۆڵکێش جودایە، کۆڵکێش ئەوەیە: گوێنی، قەنگەلاشک، گیا و دار و چرپی بە کۆڵ دێنێ یان جاری وایە ماڵ و کەرەسەی قاچاق لە حدوود و سنوورەکان بە کۆڵ دێنێ بۆ ئەوەی دەنگی پڕمە و حیلە و سمی ولاغی نەیە تا حەرەس و کێشکچی نەزانن و نەیانگرن ئەبەوانە دەکوترێ کۆڵکێش.

## ٣. با توربێنی شوان باش بناسین




توربێن زەرف و حاجەتێکە کە کەرەسە و شتی تێدەخەن و تێیدا دەبەن بۆ سەفەر و کێو و بەر مەڕی و تۆوی تێدا دەچێنن شیر مەشکی تێداوێن بە کۆڵی دەدەن بۆ ماڵێ دوای مەڕدۆشین. توربێن لە خوری مەڕی، جاری وایە لە مووی بزنیش سازی دەکەن. مەڕ دەبڕنەوە خورییەکەی دەشۆنەوە و دوای ویشک بوونەوە بە شانە دەکرێ دواتر هەڵی دەوێژنن پێیدەڵێن **کەلوو**. ئیتر بە تەشی دەیڕێسن دیارە دەبێ ئەستوورتر بڕێسرێ لە جاجم و بووزوو و بەرماڵ دوای ڕستن دوو لۆی دەکەنەوە جا بای دەدەن دواتر بە جۆرێک هەڵی دەوێژنن کە بەوە دەڵێن **ماشەر**. ئیتر دەیبەن بۆ کن خمگەر و ڕەنگڕێز ڕەنگی دەکن بە ڕەنگی ڕەنگاو ڕەنگ ئەوجار دووبارە هەڵی دەوێژنن بەسەر یەکدا بەوە دەڵێن گلۆڵە و دەیبەن بۆ لای تەونگەر وەسەر تەونی داوێن دروستی

دەکەن بە شکڵی لاکێش«موستەتیل» کاتێک دروست بوو دیارە توربێن بە بەنی سادەش دەبێ هەر ڕەش و سپی و بە بەنی ڕەنگا و ڕەنگیش دەبێ. دوای دروست کردنی لە کن تەونگەر دوو لای پێکەوە دەدروون بە شێوەی سێ گۆشە «مووسەللەس» دەورەکەشی بە گوڵینگ و ڕیشۆڵی جۆرا و جۆر دەڕازێنەوە، دوو پەت یا بەنی ڕەنگا و ڕەنگی بۆ دەهۆننەوە هەر لە بەنی خۆی لە دوو لاوە لە گۆشەکانی دەبەستن بۆ ئەوەی لە شانی یا لە ملی ببەستێ و پێوەی گیر بێ و ئەوەی تێداوین نەڕژێ و نەکەوێتە خوارێ.

## ٤. توربێن چی پێدەکەن




دیارە توربێن کەرەسەیەکە بوو هەر کەس بۆ سەفەر دەچوو دەیبرد دەگەڵە خۆی شتی پێدێنا و شتی تێدەکرد لە جێگای ساک و جانتاو چەمدان و کیفی ئەوکات بوو. جووتیار دەیبرد تۆوی تێدا دەچاند کوێستانچی دەچوون گیای کوێستانیان پێ دێناوە، هەور دەیگرماند کارگ هەڵدەتۆقی دەیان برد بۆ کارگ، پڕیان دەکرد و دەیان هێناوە

بێری دەیبرد بۆ کێوی نانی پێخۆری شوانی تێدا دەبرد لەو لاشەوەش شیرمەشکی پڕ لە شیری تێداویشت و دەی‌هێناوە. شوان دەیبرد بۆ مەڕی ئەگەر مەڕ شەو بە کێو نەبا و هاتباوە ماڵێ بە ڕۆژ هەر توربێنی دەگەڵە خۆی دەبرد بۆ مەڕی، شوانیش ئەوانەی پێ بوو و هەر لە توربێنی داویشت، چەقۆ، دەرزی و دەزوو، گۆرەوی و پۆزلووخ، نان و پێخۆر، شیرێژ و ڕۆن و کولێرە چەورە، دەزبێنی مەڕی، قەند و چایی، قەرەوانە، شەمچە یا چەرخ، ئیستیکان و پیاڵە، لەو لاشەوە گیا و گژ و گیا و شیرێژ و گیادۆکلێو و هەرچی با لەوی داویشت و دەی‌هێناوە و ئەگەر مەڕ و بزنیش زابان بەرخ و کارژیلەی لەو داویشت و دەی‌هێناوە بۆ ماڵێ. ئەو توربێنە بۆ شوان هەڵگری هەموو شتێک بوو دیارە ئەو کتێبەش بۆیە وا نێو دەنێن توربێنی شوان هەموو جۆرە مەبەست و مەتڵەبێکی جۆرا و جۆری تێدایە بێ موناسەبەت و بێ‌ڕەبت نییە کە ئەو نێوەی بۆ داندراوە وەک وی هەڵگری شتی ڕەنگاو ڕەنگ و جۆراو جۆرە. دەگەڵ توربێن تێریشمان هەیە بە تێڕ دەکوترێ شۆلەکە، هۆڕ و بە توربێنیش دەکوترێ توربەرە، توومەرە، تووەرە.

٥- **سرێش کردن:** سرێش گیایەکە لە وڵاتی شاخ و کوێستان پەیدا دەبێ و دەڕوێ و بە پۆل دێتە دەرێ و بڵند و پان و شینە، وەک شەستپەڕ یا کەوەر، بەڵام کەمێک لە کەوەر پانترە زۆرتر لە بەری نسێ و حەوشەمەڕدا دەڕوێ، گەڵاکەی پێی دەڵێن **خوژە** بۆ دۆکلێو خۆشە و سووریشی دەکەنەوە بنەکەشی سرێشە هاوینان دەچوون بە

دەستەجەمعی دەیانهێنا ویشکیان دەکرد لەبەر تاو سریشیان لێ ساز دەکرد. دیارە سریش بۆ چەسپ، بۆ بووزو نانەوە بۆ جەڕڕاحی و شکستەبەندی پیاوان و حەیوان بۆ سەحافی کتێب بە کاریان دێنا.



٦- **گێوژ(گۆیژ):** ئەویش لە پێشەوە باسمان کردووە چەند جۆری هەیە و میوەیەک خۆڕسکە و پێویستی بە ئاودان نییە زۆرتر لە بەرقەد و لاپاڵ و جێگای نمدار دەبێ دارەکەی بڵیند و تۆپەڵکەیە. خۆشی و گەڵاکەشی تایبەتمەندی دەرمانی زۆرە بە تایبەت گێوژەزەردە و گێوژە سپی. دارەکانی ئەوانەن: گۆیژ حەوت جۆری هەیە: ١-گۆیژە مۆرە ٢-گۆیژە زەردە ٣- گۆیژە سپی ٤- گۆیژە سوورە ٥- گۆیژە تاڵە ٦-گۆیژە کوڕکوژە ٧- گۆیژە گایانە(زلە)، ٨- گۆیژە ڕیخە ٩- گۆیژە ڕەشبەڵ ١٠-گۆیژە هەویرە ١١ـ گۆیژە بزنە. ئەوانە جۆری گۆیژن.

٧- **گەڵ یا گەڵاکردن:** بە هۆی ئەوەی لە وڵاتی لێڕەوار تفاق و گیا کەمە خەڵک بۆ حەیوان و پاتاڵ گەڵیان دەکرد. هەرکەس گەڵا جاڕی خۆی

هەیە دەچوون هەڵیان دەپەرتاوت و هەر لەسەر دارەکە دەیان کردە تەرمەک بۆ زستان، حەیوانیان بۆ دەبرد بۆیان دەخست بەوەیان دەکوت دانگەی گەڵا. ئەو دارانە کە تەرمەکە گەڵاکەی لە سەرە بۆ حەیوانی دەخەنە خوارێ و دانگەی بۆ دەخەن ئەویش گەڵاکە دەخوا دار و



**جاڕەگەڵ**

چیلکەکە دەکەنە سوختو و سووتەمەنی ئەو حەیوانەی دەچێ بۆ ئەوێ ڕەشانگ، بزنەموو، گیسکەموو، کوور، نێری، خرت، بزن بەو دارە هەڵدەگرێ چونکە بزن نەخسە قەدیمی کوتوویانە کەسێک زۆر بەدفەر و بزۆز و نەحاواوە بێ **پێی‌دەڵێن بڕۆ دەڵێی شیری بزنت خواردووە** جا بزن بەو دارەدا دەڕواتە سەرێ، بۆیە زۆر نەقڵ بۆ بزن دەڵێن. **دەڵێن بزن ئەگەر ئەجەلی هات نانی شوانی دەخوا. دەڵێن شاخی بزن لە پێش‌دا چاوی سێحەبی دەردێنێ یا دەڵێن بڕۆ دەڵێی بزنی ئەوەندە بزۆزی. یا دەڵێن بڕۆ دەڵێی بزنی بە بالە بالت سەری خۆت و دەور و**

**بەرت بە فەتەڕات دەدەی.** جا دەڵێن ئەگەر مێگەل دەڕوا لەسەر شوان و حەوشە یا بڕ دەبێ گورگ بە بالە بالی بزن



**بەڕوو بە دارەوە**

دەیان بینێتەوە و دەیانخوا. داری نزار و لێڕەوار کە بە داری جەنگەڵ و سەختەدار بە ناوبانگە سێ بەشە:١- مازودار ٢- داری شەکی ٣- داری ویوڵ. داری مازوو و داریش هەیە بەتەنێ نزیک بە ٧ بەر دێنی: ١. گەزۆ ٢.مازوو٣. بەڕوو ٤. قەشقە ٥. گزگڵ ٦. تسقوڵ ٧. خرنووک. دیارە بەرەگەڵاشی هەیە و گەڵاشی لێ دەکەنەوە بۆ حەیوان لە تایەی دەدەن بۆ زستان هەر لە نێو نزارەکەدا کە گەڵی پێدەڵێن ئەوانە بەری داری مازوودارن کە هەر یەک بۆ جێی خۆی بۆ شتێک و دەرمانێک بە کاری دێنن. کاتێ گەڵا ئاخر مانگی هاوین بوو ئەوەی کە دەکرێ بە گەڵا بۆ حەیوان سێ بەشە **یەکیان** بڕی یا بڕدراو، پێیدەڵێن ئەوەیە ئەوساڵ کردراوە و بڕدراوە و ساڵێکی دیکە ئەوە نابڕنەوە **دوو** کوری پێدەڵێن ئەوەیە کە پارەکە بڕدراوە **سێ** خرتی پێدەڵێن ئەوەیە کە چەند ساڵ لەوە پێش بڕدراوە ساڵی داهاتوو ئەو دوانە دەبڕن. بۆ

حەیوانێ گەڵاش لە داری مازوودار دەکرێ. مازوو دوو جۆری هەیە مازووی شین و مازووی سپی. دەبێ ئەوەش بڵێین گەڵا زۆرتر بۆ حەیوانی ڕەشانگەی وەکوو بزنەموو، کوور، خرت، نێری.



**داری مازوودار**

٨- **گەزۆ:** ئەویش بە کۆمەڵ دەچوون کچ و کوڕ بۆ گەزۆ کردن، گەزۆ بەری مازوودای شەو لە داری وێوڵ و شەکیش پەیدا دەبێ. دیارە گەزۆ بۆ گەدە و کارکردنی ڕیخۆڵە باشە گەزۆیان لەگەڵ کولێرە و دەگەڵ ڕۆن و بە کاڵیش بە نانەوە ناشتایان دەیخۆن لەسەر سفرە.

٩- **بنێشت:** ئەویش چەند جۆری هەیە لە بنێشتە تاڵ بنێشتی شیرن پەیدا دەبێت ئەویش ئی دارەبەنە. بنێشتە تاڵ و قەزوانی لێ پەیدا دەبێت. بنێشت وەستاکاری تایبەتی خۆی هەیە دەیبڕێ و بریندار دەکا پاشان

بە قورِ کۆجیلەی بۆ ساز دەکا و جا بنێشت دەردەکا و دەچێتە نێو کۆجیلەکەوە بنێشت و قەزوان بە هەموو بەشەکانیانەوە بۆ مەعیدە زۆر باشن و ئەگەر زۆری بخۆی بۆ زگ کارکردن هەر زۆر باشە و بۆ ئاوی زاری و تەڕی گەروو بەکەڵکە.



**دارەبەن لە حاڵی بڕینی بۆ بنێشت**

لە قەدیمدا حەکیم بە بنێشتەتاڵ ماجومیان ساز دەکرد بۆ سارێژکردنی برین، ئێستاش دەڵێن جانەوەری کێوی(بوونەوەر) بە تایبەت مار و کەو کە جێگایەکیان بریندار دەبێ دەچن خۆ لە بنێشتەتاڵ هەڵدەسوون، چاک دەبێتەوە. دیارە قەزوانیش دەگەڵ چێشتی دەکەن و دۆشی پێ جوان و خۆش دەکەن ترشی دەکا. ئاخر بەری قەزوان زەرد و زولالە هەڵی دەگرن بۆ شەوچەلەی زستانێ. لە هاوینان‌دا بنێشت ساز دەکرا تا پایزێ دوو جار سێ جار ئەو کۆجیلەی پڕ دەکرد و بەتاڵیان دەکرد دارەبەنیش چەند جۆری قەزوان دەدا: یەکیان هاوینان دەیخۆن بە کالی دەگەڵ دۆی دەکەن بە شینی، دۆ ترش و خۆش دەکا.

ئەوەیتر پایزان زەرد دەبێ وەک کاکڵەگوێز بۆ شەو چەلەی زستانێ دایدەنێن دەیخۆن. جۆرێکیکەش دەکەن بە تەسبێح، تەسبێحی قەزوان قیمەتییە.



**ئامادەبوونی دارەبەن بۆ بنێشت**

**١٠- گوریس و کەژوو هۆنینەوە:** ئەوانە بە کۆمەڵ دەکران و دەبوو چەند نەفەر بن تا دروستیان دەکرد یەک گوریس کەرەسەیەکی باریک و درێژە جاری وایە دەگاتە ١٠ میتر تا ١٥ میتر، بۆ شەغرە، گوێنی کێشان، تفاقکێشان، کاکێشان، دار و چرپی بە عەڕابە، بە گوێدرێژ بە کۆڵ بەکاریان دێنا لەوی چکۆلەتر کە کورتترە پەتکی پێ دەڵێن ئەویش وەک گوریس سازی دەکەن بەڵام چکۆلە و نابوودەیە دەیکەنە پەتی سەوەتە. ئەوە نییە کە کەسێک لەماڵێدا بێدەسەڵاتە یا لە جێگای دیکە هیچ کارە نییە دەڵێن وەک پەتی سەوەتە وایە یان سەرەپەتیش تەواو

نییە. دووهەم کەژوویە پانترە لە گوریس ئەویش بە چەند نەفەر ساز دەکرێ و ڕەنگاو ڕەنگیشە نەقشی تێدەخەن زۆرتر ڕەش و سپیە ئەویش بۆ پاڵووی گوێدرێژ، یەستر، و بارگین بە کاری دێنن و هەم بۆ بەستنی باری قاچاغی و ڕێگای دوور کە پێی دەڵێن «قەیاسە» لەگەڵ برێک قایش کەڵکی لێ وەردەگرن بۆ وڵاغدار و قاچاخچی. ئەوانە لە بەرگی بزنەموو ساز دەکرێ ئێمە لە پێشەوە باسمان کرد بزنە مەرەزمان هەیە و بزنەموو. بەرگی بزنەموو ئەوانەی لێ ساز دەکەن: گوریس، کەژوو، تێڕ، هۆڕ، جەواڵ، توربێن، ڕەشکە، تاینچە، پەتک، گوێلەو ساری گوێلک؛ پەتی وڵاغ بەستنەوە لە تەویلە و لە کێوی، هاوساری وڵاغ(گوێدرێژ)، دەسکە ڕێشمەی وڵاغە بەرزە(ئەسب)، گوریسی مەشکە، جا چ ئی سێپەکە بێ، چ ئی مەشکە هەڵاواسین بێ بە بن میچەوە. دیارە ئەوانە بە کۆمەڵ و دەستەجەمعی دەکرێن.

**١١- گوێز تەکاندن:** دیارە گوێز بۆ هەموو کەس ئاشنایە، ئەوەش دەگەڵ ئەوەی کە دەبوو دارەوانی تایبەتی هەبێ، بەڵام بە گەلە کۆمەک دەکرا و دەتەکا کە پێیان دەکوت گوێز تەکاندن. گوێز ئەویش بە هەرەوەز و پۆلو گەلەکۆمەگی دەکرا.

**گەیشتنی گوێز:** لە هەوەڵی پایزەوە دەستیان پێدەکرد تا تەواو دەبوو جاری وابوو دوو مانگی گرتووە.



**داری گوێز**

**نەمامی گوێز:** نەمامی گوێز بە چەند جۆرە بە ڕیشە، بە گوێز و دەنگ بە کاکڵیش دەبێ و گوێز بە ساڵێک کە گوێز و ڕیشەی تازە پەیدا بووە، بە ٣ ساڵ بە ٥ ساڵ بە ٧ ساڵ دێتە بەر. عومری داری گوێز تا دوو سەد ساڵ جاری وایە زیاتریش دەبێ. گوێزە گەورەی نجنێی بانە، گوێزە ڕەشەی باغی کوشێنی ئاجیکەندی دەگەڵ گوێزە سپی باغی ئینگیجەی سەردەرئابادی بۆکان ڕەنگە زۆر لە دوو سەد ساڵ زیاد بن عومریان کە نێژراون و چاندراون.

**بەری گوێز چەند بەشە:** گوێزی چکۆلە، گوێزی گەورە، گویزی کاکڵی، گوێزە کوێرە، گوێزی کاغەزی و چەندی دیکە.

**گەڵای داری گوێز** بۆ نەخۆشی قەند دەبێ کە لە ئاودا بیکوڵێنی و ئاوەکەی بخۆی بۆ بۆنخۆشی بە دەستەوە بێ. بۆ لەسەر هاڵاندن کە ژن سەری لە خەنە دەدا لە بن لچکەوە خەنەکەی پێوە نانووسێ.

**تێکوڵی گوێز:** کە دێتە گەیشتن و تەکاندن تێکوڵەکەی لێ دەبێتەوە و بەری دەدا جا ئەو تێکوڵە بۆ ڕەنگ دەبێ و خمگەر لە کاری دەکا. بۆ دەگەڵ خەنەی سەری دەبێ چاکتری ڕەنگ پێ هەڵدێنێ و مووی سەری ڕەش دەکا.

**داری گوێز:** گوێز دارەکەی گەورەیە سێبەری زۆرە بەڵام بۆ لەبەن خەوتن چاک نییە چونکە سێبەرەکەی قورسو گرانە و لەشی بنیادەم دادەگرێ.



**گوێز لە کاتی تەکاندندا**

**تەکاندنی گوێز:** وەک کوتمان لە هەوەڵی پایزدا دەست پێدەکرێ نەفەر یا زەلام دەیتەکەنێ پێیدەڵێن دارەوان، گوێزتەکین و گوێزەوان و شەنیار. ئەوەی پێیەتی و گوێزی پێ دەتەکێنێ بەوەش دەڵێن چەڵاگ، قەڵەنگ، دارگوێز، و شەنە.

**سوودەکانی کاکڵی گوێز:** گوێز بۆ خواردن لەسەر سفرە ناشتایان لە خورێنی چەوری خوێن کەم دەکاتەوە. گەدە ڕەوان و لەش بەهێز و پیاوەتی زیاد دەکا. کاکڵی گوێز بۆ گەڵ ئەو چێشتانە دەبێ بۆ خواردن:

کفته، گیپه، ترخێنه، موتەنجەنه، باقلاو لوقمەقازی، مەشکەفی، کولیچە، مێوژ و گوێز شەوچەلەی شەوانه.



**داری گوێز**

**١٢- ئەسپۆن:** دیاره له ڕابردوودا فاف و سابوون شامپۆ و ئەو کەرەسانەی پاک و خاوێنی ئێستا نەبوون، خەڵک هەر کەڵکیان له ئەسپۆن وەردەگرت ئەسپۆن زۆرتر له کوێستانەکان و له بەری بەڕۆژ دەبێ گەڵاکەی گیایەکی سەوز و گەڵا ورده زۆر وەک گەڵای گێزەر دەچێ بەڵام بنێکی دوور و درێژی هەیە له ساڵدا زۆرتر بەینی هاوین و پاییز خەڵک دەچوون دەیان هێنا، هەڵیان دەخست لەبەر تاوێ ویشک دەبوو به دەستار لێیان دەکرد بۆ لیباس شوتن و سەر شوتن و هەر شتومەکێک کەڵکیان لێ وەردەگرت. ئەسپۆن دەڵێن ئەو تایبەتمەندییانەی هەیە: ئەسپێ لەبەین دەبا، کرێژی سەری ناهێڵێ، چەوری موو دەفەوتێنێ و نایەڵێ مووی سەریش هەڵوەرێ.

١٣- كوێستان بەهاران لە ڕابردوودا و ئێستاش لە مانگێک بەهارەوە لە هەموو دێیەکانی دەورووبەری کوێستانەکان جومعانە کچ و کوڕ دەڕۆیشتن بۆ کوێستانێ بە سواری ولاغ و یەستر. سەیر و سەیاحەتیان دەکرد و ئیتر هەر دێیەی بۆخۆی پێکەوە، کەم وابوو تێکەڵ ئی دیکە بن دوای سەیر و سەیاحەت و گەڕان و سووڕان و چایی و نانخواردن دەچوون ئەو گیا و سەوزیانەیان هەڵدەقەند و دەیانهێناوە: مەندێ، بیزا، کەما، هەڵز، کارگ، کوڕادە، کەنگر، خوژە، ڕێواس، پیچکە و لووشە وکاردوو و زۆر گیای دیکە وەکوو گیا دۆکڵیو، خوژە، لووشە، پیچکە، ترشۆکەخاسە، سیر و سیرە کولۆرە و سیرەخاسە گوڵی کەنێرە. نێرکی بیزا و گەڵا مەندۆک، سەڵەمکە، قۆقمیش، بزنەڕیشە، گێلم بەرباغی، پنگە، چاوپشیلە، ئاغجە باشی، قونسوور، بەلبەلە شوانە و زیزڕە مەندێ، کەنگر، قازیاخە، گێلاخە، شنگ و ئەسپنگ و گوڵی گیاسالمە ئەوانەیان دێنا بۆ دۆکڵیوی بەهاران. کە بۆ خواردن خۆشە و تایبەتمەندیی و لەش و لەش ساغی تێدایە بۆ زۆرتر و زیاتر زانین لە تایبەتمەندی و سوود و کەڵکی ئەوانە داوا دەکەم خۆشەویستان تەماشای کتێبی زۆر بە بایەخی کاک مەلا عەلی دارەگردەڵە



**کوێستانی گەڵی گادەری شنۆیە**

(مەحموودی ئازەر) بکەن بە نێوی تایبەتمەندی سەوزێکان و تایبەتمەندی میوەکان دەستی خۆش بێ و هەر بژی، بە تێر و تەسەلی باسی هەمووی ئەوانەی کردووە.

١٤- ڕێگای مەڕی یا بێری و شوان لە قەدیم خەڵک زۆرتر دەچوونە هەواری بۆ مەڕداری. ئیوا بوو حەیوانیشی نەبوو بەڵام چونکە هەمووی خەڵکی ئاوەدانی دەچوون، دێیەکە چۆل دەبوو ئەویش دەچوو جا مەڕ لە کوێستان و جێگا هەوار دەکەوت بۆ دۆشین ئیتر بێری بە پۆل دەڕۆیشتن بۆ مەڕ دۆشین چ لە نێودێیەوە بایە یا لە تاوڵانی جێهەواری بێری پێکەوە دەڕۆن، بۆخۆیان لەگەڵ شوان یا کوڕانی نێودێ ملیان دەنا لە هەڵپەرین، بێ ئەوەی خەیانەتی ناموسی لەکەس ڕوو بدا یا کەسێک بێئەدەبانە بجووڵێتەوە.



**مەڕ بەرەو بێر**



**خێوەت و ڕەشماڵی هەوار**

دیارە بێری کە چوو ژنی بە مێرد چ ئی ماڵە دەوڵەمەند و مەڕی سەربەخۆ و چ ئی ماڵە وردە ماڵ ئەوەی لە نێو دێ و خان و ماڵانەوە دەهات یا لە تاوڵ و چیغ و خێوەت و ڕەشماڵ و هەوارەوە هاتبوو هەموو شایی بە خۆ شۆخ و شەنگ و قیتو و قۆز و پاک و خاوێن بوو. بۆ مەڕ سەرناس و مەڕناس بە ئەنگواتە زوو دەیزانی، گیابڕە و ڕێتکە

و ڕیخنەو، دانوو، پزوو، لەرزە، شەلکە و بەرهاویتەی هەبا بە چاو خشانێک، مەڕی ئاوەکی و لاوەکی پەرەوازە و کڕیاری و باهاوردەی دەزانی و دەناسی. بە کفلەکونێک مەڕ، شەکو، قسر و نەزۆک، ئەستێور و نەبان، چڕدۆ، یەکەڵەگوان، کەڕڕەو، کوێرگوان، بەرخ مردوو، مەڕی شوانی، مەڕی دەستبێنی لێک جیا دەکردەوە. دوای زەماوەند و شایی و هەڵپەرکێ هەر دووک دەستەبێری بڵاوەیان دەکرد هەر کەس بۆ لای قوناغ و ماڵە خۆی دەگەڕاوە، ئی هەواری بە سواری یەستر یا یەک سم بە هەورازیدا هەڵدەگەڕان دەڕۆینەوە تاوڵی. ئی نێو دێ و ماڵانیش بە گۆرەوی چنین، تەشی ڕستن، سێتا بادان، خاوک هەڵوێزنین بەرەو ماڵ دەبوونەوە، هەر دووک لا کە دەچوونەوە شیریان وەسەر ئاوری دەنا لەسەر ئاورگی یا کوچکاوری بۆ پەنیر یا ماستی. دیارە بۆ پەنیر پێش گەرم کردن هەوێنیان دەگرتەوە هەوێنی پەنیر ئەلەوانە پێک دێ: بە شیلاوک، مێخەک، عێل، زاخ، قەند، خوێ هەوێنیان ساز دەکرد و تێیان دەکرد و هەوێنی دەگرت دەبوو بە پەنیر، دەڵەمە، مەیلە، لۆرک و لۆرکاو سەلکە پەنیر. و ئەگەر بۆ ماست هەوێنیان تێ کردبا دەبوو بە ماست، ئەگەر بۆ ماست هەوێنیان تێکردبا، ماستیان تێدەکرد دەبوو بە ماست. بۆ ڕۆنی کەرە و زەنگ، کەشک و دۆ و شیرێژ و تۆراغ و خەستە و تیژاو، دۆی دۆدانە و توورەکە، لە ماست پەیدا دەبێ. جا کابان کاتێک ماست دەمەیی بۆ ژاندن لە مەشکەی دەکرد، بیژێنێ دەستی بە لۆلەپ و دۆژەنگی مەشکە دەگرتوو، چ لە هەواری با، سێپەکەیان دادەنا، یا لە ماڵی لەبەر بێڵا گوریسیان هەڵدەواسی.



**مەشکەی گاوس یا ئاوس**

مـەشـکـەیان دەژانـد کـاتی مـەشـکە هێنـان و بـردن بـە مـەشـکـەیان هەڵدەکوت: **«مەشکەم مەشکەی مانگایە/ دەیژێنم لە بێڵایە/ مەشکەژێنم توبایە/ چنگێکی ڕۆن تێدایە/ خەسووم عەمری نەمێنێ/ لە بێڵایەم دەنوێنێ/ ئاوی مەشکەم پێدێنێ/ شەوێ زووم هەڵدەستێنێ/ ئاوی مەشکەم پێ دێنێ/ مەشکەم مەشکەی نەنگوینکە/ مەشکەژێن تازە بووکە/ لە کوێستانی بەردووکە/ مەشکەم مەشکەی مانگایە/ لۆلەب لە دارخورمایە/ بۆم هاتووە لە بەغدایە/ مەشکەم مەشکەی گوێلکانە، مەشکەژێن خەرامانە/ لە کوێستانی نستانە/ یارەکەم چاوەڕوانە». «ئاوی کانێی کیفارێ/ بە خوڕەخوڕ دێتە خوارێ/ بۆ مەشکۆڵەی نازدارێ/ بەدکار بەردی لێ بارێ»** ئەوەش باسی بێری و شوان.

**١٥– ئالان:** ئەویش دوو بەشە. یان چوونی ئالان بوو یان ئالان کردن. چوونی ئالان ئەوە بوو کە ئەو ناوچانەی کە میوەی ویشکیان نەبوو بۆ زستانێ، پایزان زۆری خەڵکی ئاوەدانی بە وڵاغەوە یا

دەچوون بۆ ناوچەی سەردەشت یا عێراق یا لای عەجەمستان میوەیان دێنا بۆ شەوچەلەی زستان وەکوو مێوژ، کشمیش، گوێز، خورمای عێراق، دۆشاو، هەنار، سنجوو و زۆر شتی دیکە لێرەش برێشکە و دانووله و لەتکە هەرمێ و قەیسی ویشک و جاری وابوو شووتیان لە نێو چاڵەگەنم یا پشکەڵی نێو قەلاغە تەپاڵەدا هەڵدەگرت بۆ زستانێ بۆ نەخۆش و میوان و کەسی خۆشەویست دایان دەنا. دوو ئالانی دیکەش ئەوانە بوون شەوانە خەڵک زۆر لە مزگەوتێ دادەنیشتن دوای نوێژی خەوتنان جاری وابوو فەقێشیان لەگەڵ بوو ئەگەر دێیەکە فەقێی لێ بایە، پشکیلان، مێرمێرێن، جۆرابێنیان دەکرد دەنا دەنگ خۆش و بەیت بێژەکان دادەنیشتن تا کەڵەباب خوێندنی بەیانی بەیتیان بۆ دەکوتن و حیکایەتیان بۆ دەکردن ئەو کات چایی نەبوو یا لە هەموو ماڵێک نەبوو دەیانکوت ئالان دەکەین ئەویش ئەوە بوو نێودێ دوکانداری لێ بوو کە پێیان دەکوت چەرچی(دێورە). دیارە چەرچی بەوەش دەڵێن کە سندووقێکی پێیە بە دێیاندا دەگەڕێ دەرزی، بنێشت، کل و کلتوور، سابوون و زۆر قلقلە فلفلەی دیکەی پێیە دەچوون چەرچی یا دوکانداریان بانگ دەکرد ئەویش خورما یا کشمیش یا مێوژ یا گوێزی دێنا هەر کەس بایەی دوو یا پێنج قڕانی دەکڕی ئەویش بە تەرازوو چوارپاڵوو یا دەستی بۆی دەکێشا ئیتر کابرا تێری پێ دەخوارد جاری وابوو بەشی ماڵێشی دەبردەوە بەوەیان دەکوت ئالان.

# قومار یا گەمەی دەورانی ڕابردوو

**١- ڕاوەژیشک:** ئەوە زۆرتر لە نێو فەقێیاندا دەکرا بەڵام جاری وابوو خەڵکی دیکەشیان دەگەڵ دەکەوت.



ئەویش ئاوا بوو دیارە شۆخی بوو بۆ خۆشی. کابرایەک یان فەقێیەکی فەقیرحاڵیان وەگیر کەوتبا تەنەکەیەکی پووتیان دەدا دەستی دەگەڵ دارێک، شەوێ دەڕۆین بۆ کێوی. کابرای تەنەکەیان لەسەر بڵێندییەک دادەنا وەکوو گردێک، تەپکێک، کێوێک کابرا دەبوو بەو دارە ئەو تەنەکە بکوتێ جاری وابوو ئەوان هەر یەک بە لایەکدا دەهاتنەوە بۆ ماڵێ ئەویش هەتا تاو هەڵ دەهات هەر دەیکوتا نە هیچی بۆ دەگیرا و نە هیچیش هەبوو. ئەوەش ڕاوە ژیشک.

**٢- هەپک هەپک:** قومار یا کایەکی دیکە هەبوو زۆرتر ئی منداڵ بوو. دیارە لەوەدا کچان زۆرتریان بەوە کایە دەکرد و زۆران پێیان دەکوت قوماری کچانە. ئەویش ئاوا بوو دەیان هێنا حەوت داریان درێژ دەکرد و ڕیز دەکرد دەبوو

کورتی و درێژیان نەبێ هەر دارەی بە ئەندازەی یەک میتر درێژ بێ و یەکی دوو پێش لەگەڵ یەکتر دوور بن، نەفەرێک دەهات مستی دەقوچاند هەر دووکیان دەیکوت ئەوە چییە لە مستم دایە نەفەری بەرابەریش دەیکوت هەڵدم مەڵدم، شەش پای دوو سم ئەگەر هەڵی نەدەی لە هەر دووک چاوت تسم. ئەویش ئەگەر هەڵی دابا ئەوە دەبوو بە مەڵلا دەنا ئەوی دیکە دەبوو بە هەوەڵ یا مەڵلا. جا دەبوو بە حەلوا لەسەر یەک لاق باز داتە نێو ئەو دارانە نە لاقی دانێ و نە لاقیشی وە هیچ دارێک بکەوێ، دەنا دەپرووزێ جا کاتێک بە حەلوا بازی دەدا بە نێو دارەکاندا ئەو نەفەرە دەبوو ئەوە بڵێ یانی نە لاقی ڕاوەستێ نە زاری. بڵێ هەپک هەپک هەی دار هەی بێ هەی بێ تەپڵی سەری سپی سپی بێ. ئەوەش قوماری هەپک هەپک.

**٣- گورزێن یا مووسا بەگەردێن:** پۆلێک جحێڵ و پیر و جاری وابوو فەقێشیان دەگەڵ بوو، دادەنیشتن. هەموو نێوی یەکیان وەکوو دار و بەرد و چەقۆ و تیغەڵەو بەن و ئەوانە دەنووسی لە کاغەزێکدا و نێوی مووسا و پادشایان دەنووسی وێکڕا لێکیان دەدا و تێکەڵیان دەکرد و لە کڵاوێک یا گۆرەویەکیان داویشت لە پاشان دەستیان دەبرد هەر کەسێ نێوێکی دەردێنا و نێوی پادشا وەبەر هەر کەسێ کەوتبا ئیتر ئەوە لێدەربوو و نێوی مووساش وەبەر هەر کەسێ کەوتبا ئەوە لەوێ سوڵح دەکرا و لێدان ڕادەوەستا. پەتکێک یا پشتوێنە کونێکیان با دەدا وەکوو دار و بەردی لێدەهات وا سەخت و سفت دەبوو ئیتر پادشا بەوە کە پێیان دەکوت گورز دەبوو ئەو عالەمە یا جەماوەرە هەر یەک بە کەیفی خۆی گورزێکی لێدەدان تا دەگەیشتە مووسا ئەوە لەوێ دەسووتا بەوەیان دەکوت مووسا بەگەردێن لەوێ دەبوو پادشا لە لێدان دەست هەڵگرێ و ڕاوەستێ. ئەوە بوو مووسا بە گەردێن.

٤- **خووگەمله:** ئەوەش بە گشتی لە نێو هەمووانڵدا بوو ئەویش ئاوا بوو دوو نەفەر دەهاتن کە هەر دووک بە هێز و زەلام و لەخۆ ڕادیو دوو پشتێنیان تێک دەخست و گەرییان دەدا لە ملی یەکتریان داویشت لە بەرابەر یەکتردا دادەنیشتن دروست هەر دوو دەست و پەنجەیان بە پەنجەی یەکەوە دەنا بەوەیان دەکوت پانەوپان و پاشنەشیان تێک دەترینجاند بەوەشیان دەکوت سووچ بە سووچ. دواتر یەک نەفەر کە لەبەیندا بوو ئێمە پێی دەڵێن داوەر، قازی. ئەوان پێیان دەکوت دمڕاست، کابرای دمڕاست کە ڕاست دەبوون و ساز دەبوون دەیکوت یا ئەڵڵا. دەستیان پێدەکرت سیرە و جیرەیان لەو حەسیر و بەڕە و لباد و ژێرڕاخەرانە دێنا جاری وابوو هەموو گیانیان دەبوو بە ئارەق هیچ کام زەفەری بەوەی دیکە نەدەبرد و هەڵی نەدەستاند. کاتێک یەکیان دەشکا چەپڵەیان لێدەدا و دەیانکوت ئەها، هەڵیستاند. وەدووی خۆی دەدا دەیبردە دەرێ تا هەموو کەسێ ببینن کە دەرەقەتی نەهاتووە، دواتر دەیکوت ئاوات دەشکێنم ئەۆەش خووگەمله.

٥- **کەوشێن:** کەوشێن ئەویش ئاوا بوو ئەوکات کەوش، کاڵە، کەلاش، لاستیق، جووتمێخ بوو. سواڵەت یا پووڵێکیان هەڵدەخست بۆ ئەوەی کێ ببێتە مەڵڵا، کەڵڵا، یا کەیخۆدا. هەر کەسێ بایە دەهات کەوشی ئەو عالەمەی هەڵدەگرت دەیبردنە دەرێ هەمووی تاوتا دەکردن و دایدەنا لە ناکاو هەرای لێ دەکردن دەبێ برۆنە دەرێ، چاویشی دەبەستن بە دەسرە، دەست یا پێچی سەری چونکە چاویان بەسترابوو کەوشەکانیشیان پیاوپێ و گۆڕابوون لێیان دەشێوا کەوشیان بۆ لە پێ نەدەکرابەلادا دەهاتن بە دیواریدا دەکەوتن بە سەر یەکدا دەهاتن. یەک سەری لەبن هەنگڵی ئەوی دیکە دەدا زۆر پێدەکەنین و زۆر خەم و خەفەتی خۆیان بە با دەدا شەویان درەنگ دەکرد جاری وابوو ماڵ دوو دەستیان خەو

دەکرد جا بڵاوو دەبوون جاری وابوو تا کەڵەبابی بەیانی دادەنیشتن. ئەوەش کەوش کەوشێن یا کەوش گۆڕین.

٦- **نیوەپیاو:** لە ڕابردوودا زیانی گەنم و دەغڵ و دان یا لەوەڕ و مەڕتع و کۆدە و گیاجاڕ نێو چۆم و قوپی و سندە و گیادروو- و سەرجۆگە و نێوان گەنم و قوونەمێرگ و مێرگ و نێودار و پەرێز و نێو باقەگەنم، خرمان و خۆیان، سەر کوێزر، بن خرمان، سەرگیشە و نێو وێنجە، ئەوانە تاوانێکی گەورە و خەتایەکی زۆر بوو، چون دەیانکوت زیانی کردووە و زەرەری داوە جا کەسێک ئەو کارەی کردبا دەبوو لە لایەن مامۆستای ئاوەدانی کەیخۆدا، ئاغا، کوێخا تەنبێ بکرێ تۆڵەی لێ بکرێتەوە جا نیوەپیاو تووشی زیان ببوو؛ دەهاتن تۆڵەی لێ بستێنن دارێکی یەک میتریان دادەنا و دارێکی دیکەش ڕاست و چەپ وێدەخست وەکوو دەستی بنیادەم و لیباسیان لەبەر دەکرد و دایان دەنا نێویان دەنا نیوەپیاو یا تاوانبار و یەک نەفەر بە نێوی سێحەب زیانیەکە لێی تووڕە دەبوو دەیکوت کوڕە ئەتۆ بۆ زەرەرت لە من داوە گیا و گەزرە و لەوەڕ کا و کڵۆشو و گەنم و دەغڵ و دانی منت خواردووە، وەڵڵا دەیخۆی، سواری سەری دەبوو ماوەیەک لە بن خۆی دەنا و دەیفلیقاندەوە. مرخەمرخی لە خۆی دێنا و عالەمیش پێی پێدەکەنین ئەوەش نیوەپیاو.

٧- **جۆرابێن:** ئەویش لە شەوانی پشوودانلدا کە میوان دەهاتن فەقێ و غەیری فەقێ دادەنیشتن دە گۆرەوی بەنیان دادەنا. مازوو کە بەری داری بەڕوویە بە دەستەوە دەگرت بەوەیان دەکوت **پشکیل**. لایە چەند نەفەر ڕووبەڕووی یەکتر دادەنیشتن بەویان دەکوت ئەو بەرە و بەری جورابێن یا دوو بەری جورابێن. یەکێک دیاری دەکرا دەبوو حیسابیان بۆ بکا بەڵام فێڵ نەکا بەو فێڵەیان دەکوت پەڕاندن ئاخری حسابیان دیاری دەکرد کە ١٥٠ یا ٢٠٠ بەوەیان دەکوت شار. دوو

گۆرەوی دەگەڕان بزانن لە کێوە دەست پێدەکرێ یا لە کام بەرەوە دەست پێبکەن، بەوەشیان دەکوت مەڵلا یا هەوەڵ ئەوەی دەگرا دەبوو پشکیل نیشان دا دەنا هێندێک لە پێش‌دا دەی‌شاردەوە بەوەیان دەکوت پێی نەگەڕاوە. کاتێک دەگەڕا ئەوانەی ڕووبەڕوو زۆر بە وردی تێیان دەڕوانی هەمووی گیانیان وەبەر چاو دەخست ئەگەر شوێنیان هەڵگرتبا بەوەشیان دەکوت ڕاوێژ جا ئیوا بوو ڕاوێژی بە سەری، بە دەستی، بە چاوی بە ڕیشۆی دەسرەکەی لێ هەڵدەگرت و دەی‌هێنا کاتێک پشکیلەکەی دادەنا ئەوانە یا دەلەرزینەوە یا تەکانیان دەخوارد ئەگەر هەوەڵ بی‌هێنابا بەوەیان دەکوت **گوڵ** دەنا لە ئاخردا بەوەشیان دەکوت **وێرسن** جاری وابوو گوڵ و وێرسن پێکەوە بوون بە ویرسن دەکوترا یازدە بەڵام ئەگەر گوڵی لێدابا و نەی‌هێنابا تەڕەف دەی‌کوت دەی دەدەی، یا دەی بدە دوای گوڵ کە نەی‌هێنابا هەوەڵ گۆرەوییەک کە دەستی لەسەر دانابا دەیکوت ئەوە بچێ ئەگەر مازوو لەوێدابا تەڕەف دەی‌نەڕاند دەیکوت دەیە، دەبوو دە بەڵام ئەگەر لەوێدا نەبا دواتر هەر گۆرەوییەکی بی‌چواندبا دەیکوت ئەوەت بچێ لە هەر کام‌دابا ئیتر لەوێوە گۆرەوی ماویان دەبژارد دەیان‌کوت ئەوەندەیە بۆ نموونە ٥ گۆرەوی دەما دیارە بۆ پێنج لەسەر ئەوبەر حیساب دەکرا ئەوە بوو بە کورتی جۆرابێن کە کایە و قوماری فەقێیان و ئی خەڵکی نێودێ بوو بەڵام چونکە جۆرابێن هەر ماوە زیاتری لەسەر ناڕۆم دیارە بەوجۆرە جورابێن دەکرا تا دەگەیشتە شار هەرکام لەو دوو بەرە یا دوو لایە زۆرتر گەیشتبانە شار ١٥٠- ٢٠٠ ئەوە دەی‌بردەوە جاری وابوو شەوی ١٠جار دەکرا بەوەشیان دەکوت دەستی جۆرابێن. زۆرجار شەوێ نەدەخەوتن هەر جۆرابێن دەکرا چایی ساز دەکرا و دووبارە دەچوون لە نێو دێ نان و پەنیریان دێنا و دەیان‌خوارد ئەوەش جۆرابێن.

٨- **پشکیلان:** قومار و کایە و گەمەیەک بوو بە دەستەجەمعی بە کۆمەڵ دەکرا زۆرتر بە لێزان و بە مەنشور بوو دەیان کرد و دەیان بردەوە لایە دەبوو لە ١٢ نەفەر کەمتر نەبێ. هەتا زیاتریش با باشتر بوو دەبوو ٢٤ نەفەر. زۆرجار وابوو بە هەر دووک بەرەکە ٥٠ نەفەر بوون کەسێک دەبوو بەسەر دەستە کە پێیان دەکوت مەڵلا. ئەوە بەرماڵێکی سپی گەورەی خام یا جاوی بە خۆیدا دەدا هەتا دەست و قۆڵ و پشکیلەکەی دیار نەبێ بەوەیان دەکوت گەڕان لەتە بەڕەیەک یا دوو لینگە گۆرەوی بەنیان تێک دەخست بەوەشیان دەکوت پشکیل. ئەوەی دەگەڕا دەبوو واش بگەڕێ دەستەی بەرابەر شکی تێنەکا و نەیبینی و ئەگەر لە گەڕان تەواو دەبوو مەڵلا یا سەردەستە دەیکوت «کیمدا شدی» هەمووی لایەن دەیانکوت خۆمان دەیبەینەوە ئیشاڵلا ئەوجار بۆ ئەوەی کێ بگەڕێ لە پێشدا یا دوو قرانیەکیان هەڵداویشت کە پێیان دەکوت شێر و خەت یا تەڕەف هەر دوو دەستی دەقوچاند شتێکی لە مستێکی دەخست یەکیان خاڵی بوو دەیکوت پڕ یا خاڵی؟ تەڕەف یەکیانی دەکوت ئەگەر هەوبایە دەیکوت ئەوە هەڵیداوە یا هێناویەتی. ئەوە دەبووە هەوەڵ بۆ گەڕان دەنا ئەوی دیکە دەبوو ئەوجار دوای تەواوبوونی گەڕان هەموو سەریان لەبەر خۆ دەنا ئەو لایەی دیکەش چەند نەفەری لێزان و پیتۆڵیان دەهاتن تەمەشایان دەکردن تەمەشای نێوچاوانیان دەکرد، دەستیان لەسەر دڵ و ڕەگی ملیان دادەنا ٥-٦ نەفەریان دەهێشتەوە بەوەیان دەکوت شک ئەوەی دیکەش دەیانکوت بچێ باوەڕیان نەدەکرد. بەڵام ئەگەر بییان کوتبا دەگەڵ گڕی ئەو چرایە بچی ئەگەر گڕی چرا کوترابا تەواو بوو. جا ئەگەر پشکیل بەوانە با ئەوە فڕێیان دەدا دەیان گوڕاند و نەڕاند بەوەیان دەکوت نەتان هێناوە ئەوە دەبووە جارێک بەو جارەیان دەکوت توول دیارە بە پایان یا ئاخرێکەیان دەکوت شار جاری وابوو شار ٧ توول بوو جاری وابوو ٥ توول بوو جا ئەگەر بەوانە

نەبایە و چەند نەفەرە با کە هێشتبوویانەوە ئەبەوەیان دەکوت ئی خۆمانە و دەهاتن بە دەوریاندا دەهاتن جا بە پشکیلیان دەکوت گوێلک، دەچوونە بن سەریان بۆ نموونە کاک فلانکەس عەیب نەبوو تۆ ئەو گوێلکە زەلامەت هەڵگرتووە، کابراش ئیوا بوو دەخەجلا ڕەنگی سپی دەبوو ئارەقی دەکرد و ئیواش بوو چون کردە بوو عەلەمی نەدەهاتێ و شوێنەونکێی پێ دەکردن هەتا شکیان لێ تێک چێ جا لەسەر ئەو نەفەرە کۆ دەبوونەوە گۆرانییان دەکوت جاری وابوو چەپڵەیان لێدەدا حەتتا دەهۆڵ و زۆرنایان دێنا یا پیلیان دەگرت بە دوو نەفەر یا چەند نەفەر هەڵیاندەستاند کە پشکیل بەو بایە لێی دەکەوتە خوارێ دەیانکوت ئەوەتا گوێلکەکە ئەوجار ئەو لایە دەبوونە تووڵێک ئیتر گەڕان دەکەوتە دەستی ئەو لایەی دیکە جا پشکیلان لەسەر مەرج بوو جاری وابوو مەڕ یا گیسک، کاوڕ بوو دوای تەواو بوون هەر کەس بیدۆڕاندبا بەو شەوە دەیاننارد حەیوانەکەیان دێنا سەریان دەبڕی و لەسەر ئاور و کورەی مزگەوت سازیان دەکرد و دەیانخوارد جاری وابوو دەگەڵ ئەو دەستانە ئاغا یا دەوڵەمەند تێکەڵ دەبوون بەتەنێ دەینارد مەڕەکەی دێنا یا دەیکڕی دەیدا بە خەڵکەکە یان بە هەموو دەستەی دۆڕاو تەوجێیان دەکرد پووڵی مەڕێکیان کۆ دەکردەوە دەچوون دەیانکڕی دەیان هێنا دەیان برژاند و دەرۆینەوە ئەوەش پشکیلان.

قومار و گەمەی منداڵان وەکوو کۆدڕکێ، بن دەستیلە، بازەڵە، خازەڵە، خەستە، سێباز، گوڵگولێن، هازەی مەزرەق، شێلاقە، خلۆرکێن، هەلوکێن، شێر و خەت، چکە و پکە و چەقو تەفی جگێن، هەڵگرتەی مەڕمەڕ، کەللە، پلە و دوو قامکە ی مێشێن، پەلەپیتکە، تاقمەنە جووت، هەپک هەپک و دایە مەمدە بە گورگێ، تەناف تەنافێن، کۆترێن و فری فری، کڵاوی سەرسنگێن، کەری سوورێن، خۆشاردنەوە، جوغزێن، قەرێ قەرێ، تۆپێن، قاڕێن، کۆسە، میرمیرێن، جۆرابێن، پشکیلان، دامە،

نۆڕسکێن، سیٚڕیسکێن، هەی هات، گەڕە لاویەژە، ئالان، مووسا بە گەردێن، شەڕە قۆچەقانی، شەڕە فڕ، شەڕە تۆپ، شەڕە ئاو لەبیٚ لەبیٚ کەرە سوورەکەی مەن لە ماڵە کیٚ. با چاوێک لە شەڕەمنداڵ، شەڕە کەڵەباب، شەڕە کەڵ، شەڕە جوانەگا، شەڕە بالوێرەی کوڕ و کچان کەین و هەروا سەرمە قولات، چیلکێن، نوکووسوو، تەڵە و ڕێوی، زاقێن، بارە خویٚ، یەکانە، زۆرەبانی، مەکۆ مەکۆ بکەین.

**٩- تورتووفیراق( بە هاوکاری کاک مەلا عەلی دارەگردەڵە):** دەبنە دوو دەستە بە شێوەی داوتەڵەب دوو نەفەر دەبنە سەردەستە یا مەڵلا ئەوەی دیکەش دانەدانە هەڵیدەبژێریٚ جاریٚ یەک نەفەر، ئەو یەک نەفەر ئەوی دیش یەک نەفەر، تا هەمووی منداڵی کۆ بۆوە تەواو دەبیٚ و هەر دوو دەستەش تێدەکۆشیٚ ئی زیرک و وریا و هەڵسووڕاو بۆخۆی هەڵبژێریٚ ئەگەر تەواو بوون و بە ئەندازەی یەکتر بوون دەست بە کایەکە دەکەن بۆ ئەوەی کامیان دەبێتە هەوەڵ، هەر دووک مستی دەقوچێنیٚ پووشکەیەکی تێدەکا و ئەوەی دیکەشی خاڵیٚ دەڵیٚ پڕت دەویٚ یا خاڵیٚ؟ ئەویش یەکیان دەڵیٚ یان دەنا پووڵێک هەڵدەهاون دەڵیٚ شێرت دەویٚ یا خەت؟ بەوەی ئەوەڵیان دەڵێن **مەڵلا** بەوەی دیکەشیان دەڵێن **قرە**. قومار دەستی پێدەکرد دەستەی مەڵلا یا هەوەڵ دەچوون خۆیان دەشاردەوە لە خانوو کۆن، کەلاوە، بندیوار دیارە شەو دەبوو دەستەی دیکە دەچوون بە دوویاندا و لێیان دەگەڕان هەر دوو سەردەستە و مەڵلا لە پێشەوە دەبوون بەڵام مەلای دەستەی خۆشاردراوە دەیزانی چوونە کویٚ و لە پێشەوە دەرۆیشت دەچوونە هەر جێگایەک ئەوەی دیکە لێی دەپرسی توورت؟ ئەویش جوابی دەداوە فیراق، نەخێر لێرە نین تا دەگەیشتە ئەو جێگایەی کە لەویٚ بوون لێی دەپرسی توورت یانی لێرەن، ئەویش دەیکوت توورت، توورت بەڵیٚ لێرەن. هەر کە وای دەکوت دەستەی خۆشاردراوە دەردەپەڕین و دەکەوتنە سەر ئەو دەستەی دیکە هەر کەس لەوانە

که خۆیان شاردبۆوه ئەوانەی دیکەیان گرتبا سواری کۆڵی دەبوو تا دەگەیشتنە ئەو جێگایەی کە پێیان دەکوت شار یانی مەرکەز. جاری وابوو تەواوی دەوری ئەو دێیەی پێدەکرد بۆی نەدەگیرا، ئەوەندە هەڵدەهاتن هیلاک و ماندوو دەبوون ئەگەر کەسیان بۆ نەگیرابا ئەوانە دەدۆڕان دەستەی دیکە دەچوون خۆیان دەشاردەوە **ئەوەش توورت و فیراق.**

**١٠- سەنیری سێ سەر (بە هاوکاری کاک مەلا عەلی دارەگردەڵە):** ئەویش ئاوا بوو دەبوونە دوو دەستە هەر دەستەی دەبوو لە سێ نەفەر کەمتر نەبێ دیارە زیاتر بێ چاکتر ئەویش مەڵلا و قرەی هەبوو، دوو نەفەر پشتیان تێک دەکرد سەریان دادەناوەند لە بنەوە دەستیان بە یەکتر دەگرت ئیتر وا ڕادەوستان پشتیان ڕاست و تەخت دەبوو نەفەری سێهەمیش ڕاست و چەپ سەری لە بەینی هەردووکیان دەخست ئەویش لە ڕیزی ئەوان پشتی ڕاست دەبۆوە و دەبووە سەنیر ئەوجار نەفەری دەستەی بەرابەر دەبوو بێ بە سەرمەقولات بەسەر پشتی ئەواندا بڕاوتە ئەودیو دروست هەردووک پێی لە عەرز دا و ڕاوەستێ و قیت بێتەوە دەنا کەوتبا یا ڕانەوەستابا دەپرووزا و دەدۆڕا. ئەوجار دەبوو ئەو دەستەی دیکە بێن ئاوا باز بدەن و سەرمەقولات بدەن هەتا ئەوانیش دەپرووزان و دەدۆڕان. ئەوەش سەنیری سێسەر.

**١١- کڵاوی سەرچنگێن یا سەرچنگان(بە هاوکاری کاک مەلا عەلی دارەگردەڵە):** ئەوە گەمە و قومارێک بوو منداڵ و مێرمنداڵ و تازەلاو دەیانکرد و پێیان دەکوت کڵاوی سەرچنگان و کڵاوی سەرسنگێن. ئەویش ئاوا بوو مێرمنداڵ کۆ دەبوونەوە زۆرتر پاشنیوەڕۆ کە لە سەوەتە داگرتنەوە، وڵات تاقەت کردن، مەڕ ئاودان و کار و بار دەبوونەوە لە پایزان و زستاناندا دەیانکرد. دەبوو جێگاکەیان دەشت و پان بێ ئەوانە بە پێی عادەت و قومار مەڵلا و قرەیان بوو

مەڵلا هەوەڵ بوو قرەش دووهەم. کاتێک نەفەراتی هەر دووک دەستەکە دیاری دەکران دەهاتن لەو عەرزە گۆڕ و دەشتاییە کە دیاری کرابوو لەوێ بوون خەتێکی بە دەورەی گەورەیان لێدەدا پێیان دەکوت **جوغز**. لە نێوەڕاستی ئەو خەتەشدا دایرەیەکی چکۆڵەیان لێدەدا و سنگێکیان دادەکوتا ئیتر دەستەی قرە یا دووهەم دەبوو بچنە نێو ئەو جوغزەوە دەبوو لەسەر چنگاندا بێن و بچن حەقیان نەبوو هەستن یا دەست هەڵێنن ئاوا لەسەر دەست و لاق بە دەوری خەتەکادا بێن و دەوری بدەن نە بێنە دەرێ و نە دەستیش هەڵێنن ئەوانەی دەریش کە دەستەی هەوەڵ یا مەڵلایە لە دەرەوەی خەتەکە هەڵدەسووڕێن بەڵام ئەوان بە پێوەن لە هەوڵ و تەقەلای ئەوەدان کە دانە دانە کڵاوی ئەوانەی ژووری لەسەریان داکەنن و بیرفێنن ئەوەی نێو خەتەکەش تێدەکۆشا کڵاوەکەیان وەبەر دەست نەخا و ئەگەر دەستیان تێدەکۆشی شەقێکیان تێهەڵدا لەوەی دەرێ مادام شەقەکە دەبوو لە ئەژنۆی بەرەو ژوور بایە و بیگرتبایە ئیتر ئەوانەی دەرێ دەسووتان و دەپڕووزان دەبوو ئەوان بێنە ژووری نێو خەت و جوغزەکە، ئەوانەی ژووری دەبوونەوە هەوەڵ دەهاتنە دەرێ ئەوانیش هەروا بە دەوری خەتدا دەهاتن تا کڵاو لەوانەی ژووری بفرێنن مادام شەقیان لێکەوتبا دووبارە دەچوونەوە ژووری تا ماوەیەک یا چەند توول کە بۆخۆیان دیارییان دەکرد ئەوەش کڵاوی سەرسینگێن یا سەرچنگێن.

**١٢- پووشکە بەفوو:** ئەویش قوماری نێو فەقێیان بوو بەڵام دەبوو زۆر بن. جاری واش بوو دەگەڵ خەڵکی نێو دێ دەیان کرد ئەویش ئاوا بوو دەهاتن لە نێوەڕاستی حوجرە بزمارێکیان لە ئاڵو و دارێکی بنمیچەکە دەدا دواتر هەودایەکی درێژی غەرغەرە یا دەزوویان لەو بزمارە دەخست ئیتر شۆڕ دەبۆوە بۆ حوجرە ئەوجار دەهاتن ڕەژییەکیان ئاور دەدا و دەگەشاندەوە تا دەبوو بە پۆلووە ئاور.

دیاره ڕەژی دەبوو داری لێڕەوار بێ کە پێیان دەکوت:«سامسۆن» دەرزییەکی بەرۆکیان لە بەنەکە قایم دەکرد و لە ڕەژییەکەیان دەچەقاند لە هەموو لایەکەوە عالەمەکە لێی دەهالان بە فوو دایان دەگرت جار دەگەڵ جارێ ڕەژییەک زیاتر دەگەشاوە هەر یەک بۆ لای ئەوی دیکەی حەواڵە دەکرد هەر کەس فووی زۆرتر توند بایە کە فووی لێدەکرد ڕاست بە گشت سەر و سمێڵ و ڕدێنی ئەوی بەرابەریدا دەکرد هەمووی هەڵدەپرووزا. حاجی میرزا ئەحمەدی نادری دەگێڕێتەوە دەڵێ ماڵمان لە وشتەپە بوو ئەمن قوتابی و منداڵ بووم بەڵام کایەی حوجرەیان پێ دەکردم، مەرحومی مامۆستا مەلا حەمەدەمینی ئەشعەری لەوێ دەرسبێژ بوو(موددەریس) مامۆستا هەژاریش یەکێک لە فەقێکانی مامۆستا بوو ئێوارێیەکی سێشەممە کە ڕۆژی پشوودانی فەقێ بوو، چون فەقێ لە حەوتوودا دوو ڕۆژ، ڕۆژی پشودانیان بوو سێشەممە و جومعە. مامۆستا هەژار کوتی مامۆستا نابێ بڕۆیەوە ئەمشەو جەفەنگ و شۆخی دەکەین ئەگەر ئیجازە بفەرمووی. دانیشتن سەماوەری ڕەژی تەنەکەیان بۆ چایی تێهاویشت کوڕەئاغاکان ناردیان قەند و چاییان لە ماڵێ هێنا، ئەوانیش لەوێ بوون. مامۆستا هەژار کوتی مامۆستا پووشکە بە فوو دەکەین مامۆستا فەرمووی مەلا ڕەحمان هەمووی گیانمان دەسووتێ عەرزی کرد قوربان تۆ مەیکە دوور کەوەوە هێنای بەو تەرتیبە ڕەژی و دەرزی و دەزووی هەڵاواسی خەڵکی زۆری لێ بوون کەم کەس مابوو ڕیش و سمێڵ و برۆی خاڵی هەڵپرووزانی لێ پەیدا نەبووبێ بۆ بەیانی هەموو سەر و ڕیشیان چا کرد و کورت کردەوە. ئەوەش پووشکە بە فووی فەقێیان. دیارە زۆر کار و قومار و شۆخی دیکە هەبوون چ لە نێو فەقێیان چ ئی خەڵک و فەقێ پێکەوە ماون بکوترێن و بنووسرێن چونکە فەرهەنگێکی کۆنی کوردەوارییە بەو هیوایەی شتێکی بە کەڵکم نابێتە بەر دەستی خوێنەرانی بەڕێزی

بەرەی داهاتوو لە فەرهەنگی کۆنی کوردەواری و نەشم هێشتبێ ئەو کلتوورە بە بایەخە ون بێ و بفەوتێ و کەلێنێکی چکۆلەشم لە نێو کتێبخانەی کوردی پڕ کردبێتەوە و نێوی خۆشم لە نێو خزمەتگوزان و لایەنگرانی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی تۆمار کردبێ بەو هیوایە.

**لە کۆتایی‌دا** بە پێویستی دەزانم لە هەمووی بەڕێزان و عەزیزانێک سپاس و پێزانینی خۆم دەربڕم بۆ ئەوەی دەستیان گرتووم، پێیان کوتووم و دڵگەرمیان کردووم و بۆم بوونە هاندەرێک و یارمەتی‌دەرێک و قەڵایەکی قایم؛ هیوادارم خوداوەندی مەننان یارمەتییان بدا لە هەر دووک دونیا. لە خوێنەرانی خۆشەویست تکا دەکەم بە چاوی خۆماڵییەوە بڕوانە ئەو نووسراوەیە هەڵەکانم بۆ ڕاست کەنەوە و پێم بڵێنەوە و لێمنەڵێنەوە، چونکە کەس نییە تەواو بێ تا کرێکەی تەواو کا، ڕایەڵ و پۆی لێ نەبڕێ. وەک قەدیمی دەڵێن بەندە بێ‌عەیب نابێ هەر خودایە بێ‌خەتایە.

هەروەها سپاسی ئەو بەڕێزانە دەکەمە کە یارمەتییان داوم و دەستیان گرتووم:

١. کاک حوسێن شێربەگی

٢. کاک مەلاعەلی دارەگردەڵە

٣. کاک ئەمین گەردیگلانی

٤. کاک محەمەدئەمین شاسەنەم

٥. کاک وەفا بداغی

***بە سپاسەوە***

***مەلا مستەفا ڕەشیدی (زاواکێو)***

***ڕێکەوتی ١٣٩٠/٩/١٠ هەتاوی بۆکان***

# سەرچاوەکان


١- کورد و کوردستانی مامۆستا مەردوخ
٢- فەرهەنگسەرای نەورۆز
٣- عەزیز و تەکش، مامۆستا عومەری ساڵحی ساحەب
٤- کورد و کوردستانی پرۆفسۆر محەممەد ئەمین زەکی
٥- مێژووی ئەفشار، نووسراوەی میرزا ڕەشیدی ئەدیبولشوعەرا، وەرگێڕاوی کاک سەلاحەدینی ئاشتی
٦- کتێبی تەممەدونی کۆنی مەهاباد، بەڕێز کاک مەحموودی پێدڕام
٧- گیتاناسی ئێران، نووسراوەی مهەندیس عەباسی جەعفەری
٨- هەنبانە بۆرینەی مامۆستا هەژار
٩- کوتەی ڕاوچیان و کتێبی کەوباز
١٠- گەڕان و پرسیار و چوونی خۆم بۆ ناوچەکانی جۆراوجۆری کوردستان، وتو و وێژ دەگەڵ پیرپیاوان
١١- وێنەهەڵگران: لوقمان ڕەحیمی، ئەحمەد یاسینی، زوراری ئەحمەدی، سەید تەها حوسێنی، جەماڵی محەممەدزادە- ئەمین گەردیگلانی
١٢- مەقالەی مامۆستا هێمن لە سروەدا ئی بەڕێز کاک مامەند ئەمیری
١٣- دوو ماڵپەڕی:

http://samavar-mandegar.com
http://gashomar.blogfa.com

١۴- ویکی پدیا فارسی، نوروز
١۵- وبلاگ طلای سبز تاریخ نوروز و تحولات کمی و کیفی آن
١۶- انجمن ادبی شفیقی نوروز در تاریخ
١٧- هفتەنامەی نصیر بوشهر، نوروز جلوه‌گاه اسطوره‌ای آفرینش
١٨- آثار الباقیه ابوریحان بیرونی
١٩- مقالات ارسالی به آفتاب